رۆمـان

# بەهەشت بێ تۆ

ئەو دەمەی خەیاڵ و ڕاستی
یەکتری لەئامێز دەگرن


نووسینی: محسین ئەمین






بەهەشت بۆ تۆ

نووسینی: موحسین ئەمین

نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ : زەردەشت کاوانی


کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

بەڕێوبەری گشتی: محمد خضر احمد ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤

بەڕێوبەری هونەری: موستەفا موحەممەد خضر

فەیسبووک: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/m.ktebxana

ئەنیستگرام: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/m.ktebxana

لقی یەکەم: بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوار ڕیانی شێخ محمود - بەرامبەر مزگەوتی محمود علاف

ئەمێل: mdmaktaba@gmail.com






پێوانە: ١٤×٢١

چاپی یەکەم: ٢٠٢٣ز - ١٤٤٤ك

تیراژ: ١٠٠٠

نرخ: ٥٠٠٠

لاپەڕە: ٢٨٦

لەبەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان، ژمارە سپاردنی (٢٤٧) ی ساڵی (٢٠٢٣) ی پێدراوە.

# بەهەشت بێ تۆ

ئەو دەمەی خەیاڵ و ڕاستی یەکتری لەئامێز دەگرن

نووسینی

**موحسین ئەمین**

## ئەم کتێبە پێشکەشە

* بە هەموو ئەو ژنانەی وەکوو دایکمان خاتوو خەدیجە بوونە پاڵپشتی پیاوەکانیان.

* بە هەموو ئەو ژنانەی وەکوو دایکمان خاتوو عائیشە بە غیرەیەکی زۆرەوە هاوسەرەکانیان خۆش دەوێت.

* بە هەموو ئەو کچانەی مریەم ئاسا پاکیزەیی خۆیان پاراستووە.

* بە هەموو ئەو کچانەی وەکوو فاتیمەی زەهرا بوونە گوڵ و گوڵزار بۆ باوکەکانیان.

* بە هەموو ئەو ژنانەی وەکوو ئاسیا خاتوون بێدەنگ نەبوون لە ئاست خراپەی هاوسەرەکانیان.

* بە هەموو ئەو کچانەی وەکوو خوشکەکەی موسا پێغەمبەر بەخەمن بۆ براکانیان.

* بە هەموو ئەو پیاوانەی خۆیان بە شوێنکەوتەی پێغەمبەر محمد (ﷺ) دەزانن و وەکوو چۆن ئەو مامەڵەی کردووە لەگەڵ ژنان، ئەوانیش چاو لەو دەکەن و مامەڵەیەکی باش دەکەن لەگەڵیان.

* بە سێ لە باشترین کچی ئەو دونیایە، خوشکەکانم (زەیتوون و گەردوون و سوسن).

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾

الروم (٢١)

واتا: یەکێك لە نیشانە و بەڵگەکانی تری ئەوەیە کە هەر لە خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لەلایدا و لەنێوانتاندا خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانیی فەراهەم هێناوە، بەڕاستی ئا لەو دیاردانەدا نیشانە و بەڵگە هەیە بۆ کەسانێك کە بیر دەکەنەوە و تێدەفکرن.

Scanned with AnyScanner









بەهار بوو، نیشتمان بۆنی گوڵەنێرگزی گرتبوو، شنەی شەماڵ گژوگیای قەدپاڵەکانی هێنابوویە سەماکردن، بەفر هەر وەکوو ئەوەی زۆر بیری چیاکانی کردبێت توندتوند چیاکانی لەئامێز گرتبوو، چریکەی مەلان و قاسپەقاسپی کەو جوانترین ئاوازێك بوو کە مرۆڤی ئاوێتەی ئەو سروشتە جوانە دەکرد. ئاوێتەی ئەو تابلۆیە جوانە بووبووم کە پەروەردگار بە گەورەیی خۆی کێشابووی، لەنەکاو زەنگی مۆبایلەکەم لێیدا، کاتێك سەیرم کرد وا دکتۆر ئارامە، کاتێك مۆبایلەکەم هەڵگرت بۆ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، من هێشتا هیچم نەگوتبوو کە دکتۆر ئارام گوتی: ئەری کاکە، ئەوە تۆ لەکوێیت؟

منیش گوتم: سەرەتا سەلام، پاشان کەلام. بە دەنگیدا دیار بوو پێدەکەنی، پاشان گوتی: السلام علیکم، باشیت ئەندازیار گیان، ئەگەر ئەرك نەبێت پێمان بڵێیت ئێستا بەڕێزتان لە چ شوێنێکن؟

منیش وەڵامم دایەوە: وعلیکم السلام، ئافەرین ڕۆڵە ئاوا، برا گیان ئەوە خەریکم دەگەمە چۆمان، بە هاوڕێیان بڵێ، یان سەیر بکە بزانە لە هیچمان کەم نییە لەگەڵ خۆم بیهێنم؟ گوێم لێ بوو لە دوورەوە کەسێك هاواری دەکرد لیمۆمان کەم هێناوە، کیلۆیەك یان دوو کیلۆ لیمۆ بێنە.

وتم: ئەوە کێیە؟

دکتۆر ئارام: مایکرۆفۆنەکەم کردووەتەوە، هەمووان گوێیان لێتە، ئەوەش هۆشەنگ بوو.



- باشە بەسەر چاو، هیچی ترمان ناوێت؟

- با.

- چ ماوە، بیڵێن تا دەرنەچووم.

- تۆ بەسەلامەتی بگەیتە لای ئێمە.

ئەوەی بەوپەڕی گرنگیپێدانەوە پێ وتم، منیش وتم: پشتیوان بە خوا سەلامەتی دەبێت و نیوسەعاتی تر نابات من لای ئێوەم، ئەوەم گوت و خوا حافیزیم لێ کردن.

لەگەڵ هاوڕێیانم کاتێک خوێندنی زانکۆمان تەواو کرد، بڕیارمان دا کە نابێت لە یەکتری دابڕێین و گەر نەتوانین هەفتانەش کۆ ببینەوە، لانی کەم مانگی جارێک یەکتری ببینین و گەشتێک بکەین. ڕاست بوو کە بەشەکانمان جیاواز بوو و تەنانەت کۆلێژەکانیشمان، بەڵام دڵمان یەک بوو، ئەو چەند ساڵە بە جۆرێک ئاوێتەی یەکتری بووبووین، گەر کەسێک ئێمەی نەناسیبایە، دەیگوت ئەوە کوڕی یەک کۆڵان بوون و پێکەوە گەورە بوون. هاوڕێکانم لە ئێوارەی ڕۆژی سێشەممەوە چووبوون بۆ گۆمی (فێڵاو)، بەڵام من بەهۆی کاری زۆری ئەو کۆمپانیایەی کە لێی ئەندازیار بووم نەمتوانی ئەو کات لەگەڵیان بچم، بۆیە لە ڕۆژی پێنجشەممەوە پاشنیوەڕۆکەی ڕۆیشتم بۆ لایان، پاش ئەوەی لە دوکانێکی سەر جادەکە لام دا هەندێک میوە و دوو کیلۆ لیمۆم کڕی و بەرەو گۆمی فێڵاو ملی ڕێگاکەم گرتە بەر. کاتێک گەیشتم چاوێکم گێڕا، بڕی

بوو لە خێمەی خەڵکی کە هاتبوون بۆ گەشتکردن و پیادەڕەوی، لەبەرامبەر کانییەکە لەسەر گردەکەوە ئەو شوێنەی ئێستا ئالآی جوانی نیشتمانیان لێ هەڵکردووە هاوڕێکانم خێمەیان هەڵدابوو. کاتێك گەیشتمە لایان، پاش چاکی و چۆنی و یەکترلەباوەشکردن، مەحوی وتی: تووخوا دەرەجە یەك شوێنم نەگرتووە. وەڵامم دایەوە.

- ئافەرین، بەڕاستی جوانترین و خۆشترین و ئارامترین جێگات گرتووە. هەم گۆمەکە بەتەواوەتی لێمان دیارە و کانی و دارەکانیش بەرامبەرمانن و خەڵکیش زۆر لێمان نزیك نیی!

- ئەی چۆن، باوەڕ کە بەتەمای ئەو دەست و پێ سپییانە بای، ئێستا شوێن نەبوو لێی دانیشین.

هەموومان دامانە قاقای پێکەنین.

بەڵێن، کە مامۆستای فیزیا بوو، لەولاوە بە تیلەچاوێك وتی: بەڵێ بەڵێ، گەر ئێستا تۆ نەبایت، دەبوو لەسەر بۆنیتی سەیارەی خێمەمان هەڵدابایە.

دووبارە هەموومان دامانەوە لە قاقای پێکەنین.

خۆر ڕێگاکەی شۆڕ کردبوویەوە بەرەو ئاوابوون و دووکەڵی ئەو ئاگرانەی کە خەڵکی بۆ ئامادەکردنی خوانی ئێوارە هەڵیان کردبوو پەڵەهەورێکی دەستکردی لەسەر سەرمان دروست کردبوو. بۆنی گۆشتی برژاو تەواوی ناوچەکەی پڕ کردبوو، هەستم دەکرد





زۆرم برسییە، ئاخر لەبەر ئێرە نیوەڕۆش لە کۆمپانیا شتێکی وام نەخوارد.

پێم وتن: کوڕینە، زۆرم برسییە!

هۆشەنگ: خارە ئەمن گەلەك لە تووە برسیترم، خۆم کوشت هێندی لە کاتی زەڵاتەکردنێدا خەیار و تەماتەی بخۆم.

مەحوی: دکتۆر ئارام ئەو چیلکەدارانە ورد بکە بۆ ئاگرەکەی، ئەوە ئەمنیش گۆشتەکەم ورد کردووە بۆ بەرسێلی، دەبێت شتێکمان بدەمێ دەست و پێی خۆتانی لەگەڵ بخۆن.

بەڵێن: کاکە ئەمن هیچ ناخۆم.

هەموومان سەیرێکمان کرد، گوتمان: بۆچی؟

بەڵێن: کاکە بە ساغ و سەلامەتی هاتووم بۆ ئێرەکانە، ئێستا نامەوێت بە هۆی شیوێکی بەرێزیان خۆم بێ دەست و قاچ بکەم.

کە ئەوەی ئەگوت، مەحوی دارێکی بە دەستەوە گرت و بەدوای بەڵێن کەوت و ئێمەش توندتوند سکی خۆمان گرتبوو لەبەر پێکەنینی زۆر.

ماوەیەك بوو بەبێدەنگی ڕووەو خۆرئاوا دانیشتبووین، هیچمان هیچی نەدەوت، بەڵام چێژمان وەردەگرت لەو دیمەنە. کاتێك سەیری چیاکانت دەکرد، هەستت دەکرد ئەوان کۆتا شتێکن بۆ ئەو








ڕۆژە ماڵئاواییی لە ئاوابوونی خۆر دەکەن و پاش ماوەیەك مەحوی ئەو بێدەنگییەی شکاند و گوتی:

- خواردن زۆری نەماوە، با بڕۆین بۆ سەر کانییەکە و دەستنوێژ بگرین و بەکۆمەڵ نوێژەکانمان بکەین، پاشانیش دوو دەبە ئاو لەگەڵ خۆمان بهێنینەوە بۆ شەو.

هەموومان لەگەڵ ئەو قسەیەی ئەو هاوڕا بووین، بۆیە ڕێگای کانیمان گرتە بەر و دەستمان کرد بە دەستنوێژشۆردن، پاش ئەوەی تەواو بووین لە دەستنوێژشۆردن و زانیمان کاتی بانگە، بە بەڵێنم گوت:

- بەڵێن گیان، بانگ بدە.

ئەویش بەو دەنگە خۆشەی بانگێکی بۆ داین کە ئاوپڕژێنی دڵەکانمانی کرد، الحمدالله ئەوانەی لە دەوروبەرمان بوون کاتێك زانییان وا خەریکە نوێژی بەکۆمەڵ دەکەین، خێرا دەستنوێژیان شۆرد و هاتن بۆ لای ئێمە و تەنانەت ئەوانەی نوێژیشیان نەدەکرد و دەنگی گۆرانییەکانیان بەرز بوو، خێرا گۆرانییەکانیان کوژاندەوە، یان دەنگیان کەمتر کرد، پاشان خۆم پێشنوێژیم بۆ کردن، کاتێك لە کردنی هەردوو نوێژ، واتا نوێژی شێوان و خەوتنان بوومەوە، کاتێك بۆ لای ڕاست و چەپی خۆم سەلامم داوە، چ دیمەنێکم بینی، وا نوێژخوێنان دوو ڕیزیان لە پشتەوە تەواو کردووە. خەڵکی وردەوردە دەگەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان و هەندێکیشیان دەستخۆشییان





لێ دەکردین و پاشان دەڕۆیشتن، لە ڕێگەی گەڕانەوەمان بۆ لای قۆناغەکەمان بە هاوڕێیانم گوت: براکانم، لە هەرشوێنێك بوون یان چوون بۆ هەرشوێنێك، هەوڵ بدەن ببنە مایەی خێر بۆ ئەو شوێنە، ئێمە ڕەنگە ڕۆشنایی مۆمێك بە کەم سەیر بکەین، بەڵام کاتێك لە ژوورێکی تاریك دای دەگیرسێنین، دەبینین تەواوی ژوورەکە ڕووناك دەکاتەوە، ئێمەش زۆرجار کارەکانمان بەبچووکی دەبینین، بەڵام نازانین کەچ کاریگەرییەکی گەورە لەسەر دڵی دەوروبەرمان دروست دەکات.

کاتێك گەیشتینەوە جێگای خۆمان، خواردنەکەش ئامادە بووبوو، هەریەکێکمان کارێکی دەکرد، بەڵێن و هۆشەنگ سفرەکەیان ڕادەخست، مەحوی خواردنەکەی تێدەکرد، ئەمن قاپ و کەوچکم لەناو زەرفەکە دەردەهێنان و دکتۆر ئارامیش خەریك بوو کتری و قۆرییەکەی ئامادە دەکرد بۆ چالێنان. لەسەر سفرە کاتێکی زۆر خۆشمان بەڕێ کرد، مەحوی و بەڵێن ئەو ئێوارەیە بەقەد ساڵێك ئێمەیان خستە پێکەنین.

دواتر بەدەم چاخواردنەوە و چەرەزاتخواردن دەستمان کرد بە گفتوگۆکردن لەسەر یەکێك لە گرنگترین شتەکان بۆ ژیانی مرۆڤ، ئەویش ژیانی خێزانداری و پێکهێنانی ژیانی هاوبەش بوو.

هۆشەنگ ڕووی کردە من و گوتی:

- ئێ خارە وەختە؟









- بۆچی؟

- خۆت ڕزگار بکەیت لەو بێژنییەی و کچێك بدۆزیتەوە و بیکەیتە هاوبەشی ژیانت؟

دکتۆر ئارام نەیهێشت من وەڵام بدەمەوە و گوتی:

- دە کاکە لێی گەڕێ، وا بۆخۆی ژیانێکی ئارام و بێسەرئێشە بەڕێ دەکات، چیی داوە لەوەی کچی عالەمێ بەختیو بکات.

بەڵێن: یەعنی ئێستا تۆ کچی عالەمێ بەختیو دەکەیت؟ وەڵاهی ژن خێر و بەرەکەتە و ئارامکەرەوەی ڕوح و دڵە و پەرژینێکیشە بۆ گەڕانەوەت لە گوناهـ و تاوان و نیوەی ئیمانە. بەڵام ئێمە قەدری ئەو شتانە نازانین کە هەمانە. مرۆڤ بوونەوەرێکی سەیرە، کاتێك شتێکی نییە هەموو هەوڵێك دەدات تاوەکوو ئەو شتە بەدەست دەهێنێت، بەڵام هەر ئەوەندەی پێی گەیشت، خێرا فەرامۆشی دەکات، هەر وەکوو ئەوەی بڵێت ئەو کەسە نەبووە کە بەدوای ئەو شتەدا ڕای دەکرد.

دکتۆر ئارام: ئەو فەلسەفانەت هەڵگرە بۆ دوای هاوسەرگیریت، ئەوەی تۆ لە خەیاڵت داتناوە، لەگەڵ ئەوەی تێیدا دەژیت، زۆر لێك دوورن.

ماوەیەك کەس هیچی نەگوت، منیش بە مەحویم وت بۆ ئاوا بێدەنگی، پێمان بڵێ مەحویی شاعیر چی دەڵێت لەو بارەیەوە، ئەها









بیرم چوو مەحوی ناوی ڕاستەقینەی (محمد) بوو، بەڵام چوونکە زۆر شەیدای شێعرەکانی مەحوی بوو، هەر بە مەحوی بانگمان دەکرد. سەیرێکی کردم، بە بزەیەکەوە گوتی:

ـ بەسەرچاو، بەڵام لەجیاتیی ئەوەی شێعری مەحوی بێت، حەز دەکەم شێعرێکی موفتی پێنجوێنیتان بۆ بڵێم کە زۆر بەجوانی هەم باسی ژنی باش و هەم باسی ژنی خراپ دەکات، سەرەتا با لە وەسفی ژنی باشەوە دەست پێ بکەم:

گەر خـــوا بیدا بەچاکی دەوڵەتـی شاهـــانە ژن
نیعمەتێکە وەك بەهەشت و هاودەمی پیاوانە ژن
بۆ دڵێکی بێ خەم و شەخسێکی بێ دەرد و ئەلــەم
گەوهەرێکی شـەوچراغی ژوور و بەرهـــەیوانە ژن
گەر کەموکووڕیت لە ماڵیشـا هەبێ باکت نەبـێ
بۆ کەمـوکووڕی ترازووی کۆمـــەڵی خـێزانە ژن
ژن لای پیـــاوی نەزان و سـەرسـەری نرخی نییە
بۆ ژیانـی کۆمەڵی بـــاشتر لە میر و خـانە ژن
بۆ سوپاسی باسی چاکی چی بەیان بکەم هـەر کەمە
جووت و ئاش و نان و بەرگ و باخچە و بێستانە ژن
باعیسی ئارامیی قەلب و مەرهەمی دەرد و بـــرین
بۆ هەموو دەردێ دەوابەخشێکە، وەك لوقمانە ژن
دوڵەتێکی پڕ لە شـــەوق و زەوقە دایم بۆ بەشەر
نیعمەتێکی خۆشەویستی و بێ سەر و ســـامانە ژن







کەی گوڵ و گوڵزاری باخاتی ئێرەم وەکوو ئەو ئەبێ
باخی ســـاحێب زینەت و پڕ لوئلوئی مەرجانـــە ژن
بۆ کەسێك نووری سولەیمانـــی لە قەلبا بێ یەقـــین
پایە مەحکەم کردنی هەم دین و هـــەم ئیمانـــە ژن
زۆر تری عەیشـــی بەهەشتی حوری العـــینن کچـن
لەززەت و خۆشـــی بەیاناتـــی لەنـــاو قورئـــانە ژن
بێت و گەر موڵکی کەماڵ و گەنجی حوسنی یەك کەوێ
گەر دوو سەد گەنجی لەســـەر دانێی ئەڵێم هەرزانە ژن

**پاشان بەردەوام بوو و دەستی کرد بە بەشی دووەم لە شێعرەکە، کە وەسفی ژنی خراپ دەکات:**

گەر خوا نەیدا بە چاکـــی دوژمنی ئینســـانە ژن
مار و دووپشك و پڵنگی شـــاخی هـــەورامانە ژن
گەر گلۆپی دووسەدیش هەڵکەی لە ماڵ و مەتبەقا
دووکەڵی حەوش و حەسار و ژوور و بەر هەیوانە ژن
هەر خەریکی قاوچ و قووچ بردن و تـــــاڵانە ژن
گەر نەخۆشینت نەبێ سیلداری و دڵ پڕ لە خـــەم
چۆتە ناو جەرگت بەدایم ئێش و دەرد و ژانـــە ژن
گەر لەگەڵ ئەودا بەهەشتت پێ بدەن لێی ڕائەکەی
تاوەکوو مردن عـــەزیزم دەردی بێ دەرمـــانە ژن
گەرچی شێوەی شۆخوشەنگ و دووکوژو پڕ عیشوەبێ
تۆ لەبەر چاو و دڵت شێوەی وەکوو شـــەیتانە ژن
بۆ خراپیی ئەو قەڵەم ئەشـــکێ و زمانیش کۆڵ ئەبێ

ته‌نـــیاحـــاجی

**Tanya Haji | ته‌نیاحاجی**

public channel



Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چه‌ناڵێک تایبه‌ت به کتێب و بابه‌تی جیاواز🤍

**ئه‌م کتێبه له‌لایه‌ن ئازیزێکی چه‌ناڵ کراوه به دیاری بۆ خوێنه‌ران**

چه‌ناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ کتێب مه‌ینێره↓
@tanyahaji22

ئه‌کاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7

Invite Link





قابیزیش ڕازی نەبێ هەر تێشی گیانکێشانە ژن
هەر بژی موفتی کە وا دایم لە ڕێی ڕاستی ئەڕۆی
هەر بڵێ تا مردنت دەرد و بەڵای ئینسانە ژن

هەموومان بە چەپڵەلێدان و ئافەرین دەستخۆشیمان کرد لە مەحوی بۆ ئەو شێعرە جوانە و ئەو خوێندنەوە جوانە. پاشان ڕووم کردە هۆشەنگ و پێم گوت:

- خارە ئەتوو بۆ تا ئێستا سینگڵی؟

- خارە جا کوا کچی ئێستا بەکەڵکی ماڵداری و خێزانداری دێت، لەبەر خۆتیفتیفەدان و خۆجوانکردن و سنات چات و ئینستاگرام کوا دەتوانن ئاگاداری ماڵ و حاڵیان بن.

- بەو شێوەیەش نییە برا گیان، بێگومان کچی باشمان گەلێك زۆرە و کچانێکی زۆرمان هەیە کە ئەسڵەن ئەوەی بەلایانەوە گرنگ نەبێت، ئەو شتانەیە کە باست کرد.

- ئێ ڕاست دەکەیت، ڕەنگە کچ زۆر بێت و باشیش بن و ببنە ژنی باشیش بۆ تۆ، بەڵام ئایە دەتوانن ببنە دایکێکی باشیش بۆ منداڵەکانت؟

- ئەوەش دەگەڕێتەوە سەر خۆت و ئەو هەڵبژاردەیەی کە هەڵی دەبژێریت.








- کاکە ئەسڵەن واز لە من بێنە، باسەکە لەسەر تۆ بوو، لەسەر خۆتی لا مەدە، مادام ئەو قسانە دەزانیت، بۆچی تا ئێستا بۆخۆت هەر سینگڵیت؟

مەحوی و دکتۆر ئارامیش گوتیان:

- هۆشەنگ ڕاست دەکات، ئەتوو بۆ خەمێك لە خۆت ناخۆیت، الحمدالله کوڕێکی قۆزیت، سەیارەت هەیە، ئیش و کارە باشترین ئیشت هەیە، بۆ تا ئێستا خەمێکت لە خۆت نەخواردووە، یان دەڵێیت چی ئێمە خەمێکت لێ بخۆین؟

سەیرێکم کردن و بە بزەیەکەوە گوتم:

- ڕاستی، ئەو قۆناغە بۆ من گرنگترین قۆناغی ژیانە، هەرگیز نەمویستووە بەبێ ئامادەکاری بچمە ناو ئەو قۆناغە. ئەو کاتەی زانکۆم تەواو کرد، ماوەیەکی زۆر لەنێوان دوو ڕێگا دۆش دامابووم کامەیان هەڵببژێرم، داهاتووم بنیات بنێم یان هاوسەرگیری بکەم، ئەوەش لەبەر شتێك بوو ئەو کاتەی خوێندکار بووم، کاتێك لەناو شار بە پاس هاتوچۆم دەکرد، دەزانی چ شتێك زۆر ئازاری دەدام، ئەوەی کە ژن و پیاوێك دەهاتنە ناو پاسەکە و پاسەکە پڕ بووبوو، پیاوەکە چاوی دەگێڕا، ئێ کەسێك، گەنجێك هەڵبستێت جێگایان بکات لە شوێنی ئەو دابنیشن، هەر هیچ نەبێت جێگایەك هەبێت ژنەکەی دابنیشێت و بەپێوە ڕانەوەستێت. یان بەو گەرمایەی هاوین ژنێك لەپشتی پیاوەکەیەوە سواری ماتۆڕێك بوون یان





لەناو سێتەگەرێك دانیشتبێت و بیباتەوە بۆ ماڵی خەزووری بڵێت ناتوانین چیتر پێکەوە بژین لەبەر نەبوونی. هەمیشە حەزم کردووە ئەگەر بەرامبەر هەموو عالەم چاوشۆڕ بم کێشە نییە، بەڵام چاوشۆڕی خەزوورم نەبم، سبەی نەڵێت: کاکە ئەمە کچی خۆمان لێ زیاد نەبوو، گەر دەتزانی ماڵ و حاڵت پێ ڕاناگیرێت، بۆچی کچی منت سەرگەردان دەکرد، ئەو کات من چی وەڵامی باوکی بدەمەوە. بۆیە باوەڕم وا بووە کە یەکێك لە هۆکارە گرنگەکانی سەرکەوتنی ژیانی هاوسەرگیری بریتییە لە جێگیری لە ڕووی ماددیەوە، ڕەنگە هەبوونی پارە بەس نەبێت بۆ هاوسەرگیرییەکی سەرکەوتوو، بەڵام دڵنیام لەوەی یەکێك لە هەرە کێشە گەورە و دیارەکانی نێوان ژن و مێرد و تاڵبوونی ژیانیان و تا گەیشتن بەو ئاستەی بڕیاری لێکجیابوونەوە بدەن، بە هۆی بێپارەیی و جێگیرنەبوونی باری ئابوورییەوە. کاتێکیش گەنج لە ڕووی ئابوورییەوە هەستی بە جۆرێك لە دڵنیایی کرد، ئینجا نۆرەی شتێکی ترە...

بەڵێن قسەکانی پێ بڕیم، گوتی:

- ببورە خارە، نەمهێشت قسەکانت تەواو بکەیت، بەڵام وەکوو ئەوەی تۆ دەڵێیت گەنجی قوڕبەسەر تەمەنی دەگاتە سی ساڵ و هێشتا ئەوەی تۆ باسی دەکەیت پێی نەگەیشتووە. گەنجی زۆرمان هەبووە ڕەنگە پارەیەکی وایان نەبووبێت و هاوسەرگیرییان کردووە و خوا بە گەورەیی خۆی خێری خستۆتە ژیانی هاوسەرگیرییانەوە و دەوڵەمەند بوونەوە و ژیانێکی بەختەوەر ژیاون، ئەی نەتبیستووە









لە مامۆستایانی ئایینی کە هەمیشە ئەوەمان بیر دەهێننەوە کە خوا هەمیشە لە وەحیدا بۆ پێغەمبەرمان هانی خەڵکی داوە بۆ هاوسەرگیری و ئەگەر هەژاریش بن، ئەوا خوای گەورە بە گەورەیی خۆی دەوڵەمەندیان دەکات و خوا یارمەتیدەری ئەو کەسانەیە کە هاوسەرگیری دەکەن.

- بێگومان برا گیان، ئەوەی دەیڵێیت سەد لە سەد تەواوە و خوا یارمەتیدەری هەرکەسێکە کە بیەوێت خێرێك ئەنجام بدات و لە خراپە دوور بکەوێتەوە، بەڵام بێگومان بۆ هەرشتێکیش کۆمەڵێك هۆکار هەنە پێویستە مرۆڤ بیانگرێتە بەر، من ناڵێم دەبێت گەنج خاوەنی سەیارە و ماڵ و پارەی زۆر بێت ئینجا هاوسەرگیری بکات، ئەوە ڕەنگە شتێکی ئەستەم بێت بۆ زۆرێك لە گەنجانی ئەمڕۆ، بەڵام باوەڕی تەواویشم بەوە هەیە دەبێت هەر هیچ نەبێت گەنج خاوەنی ئیشێك، شتێك بێت یان شتێکی کەمی کۆ کردبێتەوە ئینجا بڕیار بدات بۆ هاوسەرگیری، پێغەمبەریش کاتێك باسی هاوسەرگیریی کردووە، کە ئەی کۆمەڵی گەنجان، هاوسەرگیری بکەن ئەگەر تواناتان هەبوو، جا ئەو توانایە لایەنی ماددی دەگرێتەوە، عەقڵ و پێگەیشتوویی هزری گەنج دەگرێتەوە، توانای جەستەیی و جنسیی گەنج دەگرێتەوە، هەر وەکوو دەفەرموێت: ((یا معشر الشباب، من استطاع منکم الباءة فلیتزوج))، لەبەر ئەوەی گرنگە گەنج زەمینەسازی بکات بۆ ئەو قۆناغەی ژیانی. ئینجا خاڵە گرنگەکەی تر کە نەتهێشت تەوای بکەم، بریتییە لەوەی گەنج بگەڕێت بەدوای





گرنگترین
هاوسەرین و هاودەمێکی گونجاو، بە بڕوای من ئەوە هۆشیاری لە خاڵێکە بۆ سەرکەوتنی هەر هاوسەرگیرییەك، ئەویش قسەیەم هەڵبژاردنی کەسی گونجاو، سەیر کەن ئەمن دەمێکە ئەو عاقڵانە کردۆتە یاسای ژیانم، ئەویش ئەوەیە مرۆڤ پێویستە گەمژانە هاوسەرگیری بکات بۆ ئەوەی عاشقانە ژیان بکات، نەك بەهەشت هاوسەرگیری بکات و شێتانە ژیان بکات. بە بڕوای من بەهەشت و دۆزەخی هەریەکێك لە ئێمە لەو دونیایە بریتییە لەو ژنەی کە بڕیار دەدەین بیکەینە هاوسەری خۆمان و دایکی منداڵەکانمان، کاتێك مرۆڤ لەگەڵ ژنێکی ژیر هاوسەگیری دەکات، ئەو ژنە ژیانێکی بەهەشتئاسا دەکاتە دیاری بۆ مێردەکەی و منداڵەکانی، بەڵام ئەگەر لەگەڵ ژنێك کە هیچ دەربارەی ژیان و ئەرکەکانی نەزانێت هاوسەرگیری بکەیت، هەموو ئەوەی بیهێنێتە ناو ژیانت بریتییە لە ژیانێکی پڕ لە دەرد و بەڵا، ئەو کاتیش مرۆڤ وا هەست دەکات ژیانێکی جەهەنەمئاسا دەژیێت.

مەحوی کە خەریك بوو چەرەزاتەکەی دەهێنایە ناوەڕاستی مەجلیسەکە گوتی:

- بێگومان ئەندازیار گیان قسەکانت هەمووی تەواوە، ئێمەش ئومێدەوارین بە زووترین کات ببینین ئەو قسانەت کردبێت بە کردار و کچێکی باش بدۆزیتەوە و بیکەیتە هاوبەشی ژیانت.

هەمووان بزەیەکیان کرد و منیش گوتم:

- زۆر سوپاس برا جوانەکەم، خوا ئاسانی بکات بۆ هەموو کچ و کوڕێك و گشتمان بگەین بە دڵخوازی خۆمان.

قسەکانمان بەردەوام بوون و هەریەکێکمان چێژی وەردەگرت لەو کەشوهەوا ئارام و ساف و ساردە، مانگ لە ئاسمان دیار نەبوو، بەڵام ئاسمان ڕۆشن بوو، ئەستێرەکان و ڕێڕەوی کاکێشان بەتەواوەتی دیار بوون، هۆشەنگ سەرەڕای ئەوەی مامۆستای کیمیا بوو، بەڵام وێنەگرێکی بەتواناش بوو، ئەو هەرگیز کامێراکەی لە خۆی دانەدەبڕی و بۆ گشت شوێنێك هاوڕێی بوو، کامێراکەی دەرهێنا بۆ ئەوەی لەو بەرزاییەوە وێنەی ئەستێرەکانی ئاسمان بگرێت، بەڕاستی لێزان بوو لە وێنەگرتندا، مرۆڤ چێژی وەردەگرت لە تەماشاکردنی ئەو وێنانەی کە گرتبوونی، پێشتریش هەندێك لە وێنەکانی بووبوونە براوەی پێشبڕکێی جیاجیا لە بواری وێنەگریدا.

کاتێك تەماشای کاتژمێرەکەم کرد، بینیم وا خەریکە دەبێتە سەعات یازدە، حەزم نەدەکرد بخەوم و لەو کەشوهەوا خۆشەی لەگەڵ هاوڕێکانم دروستم کردووە داببڕێم، بەڵام پێویست بوو سبەی زوو بڕۆمەوە بۆ ماڵ بۆ لای پوورم، چوونکە تەندروستیی زۆر باش نەبوو، بۆیە بە مەحویم گوت:

- مەحوی گیان، سبەی بۆ نوێژ خەبەرم بکەوە.

- بەسەر چاو، بەس جارێ زووە، تۆزێکی تریش دانیشتبایت.

- تەواو، چیتر توانام نەما. شەوتان شاد.





ڕۆیشتم بەتانی و سەرینەکەم لەناو سەیارەم هێناو و ڕۆیشتمە سەر جێ، لەسەر ڕاست بەرەو ڕووی هاوڕێکانم نوستم، نازانم سەعات چەند بوو، بەڵام کاتێک چاوم کردەوە هاوڕێکانم هێشتا هەر بەخەبەر بوون، بۆیە منیش تەماشایەکی مۆبایلەکەم کرد، نزیکەی سەعاتێکی مابوو بۆ نوێژی بەیانی، بۆیە هەڵستام بۆ ئەوەی شەونوێژ بکەم و بە هاوڕێکانم گوت:

- ئەوە هێشتا ئێوە نەخەوتوون؟

بەڵێن وەڵامی داوە و گوتی:

- تازە مەجلیس گەرم دەبێت.

منیش بزەیەکم بۆ کردن و پێم گوتن:

- شەونوێژتان کردووە؟

دکتۆر ئارام گوتی:

- نە، بەڵام باش بوو لە کاتی خۆیدا هەڵستای، ئێمەش ئێستا هەڵدەستین.

پاش ئەوەی شەونوێژمان تەواو کرد، گشتمان لەدەوری ئاگرەکە کۆبووینەوە، چاوەڕێ بووین تا کاتی بانگی بەیانی دێت. بۆیە ئەو کاتەم بە دەرفەت زانی و ڕووم کردە هاوڕێکانم، پێم گوتن:

- برایان، ئێمە ڕێبوارین، ڕێبواریش زۆر دڵی خۆی بەو جێگایەوە خۆش ناکات کە بۆ ساتێک لای داوە بۆ پشوودان، بەڵکوو هەموو









خەمی ئەو جێگایە و ئەو ئامانجەیە کە لە پێناوی بەرێ کەوتووە و هاتووە، رۆژێك دادێت گەشتەکەمان کۆتایی دێت لەم دونیایە، دەگەڕێینەوە بۆ لای پەروەردگارمان، پەروەردگارمان بۆ ئامانجێك ئێمەی هێناوەتە بوون، ئەویش ئەوەیە ئەو بەتەنها بە خوای حەق بزانین و هەر ئەویش بپەرستین، ترس و ئومێدیشمان هەر بە ئەو بێت، مرۆڤی ژیر هەموو چرکە و ساتێك لەو دونیایە بەکار دەهێنێت بۆ ڕازیکردنی خوای خۆی، سەیر بکەن هەموو دانیشتنی ئەمشەوتان، هەموو ئەو قسانەی ئەمشەو کردتان ناگاتە گەورەیی دڵۆپێك ئاوی ئەو دەستنوێژەی کە لە پێناو خوا کەوتۆتە سەر زەوییەکە، مەگەر زیکرێك یان قسەیەکی خێرتان کردبێت گەورەتر بێت لەوە، باوەڕتان هەبێت هیچ قسەیەك، هیچ دانیشتنێك خۆشتر و جوانتر و پیرۆزتر نییە لەو موناجاتەی کە بەندە لە تاریکیی شەو هەڵدەستێت و دەستنوێژێکی پاك دەگرێت و لەگەڵ خالقی خۆیدا دەدوێت، سەیر کەن (بەزەیی و رەحمەتی خوا) گشت شەوێك لە سێ-یەکی شەوەکەدا دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا و بە گەورەیی و بەخشندەیی خۆی دەڵێت: ﴿هل من سائلٍ فأُعطيَه هل من داعٍ فأستجيبَ له هل من تائبٍ فأتوبَ عليه هل من مستغفرٍ فأغفرَ له﴾. {ئایە کەسێك هەیە داوای شتێك بکات پێی بدەم، ئایە کەسێك هەیە دوعا بکات و منیش وەڵامی بدەمەوە، ئایە کەسێك هەیە گوناهێکی کردبێت و تۆبە بکات و پەیشمان بێت و منیش تۆبەکەی وەربگرم}. سەیر کەن، باوەڕ کە من هەمیشە دەڵێم بەڕاستی ئەو





کەسە زۆر خۆشبەختە شەوان بەشێکی شەوەکەی بۆ خۆی و خوای خۆی داناوە، وەرن هاوڕێیان، با بەڵێن بە خۆمان و خواش بدەین کە لەو کەسانە بین کە شەومان بۆ ڕزایکردنی پەروەردگار بەکار بهێنین، بەداخەوە بۆ کچان و کوڕانی ئەم سەردەمە هەموو شەو خەریکی نامەگۆڕینەوە و دانیشتن و گوێگرتنن لە شتانێك کە خوا حەز ناکات نە ببیسترێن و نە بگوترێن تا کاتی بەرەبەیان، دوای ئەوەش ئەوەندە بێتاقەت و خەواڵوون، نوێژی بەیانییانیشیان پێ ناکرێت، ئەمن دەڵێم با هەریەکێکمان پرسیارێك بکەین لە خۆمان، ئایە لەو شەوە درێژانە، لەو شەوانەی کە دادەنیشین تا بانگی بەیانی و خەریکی شتانێکین کە خوا حەزی لێیان نییە، ئایە ناتوانین کاتژمێرێك یان هیچ نەبێت نیوکاتژمێرێك تەرخان بکەین بۆ خوای گەورە و قورئانەکەی، من ناڵێم دامەنیشن و قسە مەکەن، بەڵام دەڵێم با خواش لەبیر نەکەین، ئاخر ئەو لەبیرمان بکات، ئێمە سەرگەردان دەبین.

سەیرێکی کاتژمێرەکەم کرد، کاتی بانگی بەیانی بوو، لەگەڵ هاوڕێکانم نوێژی بەیانیمان کرد و کاتێك تەواو بووین، ڕووم کردە هاوڕێکانم و پێم گوتن:

- پلانی چیتان هەیە، چی دەکەن ئەمڕۆ؟ ئەمن دەبێت بڕۆمەوە بۆ چۆمان بۆ ماڵێ، سەرێك بدەم لە پوورم بزانم تەندروستیی چۆنە و ئێوارەکەش بگەڕێمەوە هەولێر.

مەحوی وەڵامی دامەوە. گوتی:

- ئێمە نیازمان وایە دوای نوێژی هەینی بڕۆین بۆ شاخەوانی و شەوەکەی بگەڕێینەوە بۆ هەولێر.

- زۆر باشە، بەس ئاگاداری خۆتان بن.

تا سەعات دە لای هاوڕێیانم مامەوە. کاتێك ویستم بڕۆم، بینیم وا سەیارەیەکی مۆدێل بەرز دێت. کاتێك دابەزین، دیار بوو سێ کچ بوون، بە جۆرێك ڕەفتاریان دەکرد و بە جۆرێك هاواریان دەکرد، دەتگوت ئەو دونیایە و ئەو شوێنە کەسی تری لێ نییە جگە لەوان، خەڵکی هەمووی تەماشای ئەوانی دەکرد. بەڵێن گوتی:

- دکتۆر محمد ڕاتب نابلسی جوانی فەرموو کاتێك وتی: جوانترین شتێك لە ئافرەتدا بریتییە لە شەرم و حەیا.

دکتۆر ئارام پاڵی دابوو بە سەیارەکەمەوە، گوتی:

- حەتمەن دەبێت جەمەعاتی مۆدێلەکان بن، سەیر بکەن چ ئوتومبێلێکیان پێیە.

هۆشەنگ کە خەریك بوو شتەکانی منی دەخستە دواوەی سەیارەکەم، گوتی:

- کاکە وازیان لێ بهێنن، باوەڕ بکە باشترین شتێك کە بیکەیت بەرامبەر بە ئەوانە ئەوەیە ئیهمالیان بکەیت.





منیش لەگەڵ قسەکەی هۆشەنگدا بووم، بۆیە گوتم:

- هۆشەنگ ڕاست دەکات، وازیان لێ بهێنن، جەمەعات ئەمن ڕۆیشتم، إن شاء الله لە هەولێر دەتانبینمەوە.

دوای ئەوەی ماڵئاواییم لێ کردن، بەڕێ کەوتم بەرەو ماڵەوە.

هەر وەکوو چۆن هەورێك بەخێرایی دێت و دەڕوات و سێبەری ون دەبێت، منیش ئاوا زوو بێبەش بووم لە سێبەری دایك و باوکم لەسەر سەرم، چوونکە من منداڵێکی بچووك بووم کاتێك دایك و باوکم کۆچیان کرد لەو ژیانە لەبنهاتووە بۆ ژیانی لەبننەهاتوو بارگەیان پێچایەوە. ئێستا لەگەڵ پوورم، واتا خوشکی دایکم و هاوسەرەکەی ژیان دەکەم، ڕاستی ستەمێکی گەورەیە گەر بڵێم ئەوان کەمتەرخەمییان کردووە لە پەروەردەکردن و گەورەکردنی من، بەڵام ها قسەیەك هەیە دەڵێت: خۆشەویستیی دایە و بابە لە لایەك و خۆشەویستیی هەموو عالەم لە لاکەی تر. پوورم هەمیشە هەوڵی دەدا من هەست بە نەبوونی هیچ بۆشاییەك نەکەم و وا هەست نەکەم دایك و باوکی ڕاستەقینەم نەماون، لەوەش زۆر باش سەرکەوتوو بووبوو، دڵنیام بینیوتە و هەستت پێ کردووە ئەو کاتەی باران دەبارێت خاك و خۆڵ چ بۆنێکی هەیە، پووریش ئاوایە، بۆنی دایك دەدات، بۆیە پێغەمبەر گیان (دروودی خوای لەسەر بێت) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموویت: (پوور لە جێگای دایکە).

پوورم هەرچەندە بە نۆ ساڵ لە دایکم گەورەتر بوو و زووتریش

هاوسەرگیریی کردبوو، بەڵام خوا هیچ منداڵێکی پێ نەبەخشیبوون، هەر بۆیە من بە هۆی ئەوانەوە ئازاری نەبوونی دایك و باوکم لەبیر چووبوویەوە و ئەوانیش بە هۆی منەوە ئازاری نەبوونی منداڵیان لەبیر خۆیان بردبوویەوە، ڕاستی کاتێك لەگەڵ خزمانی مێردی پوورم دادەنیشتم، ئەوان بەناڕاستەخۆی باسی ئەوەیان دەکرد کە هۆکاری ئەوەی پوورم و مێردی پوورم منداڵیان نەبووە هۆکارەکەی مێردی پوورمە و پێم وا بێت هەر ئەوەش هۆکار بوو بۆ ئەوەی مێردی پوورم ژنی دووەم نەهێنێ و بێدەنگ لێی دابنیشتێت، نازانم، سەیرە کاتێك پیاوێك هۆکاری ئەوەیە منداڵیان نەبێت، دەبێت ژنەکە بێدەنگ دابنیشێت و بەو ژیانی بێمنداڵییە ڕازی بێت و قسە نەکات و گەر قسە بکات و داوای حەقی خۆی بکات، ئەوا خەڵکی بە بێشەرم و هەزار شتی تر ناوی دەبەن، بەڵام گەر کێشەکە ژن بێت، ئەوا پیاو مافی خۆیەتی و شەرع ڕێگەی داوە نەك ژنی دووەم، بگرە سێیەم و چوارەمیش بهێنێت، بەڵێ، منیش دەڵێم خوای گەورە بە دانایی و زانایی خۆی ڕێگەی داوە پیاو گەر توانای هەبوو و توانی لەنێوان ژنەکانی مەرجی دادپەروەری و یەکسانی پەیڕەو بکات، ئەوە بۆی هەیە ژنی دووەم و سێیەم و چوارەم بهێنێت، بەڵام ئایە دەکرێت خوایەك بەو گەورەییە و بەو میهرەبانی و زانایی و داناییەی ڕێگریی کردبێت لە ژن کاتێك دەبینێت پیاوەکەی ناتوانێت و هۆکارێکە بۆ ئەوەی منداڵیان نەبێت داوای ماف و حەقی خۆی بکات کە ئەویش جیابوونەوەیە؟!

ڕاستی هەموو ئەوەی من دەمەوێت بیڵێم ئەوەیە ژنەکانیش مافی خۆیانە، هەر وەکوو چۆن پیاوان حەز دەکەن منداڵەکانیان لەباوەش بگرن و لەنێو خەڵك شانازییان پێوە بکەن و لە پیریدا ببنە گۆچانی دەستیان، ئاوها ژنەکانیش حەز دەکەن منداڵیان هەبێت و بە دایە بانگیان بکەن و لە ئامێزی خۆیان بە لایلایە بیانخەوێنن و کچیان هەبێت قژەکانیان بۆ بکەن بە کەزیی درێژ و کوڕیان هەبێت بۆ ئەوەی ژووره نارێك و شتە پەرتەوازەکانیان بۆ کۆ بکەنەوە.

لەو بیرکردنەوەنەدا بووم بەدەم ڕێگاوە تاوەکوو گەیشتمەوە ماڵەوە، لە بەردەم دەرگا وەستاوم، زەنگەکە لێدەدەم، بەو هیوایەم بەڵکوو پوورم یان مێردی پوورم بێت و دەرگاکە بکاتەوە، خەریکە دەنگی خشەخشی پێڵاوەکان دێت و کەسێك بەرەو دەرگاکە دێت، دەرگاکە دەکاتەوە، کاتێك تەماشا دەکەم دەبینم پوورێیە. بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە خێرا بەرەو ڕووی یەکتری دەڕۆین و توند یەکتری لەباوەش دەگرین، پوورم ماچبارانم دەکات، ئەوە ئیشی هەموو جارێکیەتی، دەستم توند دەگرێت و ڕام دەکێشێت بەرەو ژوورەوە و پێم دەڵێت:

- وەرە ژوورەوە ڕۆڵەی شیرینی پوورێ، هەموو کەسوکاری پوورێ.

- پوورێ ئەی کوا حاجی؟

لەو کاتەوەی پوورم و مێردی پوورم لە حەج گەڕاونەوەتەوە، من هەر بە حاجی بانگی مێردی پوورم دەکرد.






پوورم وەڵام دەداتەوە، دەڵێت:

- مەگەر نایناسیت، ئەو هەمیشە ڕۆژانی هەینی زوو دەچێت بۆ مزگەوت.

لە هۆڵەکە دادەنیشم، پوورم خێرا چای دێنێت، دواتر دەڕوات کێکی بەخورما دێنێت، دەزانێت چەندە حەزم لێیەتی، بە دەنگێکی تۆزێك بەرز بانگی دەکەم و دەڵێم:

- پووریّ، قوربانت بم وەرە دانیشە، ئەوەندە خۆت ماندوو مەکە؟

پوورم قاپێکی پڕ لە کێکی بەخورمای گرتووە بە دەستەوە و بەرەو لای من دێت و بەزەردەخەنە پێم دەڵێت:

- تۆ ئەوەندە گەر خەمی پوورت بایە، ئێستا بووکێکت بۆ دەدۆزییەوە. کوڕی خۆم، سەیر کە پێشینان جوانیان فەرمووە: {ماڵ تا زووتر بگاتە واری باشترە}. ئەو دراوسێیانەمان زۆربەیان کچی باش و جوانیان هەیە، هەرچیی تۆ دەستی لەسەر دانێیت، ناڵێت نا.

دەستم برد بۆ کێکەکان و دانەیەکم خوارد، پێم گوت:

- کێکەکانی ئەوجارە لە هیی گشت جارەکانی تر خۆشترە.

تەماشایەکی کردم، بەتووڕەییەوە گوتی:

- دە وەرە دەی، ئەمن باسی چیی بۆ دەکەم و ئەویش باسی چیم بۆ دەکات.

سەیرێکی یەکتریان کرد و پێکەوە دامانە قاقای پێکەنین، پێم گوت:

- دوعای خێرم بۆ بکە، خوا بۆمی ئاسان بکات.

سەیرێکی کردم و بەخەمبارییەوە گوتی:

- مەگەر ئەمن لەو دوو دوعایە زیاترم ماوە بیکەم لەو ژیانە، ئەوەیش ئەوانەن کە کاتێک دەمرین خوا لێمان ڕازی بێت و تۆش ببینم بەختەوەر و ئاسوودە بیت و بگەیت بە دڵخوازی خۆت.

سەیرێکی یەکتریان کرد و هیچمان نەوت، کاتێک سەیری ئەو ڕوخسارە پڕ لە چرچ و لۆچییەی پوورم دەکرد، بەزەییم پێدا دەهاتەوە، ئاخر هەر چاڵێکی ڕوخساری دەتگوت دۆڵێکە و پڕیەتی لە خەم و خەفەت. پاشانیش پوورم تەماشایەکی سەعاتەکەی کرد و گوتی:

- ڕۆڵە تۆ بەنیاز نیت بیچت بۆ مزگەوت؟ هەڵسە ئاوێک بکە بە خۆتدا و بڕۆ بۆ مزگەوت، با منیش بڕۆم بەلای خواردنەکەمەوە بۆ ئەوەی دواتر نەڵێیت ئەو پیرەژنە هەر خواردنی سووتاو دەرخواردی من دەدات.

بزیەکم بۆ کرد و ڕۆیشتم ئاوێکم کرد بە خۆمدا و دەستنوێژم شۆرد و بەڕێ کەوتم بەرەو ئەو مزگەوتە بچووکەی سەری کۆڵانەکەمان. ڕاست بوو مزگەوتەکەمان بچووک بوو، بەڵام مزگەوتێک بوو دڵی

مرۆڤی ئاسوودە دەکرد و مامۆستایەکی باشمان هەبوو کە گشت هەینییەك وەکوو چۆن باخەوانێك باخە تینووەکەی ئاو دەدات، ئەویش ئاوها ئاوپرژێنی دڵەکانمانی دەکرد. هێشتا مامۆستا دەستی نەکردبوو بە وتارەکەی، منیش ڕۆیشتم بۆ لای ڕاستی مزگەوتەکە دابنیشم، بینیم وا مێردی پوورم لە نزیك مامۆستاوە دانیشتووە، کاتێك منی بینی، زەردەخەنەیەکی کرد و دەستی بەرز کردەوە بە شێوەی سڵاوکردن، منیش دەستم بۆی بەرز کردەوە، مامۆستا دەستی کرد بە خوێندنەوەی وتارەکەی، پاش ئەوەی سوپاس و ستاییشی خوای کرد گوتی:

- موسڵمانانی ئازیز، سڵاوی خواتان لێ بێت، لە وتاری ئەمڕۆماندا باسی چیرۆکی دوو مرۆڤی پیرۆز دەکەین، ئەویش باوەگەورە و دایەگەورەی هەموومان ئادەم و حەوا، لای هەموومان ڕوون و ئاشکرایە کە یەکەمین مرۆڤ کە خوا دروستی کرد پێغەمبەر ئادەم بوو، لە بەهەشتیش، بەهەشتێك کە زوبان ناتوانێت دەربارەی بدوێت و وەسفی بکات و نە چاوێکیش تا ئێستا دیمەنێکی ئاوها جوانی بینیوە، نە بە خەیاڵ و ئەندێشەی هیچ مرۆڤێکدا هاتووە، بەڵێ برایان و خوشکان، لەو شوێنە پیرۆزە و لەو شوێنەی کە إن شاء الله گشتمان بەسەربەرزی بۆی دەگەڕێینەوە، حەزرەتی ئادەم کە لەنێو گشت ئەو نازونیعمەتانەی کە ئاواتی گشت مرۆڤێکە هەیبن هەیبوو، چیی حەز لێ بایە لە بەردەستی ئامادە بوو و هاوڕێکانی باشترین فریشتەکانی خوا بوون، بەڵام لە دڵیدا هەستی بە شتێك





دەکرد کە نییە، شتێك کە هەستی ئارامیی زیاتری پێ بدات، تا ئەوە بوو ڕۆژێکیان ئادەم خەو دەیباتەوە و لە خەو ڕادەبێت، دەبینێت وا کەسێك لەبەرامبەری وەستاوە، ئەویش دەپرسێت تۆ کێیت؟ ئەوەیش دەڵێت: من حەوام. ئادەم و حەوا دەبن بە هاوەڵ و هاودەمی یەکتری و خۆشەویستی یەکتری، خواش پێیان دەفەرمووێت ئەو بەهەشتە بۆ ئێوەیە، حەزتان لە چییە بیخۆن حەزتان لە چییە بیکەن، بەس دارێك هەیە نزیکی نەکەون، شەیتان کە ئامادە نەبوو سوجدەی ڕێز ببات بۆ ئادەم، کەوتە پلانگێڕان بۆ ئەو دوو خۆشەویستە تازە بەیەکگەیشتووە، بە جۆرێك خۆی لێ نزیك خستنەوە و وای خۆ نیشان دەدا کە ئەو باشترین و دڵسۆزترین هاوڕێیە بۆیان، بۆیە پێی گوتن گەر دەتانەوێت بۆ هەمیشە بمێنن و لەو بەهەشتە ژیان بکەن ئا لەو دارە بخۆن، ئەوانیش کە تازە پێك گەیشتبوون و بووبوون بە خۆشەویستی یەکتری و هەوێنی ئارامی بۆ یەکتری، لەو دارەیان خوارد و دواتر بۆیان دەرکەوت کە سەرپێچیی فەرمانی خوایان کردووە و پاشان داوای لێخۆشبوونیان کرد و خوا لێیان خۆش بوو و ناردنی بۆ سەر زەوی. بەڵێ برایان و خوشکان، ئەم قسانەم بەتایبەتی ڕووی لە تازە پێگەیشتوو و تێگەیشتووەکانە، خوا هەر خۆی تاك و تەنهایە، حەزیش دەکات هەر ئەو بە تاك و تەنهایی بمێنێت و بپەرسترێت، تەنهایی هەر بۆ خوا باشە، باوەڕیشتان هەبێت لەو دونیایە عەزابێك گەورەتر نییە لە تەنهایی بۆ مرۆڤ، گەر تەنهایی سەخت نەبایە، گەر ناڕەحەتکەر و بێزارکەر نەبایە، سزای زیندانیی

تاکەکەسی خۆرسکترین سزا نەدەبوو، مادام ڕێگەیەکیش هەیە بۆ دەربازبوون و هاتنەدەر لەو زیندانە تاریك و تەنگ و ناخۆشە، ئایە ستەم ناکەین لە خۆمان بەوەی خۆمان لەو زیندانەدا زیندانی بکەین.

دوای ئەوەی مامۆستا لە وتارەکەی تەواو بوو، لە حەوشی مزگەوت لەگەڵ مێردی پوورم یەکتریمان بینی، دوای ئەوەی سڵاومان لە یەکتری کرد، پێی گوتم کە دەڕوات بۆ بەشداریکردن لە ژنمارەکردنی کوڕی یەکێك لە دۆستەکانی لە گوند، بۆیە منیش بەتەنها بەرەو ماڵ گەڕامەوە، لە ڕێگا بیرم لە قسەکانی مامۆستا دەکردەوە، کاتێك گەیشتمەوە ماڵ، پوورم سفرەکەی ڕاخستبوو و ئەو خواردنەی لێنابوو کە من زۆرم حەز لێیە، ئەویش کفتە بوو، پوورم گوێبیستی وتارەکەی مامۆستا بووبوو، چوونکە ماڵی ئێمە لە مزگەوت نزیکترینە، بۆیە پوورم گوتی:

- ئاگات لێ بوو کوڕم مامۆستاش باسی بێژنیی تۆی دەکرد.

- پووری، خۆ تۆ پێت نەگوتبوو ئەو وتارە بدات؟

هەر دووکمان پێکەوە دامانە قاقای پێکەنین، دوای ئەوەی نانەکەمان خوارد، نازانم چۆن بوو، بەڵام دڵم حەزی دەکرد ئەو شتە بزانێت کە تائێستا نایزانێت و لێی بێخەبەرە، ئەوەیش دایك و باوکم بوو، دەمویست بزانم چ جۆرە کەسێك بوون، چۆن چۆنی هاوسەرگیرییان کردووە و چۆن چۆنی مردوون. بۆیە پرسیارم لە پوورم کرد و گوتم:





- پووریٚ گیان، دەتوانی باسێکی دایك و باوکم بۆ بکەیت؟

- باسی چیت بۆ بکەم؟

- نازانم، هەرشتێك دەربارەی ئەوان دەیزانیت.

پورم پاڵی دا بە دیوارەکەوە قاچەکانی ڕاکێشا و تەسبیحەکەی گرت بە دەستەوە و بە هەڵکێشانی ئاهێکی قووڵ دەستی کرد بە قسەکردن و گوتی:

- سێ ساڵ بوو من هاوسەرگیریم کردبوو لەگەڵ کوڕی یەکێك لە دۆستەکانی باوکم و بە نۆ ساڵ لە بنەوشی دایکت گەورەتر بووم، ساڵ و نیوێك دوای هاوسەرگیریی من، باوکم بە جەڵتەی مێشك کۆچی دوایی کرد، ئیتر بنەوشی خوشکم و دایکم بەتەنها مانەوە، بنەوشی خوشکم هەم دەبوو ئاگای لە دایکم بێت، هەمیش ئاگاداری ئەو مەڕانە بێت کە دوای مردنی باوکی ڕەحمەتیم کە بۆ بژێویی ژیان بەخێوی دەکردن وەکوو هەر ماڵێکی تری گوند، بنەوشی خوشکم کچێکی جوان و باڵابەرزی قژڕەشی ڕوخسارسپیی تەمەن شازدە ساڵان بوو، کیژێکی ئازا و توندوتۆڵ بوو، ئێواران پاش ئەوەی کوڕە مامەکانم مەڕەکانیان دەهێنانەوە، بۆخۆی خەریکیان دەبوو و دەیدۆشین و ئاگای لێ دەبوون، لەگەڵ ئەوەی کچ بوو، بەڵام پیاوانە ڕەفتاری دەکرد و هەر وەکوو پیاوان شەرواڵی هەڵدەکێشا و دەڕۆیشت بۆ ناو مەڕەکان. بە جۆرێك لە جۆرەکان بەو ژیانە سەختە ڕاهاتبوو، ماندوو دەبوو، بەڵام دڵخۆش بوو کە هەستی

دەکرد هەم دەتوانێت ئاگاداری دایکمان بێت و هەمیش مەڕەکان بەخێو بکات، تا ئەوەی ڕۆژێکیان یەکێک لە کوڕە مامەکانمان لەگەڵ خەڵکی گوندەکەی خوار خۆمان لەسەر پاوانێکی پووش دەکەن بە شەڕە قسە و دواتریش شەڕە تفەنگ، کوڕە مامەکەمان تفەنگێک دەتەقێنێت و بەر شانی پیاوێکی ئەو گوندە دەکەوێت، دواتر کوڕە مامەکەمان دەترسێت و بەڕاکردن بەرەو ماڵێ دێتەوە و ڕووداوەکە بۆ مامم و براکانی باس دەکات، ئەوانیش خێرا تفەنگ هەڵدەگرن و دەڕۆن لەنێو یەکێک لە شاخەکانی خوار گوند خۆیان حەشار دەدەن و کەمین دادەنێن، دواتر دەبێتە شەڕ لەگەڵ خەڵکی گوندی خوار خۆمان، ئەو پیاوەی گوللەکەشی بەر شان کەوتبوو، خێرا بردبوویان بۆ شار بۆ نەخۆشخانە، بەڵام چوونکە خوێنی زۆری لەبەر ڕۆیشتبوو، لە نیوەی ڕێگا گیانی لەداست دابوو، بۆیە ئەوانیش تەرمەکەی دەگەڕێننەوە بۆ گوند و دەڵێن تاوەکوو تۆڵەی خوێنی ئەو نەکەینەوە، نایشارینەوە و نایخەینە ناو گۆڕەوە، شەڕە تفەنگ هەر بەردەوام بوو، بەڵام خۆشبەختانە کە کۆمەڵێک مامۆستای ئایینی و پیاوچاک هاتنە نێوەندگیرییەکە و تۆزێک بارودۆخەکە ئارام بوویەوە و شەڕە تفەنگەکە کۆتایی پێ هات و مامۆستایانی ئایینی، کە هەمیشە مایەی خێر بوون بۆ ئەو کۆمەڵگایە و خەڵکەکەی، دانیشتن و داوایان لە کەسوکاری کوژراوەکە کرد ئەو کەسەی کە مردووە بیشارنەوە، چوونکە مردوو تا زووتر بشاردرێتەوە باشترە. دوای ئەوەی مردووەکە

شاردرایەوە، هەردوو لا بە نێوەندگیریی مامۆستایان و خەڵکی تر کۆ بوونەوە بزانن ماڵی کوژراوەکە داوای چی دەکەن، ئەوانیش گوتبوویان داوای هیچ ناکەین تەنها ئەو کوڕەمان ڕادەست بکەن بیکوژینەوە و تەواو، تۆڵە بە تۆڵە، لەوێدا مامۆستایەکی ئایینی هەڵدەستێتە سەر پێ و پێیان دەڵێت بێگومان لەو تۆڵەکردنەوەیە باشتر و خێرتر هەیە، ئەویش لێخۆشبوونە و داوای شتێکی تر بکەن، ئەوانیش وتبوویان تەنها تۆڵەکردنەوە و کوشتنەوەی ئەو کوڕە، کێشەکە پێنج ڕۆژ بەو شێوەیە مایەوە، تاوەکوو ئەوە بوو لە کۆتاییدا ماڵی کوژراوەکە ڕازی بووبوون بەوەی لەبەرامبەر بڕە پارەیەکی زۆر و کچێك لە خوێنی کوژراوەکەیان خۆش بن، کەسێك خێرا ئەو هەواڵەی بۆ مامم هێنا، مامم پیاوێکی دەوڵەمەند بوو، بەڵام کچەکانی هەموویان شوویان کردبوو، بۆیە پێی گوتن پێیان بڵێ چەندیان پارە دەوێت با داوای بکەن، بەڵام هیچ کچێکم نییە پێیان بدەم، زوو هەواڵ هاتەوە و گوتیان با کچی براکەیان پێ بدات، هەرچەندە مامۆستایانی ئایینی پێیان گوتبوون ئەو جۆرە کارانە شەرعی نین و کچ بەزۆر بەشوودان و لەبریی خوێنبایی نابێت، بەڵام ئەوان تەنها بەو شێوەیە ڕازی بوون، کاتێك دایکم ئەو هەواڵەی زانی، لە سەری خۆی دەدا و دەگریا و دەیگوت شتی وا نابێت، تا ئەوە بوو مامم هات لەگەڵ کوڕەکانی، مامم پیاوێکی باش و زۆریش کەسێکی ژیر بوو، لەبەرامبەر دایکم کەوتە سەر چۆك و دەگریا، دەیگوت: بنەوشم بەقەد ئەو چاوانەی خۆم خۆش

دەوێت، وەڵاهی ئەوەی گوێم لێ نییە ماڵی دونیایە، چەندیان دەوێت پێیان دەدەم، بەڵام ئەوان ڕازی نابن، دەزانم کوڕم هەڵەیەکی زۆر گەورەی کردووە، بەرگری لەو کارە خراپەی ئەو ناکەم، بەڵام ئێستا ژیانی کوڕی من بەندە بە بڕیاری تۆ و کچەکەت، دایکم ڕازی نەدەبوو، تا ئەوەی بنەوش هاتە ژوورەوە و بەگریانەوە ڕووی کردە دایکم و مامم و پێی گوتن: گەر ئەو کێشەیە بە من چارە دەبێت و من ئەو ئاوەم ئەو ئاگرە دەکوژێنمەوە، ڕازیم. دایکم تووشی سەرسووڕمان بوو بەو قسەیەی خوشکەکەم، نەیدەزانی چی بڵێت، مامیشم بەگریانەوە بەرەو ڕووی بنەوش هات و لەئامێزی گرت و سەری ماچ کرد و زۆر سوپاسی کرد، مامم خێرا هەواڵی نارد کە ئێمە ڕازین بەو مەرجانە، بۆ ڕۆژی دواتر هاتن بۆ ئەوەی بنەوش مارە بکەن و لەگەڵ خۆشیان بیبەن، کاتێك هاتن، ئەو کوڕەی کە بڕیار بوو ببێتە مێردی بنەوش، گوتی: دەمەوێت بەتەنها لەگەڵ بنەوش و دایکی قسە بکەم، کوڕێکی باڵابەرزی ئەسمەری چوارشانە بوو، دە ساڵێك لە بنەوش گەورەتر بوو، پێدەچوو کەسێکی خراپ نەبێت، ناوی (ئەمین) بوو، دوای ئەوەی لەگەڵ دایکم و بنەوش قسەی کرد، لە ژوورەکە هاتنە دەر، خێرا مارەیان کرد و ئێمە بە فرمێسکڕشتن ماڵئاواییمان کرد لە بنەوش، ئەوانیش بنەوشیان برد، دوای ئەوەی ئەوان ڕۆیشتن، دایکم لە گریان بەردەوام بوو، ڕۆیشتم بۆ لای بۆ ئەوەی دڵی بدەمەوە و پێم گوت: دایە ئەو کوڕە چیی پێ گوتی: فرمێسکەکانی سڕی و گوتی: کاتێك هاتە ژوور، ڕووی کردە







بنەوش و پێی گوت: دەزانم وا خەریکە باجی هەڵەی کەسێکی تر دەدەیت و دەبیتە دەرمان بۆ برینێك کە کەسێکی تر هۆکاریەتی، ئەمن هەرگیز بەو شێوە هاوسەرگیریکردنە ڕازی نەبووم، بەوە نا کە بڵێم تۆم بەدڵ نییە، بێگومان ئێوە یەکێکن لە جوانترین کچەکانی دەڤەرەکە، بەڵام هەرگیز ڕازی نیم و حەز ناکەم هیچ کچێك بەبێ حەزی خۆی و بەزۆر بدرێت بە پیاوێك کە نەیەوێت، ئێستا گەر ناتەوێت یان زۆریان لێت کردووە، دەڕۆم و پێیان دەڵێم.

بنەوش تەماشایەکی کرد و گوتی: من خۆم پێم وتوون ڕازیم، دوای ئەوە ڕووی لە من کرد و وتی: وەڵاهی من بەو کارە ڕازی نەبووم، حەزم نەکرد هەر وەکوو چۆن ماڵی ئێمە وێران بوو ماڵی کەسی تر وێران بێت، بەڵام مامەکانم هەڕەشەیان لێ کردم و زۆریان لێ کردم و منیش ڕزای بووم، بەڵام بەڵێنت پێی دەدەم وەکوو نوری چاوم ئاگاداری بنەوشی کچت بم و ئاگام لێی بێت و خۆشم بوێت.

دوای ئەوە ڕۆیشتن.

شەو هەمووومان گوێمان لە دەنگی تەقە بوو لە گوندی خواروو، هەمووشمان دەمان زانی ئەو تەقەیە واتای چییە.

لێرەدا قسەکانم بە پوورم بڕی و ویستم پشوویەك بدات، بۆیە گوتم:

- ئەو تەقانە واتای چی بوون؟

- کوڕم لە کۆندا یەکێك لە عاداتە ناشیرین و خراپەکان ئەوە بوو کاتێك بووك و زاوا شەو بەیەك دەگەیشتن، خزمان و کەسوکاری





زاوا پەڕۆیەکی سپییان دەدا بە زاوا تاوەکوو بیسەلمێنێت کە بووک کچە و ئەویش نێرە و پیاوە، دواتریش زاوا ئەو پەڕۆ بەخوێنەی نیشانی خزمان و کەسوکاری دەدا و ئەوانیش تەقەی خۆشییان دەکرد، شتێکی سەیر بووە، وا نییە؟ هەر وەکوو ئەوەی هەموو پیاوەتیی ئەو کەسە لەوەدا بێت بگات بە جەستەی کچەکە، نەك دڵی کچەکە.

- چ نەفامییەك بووە.

- ئیتر ئێمە لەنێو ئەو جۆرە نەفامییانە گەورە بووین.

- ئەی دوایی چی ڕووی دا، دایکم بارودۆخی چۆن بوو، ماڵی باوکم مامەڵەیان چۆن بوو لەگەڵ دایکم، ئەی دایەگەورەم چۆن بەتەنها بەرگەی ئەو ئازارەی دەگرت؟

- پاش پازدە ڕۆژ ئینجا بنەوش هاتەوە بۆ ماڵی دایکم و کاك ئەمینیش، واتا باوکی تۆشی لەگەڵ بوو، لە ماوەی ئەو پازدە ڕۆژە من هەموو ڕۆژێك دەڕۆیشتم بۆ لای دایکم و لەلای دەبووم و ئاگام لێی دەبوو و کاروباری ناوماڵم بۆ دەکرد، کاتێك بنەوش هاتەوە، زۆر دڵخۆش دیار بوو، هەرگیز لەو کچانە نەدەچوو کە لەجیاتیی خوێنبایی و تۆڵە درابێت بە شوو، کاك ئەمین تاوەکوو پاشنیوەڕۆ لە ماڵی دایکم مایەوە و کاتێکیش ویستی بڕوات، بە دایکتی گوت: تا کاتێك دڵت حەز دەکات لێرە بە و هەرکاتێکیش ویستت بێیتەوە، منداڵێك بنێرە خۆم دێم بەدواتا. ئەوەی گوت و ماڵئاوایی





لە هەمووان کرد و ڕۆیشت، دایکم کاتێک بینیی بنەوش دڵخۆشە لەگەڵ باوکت و باوکت بەباشی مامەڵەی لەگەڵ دەکات، تۆزێك دڵی ئارام بوویەوە، دواتر من و بنەوش دووقۆڵی لێی دانیشتین.

لێرەدا قسەکانم بە پوورم بڕی و پێم گوت:

- باسی چیتان کرد؟

پوورم بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

- کوڕم، دوو خوشك ماوەیەك یەکتریان نەدیتبێت دەبێت باسی چی بکەن، وەڵاهی باسی دار و بەردمان کرد.

- حەز دەکەم بزانم باسی چیتان کردووە، بێگومان ئەوەی کە پێویستە من بیزانم.

- کوڕم پەلە مەکە، هەموویت بۆ باس دەکەم.

- باشە بەسەر چاو، ئەوە گوێم گرتووە.

- ڕۆیشتین بۆ ژێر سێبەری دارە گەورەکەی حەوشەی ماڵی دایکم و پێم گوت: ئێستا باسی کاك ئەمینم بۆ بکە. زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: باشە، ئەمین زۆر لەگەڵم باشە، دایکیشی زۆر لەگەڵم باشە، دەزانی چ شتێکی زۆر وای لێ کردم بکەوێتە ناو دڵم، یەکەم شەو کاتێك ڕۆیشتین بۆ ژووری خۆمان، ئەمین دەیزانی هێشتا بارودۆخەکە بۆ من نامۆیە و کاتی دەوێت تاوەکوو من لەگەڵ

ئەو و ئەو بارودۆخە ڕادێم، ماوەیەك تێپەڕی هەردووكمان بێدەنگ وەستابووین، دواتر دەستی منی گرت و لەسەر كورسییەك منی دانیشاند و ڕۆیشت بۆ لای مێزەكە، بە شتێك یەكێك لە پەنجەكانی خۆی بریندار كرد و پەڕۆ سپییەكەی بەخوێن كرد و دایەوە بە خزم و كەسوكاری، ئەوانیش دەستیان كرد بە تەقەكردن و خۆشیدەربڕین. منیش بەسەرسووڕمانەوە بەرەو لای چووم و پێم گوت: ئەوە چیت كرد؟ وەڵامی داوە شتی لەوە گرنتر هەیە باسی بكەین. دەستی گرتم و ڕۆیشتین لەسەر جێگاكە دانیشتین و ڕووی كردە من و گوتی: تا كاتێك تۆ نەتەوێت و ئامادە نەبیت ئەو شتەی ئەوان وا دەزانن تەواو بووە و ئەنجامان داوە، دڵنیا بە ئەنجامی نادەین، بەڵام كۆمەڵێك شت هەیە حەز دەكەم بیانزانی، دایكم بۆ من هەموو شتێكە و زۆرم خۆش دەوێت، هەرشتێك ئەو دڵخۆش بكات منیش دڵخۆش دەكات و هەرشتێك ئەو بێزار و نیگەران بكات بێگومان منیش نیگەران و بێزار دەكات. هەركەسێك دایكی منی خۆش بوێت، بە ئەركی خۆمی دەزانم خۆشم بوێت و ڕێزی بگرم. خۆت ئاگاداری دایكم بەتەمەندا چووە، بۆیە ڕەنگە تۆزێك ئەركی لە ژنی تر قورستر بێت، بەڵام ژنێكی دونیادیتەیە و دیندارە، دڵنیام بەوە زۆر نیگەرانە كە باوكمان كۆچی دوایی كردووە و گەر تەماشای ڕۆخساریشی بكەیت، ئەوە بەڕوونی دیارە، بەڵام دڵنیام دڵخۆشیش دەبێت بەوەی كە دەبینێت كچێكی ژیری وەكوو تۆ بووە بە بووكی، ئەمن داوات لێ ناكەم بە دایكە بانگی بكەیت، خۆ ئەگەر بانگت

کرد بەو ناوە، من زۆر خۆشحاڵ دەبم، بەڵام داوات لێ دەکەم وەکوو دایکی خۆت مامەڵەی لەگەڵ بکەیت، دڵنیام ئەوەیش وەکوو کچی خۆی مامەڵەت لەگەڵ دەکات، ڕەنگە خزمەکانم وا هەست بکەن تۆ لەجیاتیی خوێنبایی وەر گیراویت، بەڵام دڵنیا بە ئەمن وا هەست ناکەم. دواتر دەستەکانی توند گوشیم و گوتی: ئێ ئەمن زۆرم قسە کرد، ئێوە هیچ ناڵێن؟ منیش وەڵامم دایەوە و وتم: وەڵاهی لای ئێمە وا باوە پیاو قسە دەکات و ژن گوێ دەگرێت و هەرچیی پیاو بیڵێت هەر ئەوەیە. وەڵامی دامەوە، وتی: بەڵام لای من وا نییە، بێگومان چۆن قسەی من گرنگیی هەیە، ئاوهاش قسەی تۆ گرنگیی خۆی هەیە، هەرشتێک پەیوەندیی بە تۆوە هەبێت، مافی خۆتە قسەی تێدا بکەیت. کاتێک گوێبیستی ئەو قسانە بووم و بینیم چەند بەجوانی مامەڵەم لەگەڵ دەکات و هەرشتێک دەکات بۆ ئەوەی من هەست بە ئاسوودەیی بکەم. چاوم بڕییە چاوەکانی و پێم گوت: وا خەریکە دەبێتە دوو ساڵ من باوکم نەماوە، دەزانی بۆ من باوکم گەورەترین پەناگە بوو، ڕاستە باوکم پیاوێکی زۆر بەسۆز نەبوو، بەڵام هەرکاتێک شتێکم کردبایە و دایکم یان خوشکە گەورەکەم ویستبایان لێم بدەن، خێرا دەڕۆیشتمە لای ئەو، لە ئامێزی ئەودا خۆم دەشاردەوە، دەزانی کاتێک بەرەو ئامێزی ئەو ڕام دەکرد و ئەویش دەستەکانی واڵا دەکرد بۆم، هەستم بە چی دەکرد؟ هەستم بەوە دەکرد دەرگاکانی بەهێزترین قەڵام بۆ کراونەوە و بەس بگەمە ناو قەڵاکە، تەواو، دواتر بێباکم لە هەرچیی هێزی ئەو دونیایەیە،

چونکە لەناو بەهێزترین قەڵادام، ئەویش ئامێزی باوکمە، بەڵام دوای مردنی ئەو ئیتر قەڵاکە بوونی نەما و بێپەناگە مامەوە، بۆیە ناچار دەبوو لەمەودوا خۆم بەرگری بکەم لە خۆم و بەهێز بم و کار بکەم بۆ ئەوەی هەم ئاگاداری خۆم بم، هەمیش ئاگادرای دایکم بم. ئاگاداری خۆم نەبووم کە وا خەریکە بەگریانەوە ئەو قسانە بۆ ئەمین دەکەم، کاتێک هەستم بەوە کرد کە دەستی ئەمینم لەسەر ڕوومەتەکانم بینی و وا خەریکە فرمێسکەکانم دەسڕێت، کاتێک سەیرم کرد دەستەکانی واڵا کرد و وتی: ئێستا دووبارە تۆ خاوەنی ئەو قەڵا بەهێزەی و بەڵێنت پێ دەدەم هەمیشە پارێزراو و دڵخۆش بیت لەناو ئەو قەڵایە. منیش ڕۆیشتمە ناو ئامێزی. سبەی بینیم وا ئەمین زوو هەڵستاوە و ڕۆیشتووە بۆ حەمام بۆ ئەوەی وا نیشانی بدات شەو شتێك ڕووی داوە، دواتر هاتە ژوورەوە و بە خاولییەکەی سەری خۆی وشك دەکردەوە و بە ئیشارەت پێی گوتم هەڵسە تۆش بڕۆ. منیش هەڵستام و ڕۆیشتم و دوای هاتنەدەرەوەم خێرا ڕۆیشتم بۆ ئەوەی نانی بەیانی ئامادە بکەم، هێشتا خەڵکی و بەتایبەتی ژنان دەهاتن بۆ لای ئەمین و دایکی بۆ پرسە و سەرەخۆشی، بەشێکی زۆریان بە شێوەیەکی خراپ مامەڵەیان لەگەڵ دەکردم، بەڵام ئەمین گوتی: هەر ماوەیەکی ترە و هەموو شتێك لەبیر دەکەن، ئیتر بەو شێوەیە ڕۆژەکان تێدەپەڕین تاوەکوو ئەو پازدە ڕۆژە تەواو بوو، ئێستاش ئەوە لای تۆم خوشکە ئازیزەکەم. منیش وەڵامم دایەوە و وتم: ئەی قوربانی خوشکە ژیر و عاقڵەکەی خۆم بم. لەو کاتەدا





دایکم بانگی کردم و وتی: ئەرێ کچم، ئەتوو ماڵ و مێردت نییە وا لێرە دانیشتووی، هەستە بڕۆوە شتێك بۆ ئەو پیاوە بەستەزمانەت ئامادە بکە و با ئەو کچەش بێت ئیش و کاری ئەو ماڵەی بکات. دایکم تەواو دڵخۆش بوو کە زانیی بنەوش لەگەڵ مێرد و خەسووەکەی ئاسوودەیە. ئیتر من بۆ ماڵی خۆم ڕۆیشتم و بنەویشیش بۆ ئیش و کار و ماڵخاوێنکردنەوەی ماڵی دایکم.

دواتر هەستم کرد پوورم قوڕگی وشك بووە، هەڵستام و ڕۆیشتم پەرداخێك ئاوم بۆ هێنا، کاتێك ئاوەکەی خواردەوە، پێم گوت:

- ئێ پوورە جوانەکەم، گەیشتینە کوێ؟

- دواتر هەڵستاین و ڕۆیشتین و پاش پێنج ڕۆژ، بنەوش بە دایکمی گوت: دایە دەبێت بڕۆمەوە، دڵنیام هێشتاش خەڵك هەر دێت بۆ ماڵمان، دایکیشم گوتی: کچم چۆنت پێ باشە ئەوها بکە، منداڵێك بنێرە با کاك ئەمین بێت بەدواتا بۆ ئەوەی لەگەڵی بچیتەوە. ئێوارە کاك ئەمین هات و شەو لای ماڵی دایکم مایەوە و سبەی زوو ڕۆیشتنەوە. بەو شێوەیە ڕۆژ و مانگەکان ڕۆیشتن تاوەکوو ئەوەی هەواڵ هات کە بنەوش دووگیانە، هەمووومان بەو هەواڵە دڵخۆش بووین، ئەو ڕۆژەی هەواڵەکە هات مامیشم هاتبوو سەردانی دایکم بکات بزانێت هیچی پێویست نییە، کاتێك ئەو هەواڵەی زانی، گوتی: خێرا بڕۆن دوو مانگا سەر ببڕن و گۆشتەکەی بکەنە خێر و لەنێو خەڵکی بەشی بکەن. دایکم بەو هەواڵە زۆر دڵخۆش بوو.

ئیتر وەکوو جارانیش ئەو کێشەیە نەمابوو و خەڵکی وردەوردە لەبیری دەکرد، بۆیە دایکم ڕۆژێك گوتی؛ کچم بە مێردەکەت بڵێ و مۆڵەتی لێ وەر بگرە، وەرە با پێکەوە بڕۆین بۆ دیدەنی بنەوش و ماڵی مێردی. کاتێك ڕۆیشتین، کاك ئەمین و دایکی پێشوازییەکی زۆر گەرمیان لێکردین، ئیتر دایکی ئێمە و دایکی کاك ئەمین پێکەوە داینشتن و ئێمەش ئەو سێیانەمان پێکەوە دانیشتین، کاتێك تەماشای دایکی خۆم و دایکی کاك ئەمینم دەکرد، دەمگوت ئەو دوو ژنە دەڵێیت سەد ساڵە یەکتری دەناسن، بە جۆرێك لەگەڵ یەکتری تێکەڵ بووبوون، کە هەندێك جار دەتبینی وا خەریکە فرمێسکەکانیان دەسترِن، بووبوون بە دوو هاودڵی زۆر باشی یەکتری، ئاخر ئەوان هەردووکیان لە خاڵێکی زۆر گرنگدا هاوبەش بوون، ئەویش نەمانی هاوسەرەکانیان بوو، بۆیە هەر ئەوەش هۆکار بوو بۆ ئەو زوو تێکەڵییەیان، چوونکە ئەوان باش دەیانزانی هەریەکێکیان تووشی چ ئازارێك بووە و باشتر لە دەردی یەکتری تێدەگەیشتن. تا ئێوارە لە ماڵی ئەوانماینەوە، هەرچەندە دایکی کاك ئەمین زۆر داوای کرد شەو لەوێ بمێنینەوە، بەڵام هاتینەوە، هەفتەیەك دوای ئەوە کاك ئەمین خۆی هات و دایکی ئێمەی لەگەڵ خۆی برد بۆ ماڵی خۆیان، بەو شێوەیە بۆ هەرچواریان باش بوو، ئیتر بەو شێوەیە ڕۆژەکان و مانگەکان ڕۆیشتن تاوەکوو تۆ لەدایك بوویت، ئەو ڕۆژەی تۆ لەدایك بوویت، مامم لە خۆشیی ئەوە سێ سەر مەڕی کرد بە خێر، دوای هەفتەیەکیش باوکت، کاك ئەمین

بانگهێشتنامەیەکی ناردبوو بۆ ماڵی ئێمە و مامم و ئاسیاوەکانم بۆ ئەوەی بچین بۆ نانخواردن بۆ گوندەکەی ئەوان، لەدایکبوونی تۆ بوو بە هۆکارێک بۆ ئەوەی دووبارە دوو گوندەکە وەکوو برا لەدەوری یەکتری کۆ ببنەوە. هەموو شتێك بەخۆشی تێدەپەڕی، تا ئەوە بوو دوای ساڵێك لە لەدایکبوونی تۆ دایەگەورەت، واتا دایکی باوکت شەوێکیان نوست و بۆ هەمیشە هەڵنەستایەوە، خوا لێی خۆش بێت، بەڕاستی ژنێکی باش بوو، پاش ئەوەی دایکی کاك ئەمین کۆچی دوایی کرد، کاك ئەمین داوای لە دایکم کرد بڕوات لەگەڵ ئەوان بژیت، دایکیشم ڕازی بوو، ئیتر بە هۆی چوونی دایکم بۆ لای ئەوان وردەوردە برینی نەمانی دایکی کاك ئەمین خەریك بوو سارێژ دەبوو، دایکم هەستی بە خۆشحاڵی دەکرد لەگەڵ بنەوش و کاك ئەمین و تۆدا، دایکم تۆی زۆر خۆش دەویست، کاك ئەمین ژیانێکی خۆشی بۆ خوشکەکەم و دایکم و تۆ دروست کردبوو، کە گشت خەڵکی ئیرەیی پێ دەبردن، ڕۆژگار ڕۆیشت و تۆ وردەوردە دەتتوانی ڕێ بکەیت، تا وات لێ هات بوویتە نزیکەی چوار ساڵ، کاك ئەمین پیاوێك بوو هەمیشە حەزی لێ بوو بەهاران بڕوات بۆ چیا و بۆ کردنی سورازە و عەندرێشکە و کوزەڵە و ئەو جۆرە گژوگیایانە، ڕۆژێکیان بنەویشیش دەڵێت: منیش حەز دەم لەگەڵت بێم و ئەو شاخوداخە ببینم. تۆ لای دایکم جێ دەهێڵن و بە سواری دوو هێستر دەڕۆن بۆ چیای کۆدۆ، پێش عەسر هەواڵێك دێت کە هیچکەس حەزی بە بیستنی ئەو هەواڵە نەبوو.

پوورم دەستی کرد بە گریان.

- چ هەواڵێک بوو؟

- لە ماڵی خۆمان دانیشتبووم لەگەڵ مێردەکەم، کاتێک گەنجێک بەڕاکردن هات و دای لە دەرگای ماڵەکەمان، بەپەشۆکاوی گوتی: تەرمی کاك ئەمین و بنەوشی خوشکت لە مزگەوتی گوندی خوارووە. من باوەڕم بە گوێکانی خۆم نەدەکرد کە چیم بیست، بەخێرایی وەکوو هەورەبروسکە بەڕاکردن ڕۆیشتین بۆ گوندەکەی باوکت. کاتێک گەیشتین، وا دەبینم لای مزگەوت پڕیەتی لە خەڵك، کاتێک گەیشتین، دایکم بەکوڵ دەگریا و ئارامیی نەمابوو، کەسێکی لێ بوو دیار بوو شوان بوو، ئەو تەرمەکانی هێنابوویەوە، خەڵك دەورەیان لێ دابوو، ئەو ئاگاداری ئەوە بووبوو چۆن ئەڵغام پێیاندا تەقیبۆوە، بۆ خەڵکەکەی باس دەکرد و دەیگوت: من لە چیاکەی بەرامبەر ئەوان بووم کاتێک گوێبیستی دەنگی تەقینەوەی ئەڵغام بووم، کاتێک تەماشام کرد، تەنها تەپوتۆزم بینی بەرەو ئاسمان بەرز دەبوویەوە، لەو کاتەدا بینیم کەسێك بەڕاکردنەوە هاوار دەکات و بەرەو شوێنی تەقینەوەکە دەڕوات، منیش دەستم کرد بە ڕاکردن بەرەو لای ئەوان، زۆری پێ نەچوو دەنگی تەقینەوەیەکی تریش هات لە نزیك تەقینەوەی پێشتر، مەودای من تۆزێك دوورتر بوو لەوان، کاتێك گەیشتمە نزیکیان بە هێواشی و وریایی ڕێم دەکرد، لە ترسی ئەوەی نەوەکوو ئەڵغامی تری لێ بێت، ئەو شوێنە پێشتر ئەڵغامی لێ نەبوو، بەڵام بە هۆی باران و خزینی زەوییەوە لە سەرەوە بەرەو خوارەوە هاتبوون، کاتێك گەیشتم،





سەرەتا ڕۆیشتم بۆ لای پیاوەکە، بینیم وا خەریکە گیانی دەر دەچێت، نەیتوانی هیچ بڵێت، من پێشتر ئەوم بینیبوو، بۆیە ناسیمەوە، گیانی دەر چوو و دواتر ڕۆیشتم بۆ لای ئەوەی تریان، بینیم ژنە، ئەویش جەستەی شێوابوو بە هۆی ئەڵغامەکە، خێرا ڕۆیشتم و داوای یارمەتیم کرد و بە سواری وڵاخ هێنامانەوە بۆ ئێرە.

ساتێکی نامۆ بوو، پوورم بە جۆرێك دەگریا، هەروەکوو ئەوەی دیمەنەکەی لە بەرچاو بێت، منیش چیتر بەرگەم نەگرت و لەگەڵ پوورم دەستم کرد بە گریان. پوورم گوتی: مەگری کوڕی خۆم، ئەوە دونیایە، کەس تا سەر لەسەری بەزیندوویی نامێنێت.

دواتر پرسیم: ئەی دوای کۆچی دایك و باوکم، داپیرەم چیی کرد؟ چۆن ژیانی دەکرد؟

پوورم ئاهێکی هەڵکێشا و گوتی:

- دایکم تەنها بە جەستە هەستت دەکرد زیندووە، ئەگینا هیچ شتێکی لە زیندووەکان نەدەکرد، نە قسەی دەکرد، نە نانی دەخوارد، هەرچەندی پێمان دەگوت، هیچ سوودێکی نەبوو، هەر ئەوەش وای لێ کرد دوای سێ مانگ ئەوەیش وەکوو ئەوانی تر بڕوات و ئەو دونیایە جێ بهێڵێت. ئیتر ئێمە تەنها ماینەوە، من و مێردەکەشم هەر پاش مردنی دایك و باوکت تۆمان هێنایە لای خۆمان و بە کوڕی خۆمان دامان نای، دوای مردنی دایکیشم بڕیارمان دا گوند جێ بهێڵین و بێینە چۆمان. لەو کاتەوە دەستمان کرد بە ژیانێکی نوێ،

تۆ ماڵی ئێمەت کرد بە ماڵێکی ئاوەدان، ئاخر پێم بڵێ ماڵێك تێیدا گوێت لە گریان و هاوار و پێکەنینی منداڵ نەبێت، کوێی لە ماڵ دەچێت، مەگەر دیوار و دەرگاکانی. منداڵ بۆ ماڵ خێر و بەرەکەتە. دڵنیام خوا خۆی باشتر دەزانێت و خێرێکی تێدا بووە ئێمە نەبووینە خاوەنی منداڵ. بەڵام وەڵاهی گەر خاوەنی منداڵیش بام، هەر ئەوەندەی ئێستای تۆ خۆشم دەویست گەر خۆشیشم ویستبایە.

لە پوورم نزیک کەوتمەوە و سەرم ماچ کرد، ڕاستی من بۆ ڕۆژێکیش هەستم نەکرد دایك و باوکم نەمابێت یان کوڕێکی بێ دایك و باوك بم، پوورم و مێردەکەی خۆشەویستی و گرنگیی تەواویان پێ دەدام.

سەیرێکی کاتژمێرەکەم کرد، بینیم وا خەریکە بانگی عەسر دەبێت، ڕۆیشتم و دەستنوێژم شۆرد و ڕۆیشتم بۆ مزگەوت، دوای ئەوەی نوێژمان کرد، گەڕامەوە و کاتێك گەیشتمەوە ماڵێ، بینینم مێردی پووریشم گەڕاوەتەوە، پێکەوە دانیشتین و پوورم چای هێنا بۆ هەردووکمان، مێردی پوورم ڕووی کردە من و گوتی:

- کوڕم، کاتی ئەوە نەهاتووە بیرێك لە ژیانی خۆت بکەیتەوە و بۆ خۆت ماڵوحاڵێك پێکەوە بنێیت؟

پوورم وەڵامی دایەوە، گوتی: کاتی چی؟ گەنجی لە تەمەنی ئەودا ئێستا دوو-سێ منداڵیان لەدوو دەڕۆن، بڵێ زوو کە، خەمێك لە خۆت بخۆ، دەنا ئێمە خەمێکت لێ دەخۆین.





هەر سێکیان پێکەوە دەستیان کرد بە پێکەنین. مێردی پوورم کەسێک بوو هیچکات لە قسە خۆشەکانی وەڕەس نەدەبوویت، بەردەوام بووین لە قسەکردنی سێقۆڵی تاوەکوو بوو بە نزیکەی سەعات پێنج و نیو، ئیتر کاتی ئەوە بوو من بگەڕێمەوە بۆ هەولێر، بۆیە ماڵئاواییم کرد لێیان و لەو مووچەیەی وەرم گرتبوو و شتێکم گێڕایەوە و ئەوەی ترم بە پوورم داو و دواتر بەرەو هەولێر بەڕێ کەوتم.

لە ڕێگا بیرم لە دایك و باوکم دەکردەوە، ڕاستی دڵتەنگ بووم بۆ ڕۆیشتنیان و ئەو جۆرە ڕۆیشتنەیان، بەڵام دڵخۆش بووم کە زانیم باوکم چ جۆرە پیاوێك بووە و چەند ڕێزی لە دایکم گرتووە و چەند یەکتریان خۆش ویستووە. بیرم لە داپیرەم دەکردەوە و بەزەییم پێدا دەهاتەوە، ئاخر هەبوونی ئازیزان لە چواردەورت وەکوو ئەو ڕەنگە جۆراوجۆرانەیە، هەر ئازیزێکت ڕەنگێکی تایبەتە، ژیانت جوانتر دەکات، بە نەبوون یان ڕۆیشتنی ئازیزێکت، ڕەنگێکت لە تابلۆی ژیان کەم دەبێتەوە، تا وای لێ دێت ڕۆژێك دادێت تاکە ڕەنگێکت نەماوە و هەموویان تەواو بوون، ئیتر لەوێوە تاریکی باڵ دەکێشێت بەسەر ژیانی مرۆڤدا. بیرم لە پوورم دەکردەوە، ئەو ژنێکی بەهێز بوو، پیاوەکەی خۆشی دەویست، من ئەوانم خۆش دەویست و ئەوانیش زۆر منیان خۆش دەویست. لەو بیرکردنەوانەدا بووم کاتێك تەماشام کرد وا کچێك لەتەنیشت لێواری جادەکە وەستاوە، داوای یارمەتی دەکات و سەیارەکەیان خۆی کێشاوە بە گردەکەی تەنیشت جادەکە، کاتێك سەیارەکەم هێواش کردەوە، بینیم ئەو سێ

کچەن کە بەیانییەکەی لە گۆمی فێلاو بینینم، جامەکەم هێنایە خوارەوە و گوتم: فەرموو؟

دوای ئەوەی سڵاوی کرد، گوتی:

- سەیارەکەمان ئیش ناکات، سوپاسی یارمەتیدانت دەکەین.

منیش خێرا دابەزیم، سەیرم کرد ڕادێتەرەکەی تەقیبوو، منیش تەماشایەکم کردن و گوتم:

- ئەوە ڕادێتەرەکەی تەقیوە و پێویستە کرێن بێت باری بکات و بیباتە لای فیتەر.

یەکێکیان گوتی: ئێستا ئێمە بەو ئێوارەیە کرێن لەکوێ بێنین؟

منیش وەڵامم دایەوە: ئێوە بۆ کوێ دەڕۆن؟

هەر ئەو کچەیان وەڵامی دامەوە و گوتی: هەولێر.

منیش وتم: زۆر باشە، منیش دەگەڕێمەوە بۆ هەولێر. ئێستا تەلەفۆن بۆ هاوڕێیەکم دەکەم لە چۆمان کە باوکی کرێنی هەیە، پێی دەڵێم کرێنەکە بهێنێت و سەیارەکە بار دەکەین و بەڕێ دەکەوین بۆ هەولێر.

یەکێکی تریان گوتی: ئاخ گیان، چەند شتێکی باشە.

کاتێك برادەرەکەم گەیشت، توانیمان بە یارمەتیی هەندێك کەسی تر سەیارەکە بار بکەین، وا ڕێك کەوتین کە کچەکان لەگەڵ من بێن و هاوڕێکەشم سەیارەکە بهێنێت.





تا هەموو ئەو کارانەمان کرد، بوو بە مەغریب، بۆیە من و هاوڕێکەم ڕۆیشتین بۆ مزگەوتێك کە لەنزیك ئەو شوێنە بوو و نوێژی مەغریب و عیشامان کرد، پاشان بەڕێ کەوتین. لەناو سەیارەکەدا یەکێکیان لە پێشەوە و دوویان لە دواوە دانیشتن. ماوەیەك ڕۆیشتین، کەس هیچی نەگوت، تاوەکوو ئەوە بوو یەکێکیان لەو کچانەی دواوە گوتی:

- دەڵێیت ئێمە ناناسی؟

منیش بەسەرسووڕمانەوە گوتم: ببورن، بۆ دەبێت بتانناسم؟!!

کچەی تریان لەوانەی دواوە گوتی: ببورن بەڕێز، خوشکەکەم مەبەستێکی خراپی نەبوو. چوونکە ئێمە دیارین لەناو سۆشیاڵ میدیا، بۆیە خوشکەکەم وا هەستی کرد کە دەبێت بمانناسی.

دەستی کرد بە خۆناساندن و گوتی: من (یاران)م، مۆدێل و مەیکەپ ئارتیستم و ئەوەش خوشکەکەمە (باران)، ئەویش پێشکەشکاری تەلەڤزیۆنە و ئەوەی پێشەوەش (میرا)یە، هاوەڵی دووەمی شاجوانی ئاسیا.

منیش بزەیەکم بۆ کردن گوتم: خۆشحاڵ بووم.

یاران گوتی: هەر ئەوەندە خۆشحاڵ بووم و بەس، ئەی ئێوەش خۆتان ناناسێنن؟!







منیش لە ئاوێنەکەوە تەماشایەکم کرد و گوتم: بۆ نا، منیش خۆم دەناسێنم. من ناوم (موحسین)ە، ئەندازیاری شارستانیم و خەڵکی چۆمانم و لە هەولێر ئیش دەکەم.

هەرسێکیان پێکەوە گوتیان: ئێمەش خۆشحاڵ بووین بە ناسینت.

میرا ڕووی کردە من و گوتی: هەر بەڕاست ئێمە ناناسی، مەبەستم ئەوەیە ئێمە ئەو سێیەمان ئێستا بەناوباگترین سێ کچی سۆشیاڵ میدیاین، لە سناپچات و ئینستاگرام زۆرترین بینەر و فۆڵەوەرسمان هەیە، دەکرێت نەماننناسی.

منیش وەڵامم دایەوە: ڕاستی من زۆر کەم سۆشیاڵ میدیا بەکار دەهێنم، گەر بەکاریشی بهێنم، ئەوا فەیسبووک و جارجاریش ئینستاگرام بەکار دەهێنم و تا ئێستا سناپچاتم بەکار نەهێناوە. دوای ئەوە پرسیم:

- خاتوونینە، ئەوە چۆن چۆنی بوو تووشی ئەو ڕووداوە بوون؟

میرا وەڵامی داوە و گوتی:

- من شۆفێریم دەکرد و یاران لەتەنیشتم دانیشتبوو، خەریکی سناپکردن بووین، هەر ئەوەندەمان زانی سەیارەیەك بەرەو ڕوومان هات، منیش خێرا ویستم بچمەوە سەر سایدی خۆمان، بەڵام چوونکە خێرا سوکانم شکاندەوە، خۆمان کێشا بەو گردەی تەنیشت جادەکە.

ماوەیەك لە ترسان نەماندەتوانی لە سەیارەکەش بێینە دەرەوە،
تاوەکوو باران لە دواوەوە پرسیی؛

- ئێوە سەلامەتن؟

ئێمەش وەڵاممان دایەوە: بەڵێ، سەلامەتین.

دوای ئەوە باران گوتی:

- با داوای یارمەتی بکەین و بزانین کەسێك نایەت یارمەتیمان بدات.

ئەوە بوو تۆ هاتی.

منیش گوتم: سەیرە!

باران بەسەرسامییەوە گوتی: چ شتێك سەیرە!

منیش وەڵامم دایەوە و گوتم: بە جۆرێك تێکەڵی ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییانە بووین، لەبیرمان کردووە کە لە ژیانی ڕاستەقینەی خۆمان چۆن دەژین، وامان لێ هاتووە ژیانێکی ساختەمان بۆ خۆمان دروست کردووە، ژیانێك گەر کەسانێك لە نزیکەوە نەماننناسن، وا گومان دەبەن ژیانی ئێمە پڕیەتی لە جوانی، پڕیەتی لە خۆشی، دوورین لە هەرچیی خەم و ئازار و ناخۆشی و کێشەی ئەم دونیایە، ماوەیەك لەمەوبەر کورتە ڤیدیۆیەکم بینی، کەسێك باسی لەوە دەکرد کە ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییانە درۆن، مرۆڤەکان







جوانترین ساتەکانیان لەوێ بڵاو دەکەنەوە و جوانترین وێنەکانیان ئەو کاتە دادەنێن کە بە باشترین شێوە دەر کەوتوون، هیچکەسێك شکستەکانی، ناخۆشییەکانی، کێشەکانی لەوێ بڵاو ناکاتەوە، چوونکە نایەوێت کەس بیبینێت. دڵنیام هەر ئێوە ئەمڕۆ زۆرترین ڤیدیۆتان بڵاو کردۆتەوە لە ئینستاگرام و سناپچات، بەڵام دڵنیام لەوەی کە سەیارەکەتان تووشی کێشە هاتووە و زۆریش ترساون، هەرگیز ئەوە بڵاو ناکەنەوە.

لە قسەکردن بەردەوام بووم تا ئەوە بوو هاوڕێکەم تەلەفۆنی کرد، گوتی:

- ئەرێ کاکە لە شوێنێك ناوەستن، من خەریکە لە برسان دەمرم.

منیش ڕووم کردە کچەکان و پێم گوتن:

- ئەو هاوڕێیەم برسییەتی، ئێوە دەڵێن چی لە خواردنگەیەك بوەستین و شتێك بخۆین و پاشان بڕۆین.

دیار بوو هەرسێکیان ڕازی بوون، بۆیە گوتیان با دابەزین. پاش ئەوەی بۆ ماوەیەك پشوومان دا و نان و چامان خوارد، سواری سەیارەکانمان بووینەوە و بەڕێ کەوتین. پاش ماوەیەك بێدەنگی باران لە پشتەوە گوتی:

- ئەندازیار، پرسیارێك بکەم ئاساییە؟

منیش بە بزەیەکەوە وەڵامم دایەوە: لە خزمەتتدام فەرموو.





- هاوسەرگیریتان کردووە؟

- نەخێر.

میرا کە لە کوشنەکەی پێشەوە دانیشتبوو، گوتی:

- چۆنە کوڕێکی باش و سەرکەوتوو و قۆزی وەکوو ئێوە تاوەکوو ئێستا هاوسەرگیریی نەکردووە؟

یارانیش دەستی کرد بە قسەکردن و گوتی:

- میرا ڕاست دەڵێت ئەوە، بۆچی تا ئێستا هاوسەرگیریت نەکردووە، ئەی خۆشەویست و برادەری کچ، مەڵێ ئەویشم نییە.

زەردەخەنەیەکم کرد و گوتم: ئەویشم نییە.

یاران گوتی: بۆچی؟

- ڕاستی، هەرگیز حەزم نەکردووە پێش هاوسەرگیری پەیوەندیی سۆزداریم هەبێت لەگەڵ کچێك، حەزم کرد ئەگەر هەبوو، پاش ئەوەی زانیم کەسی گونجاوین بۆ یەکتری، ڕاستەوخۆ هاوسەرگیری بکەم.

میرا گوتی: ئایە دڵخۆشی بەو شێوەیە، مەبەستم ئەوەیە گەر خۆشەویستێکت هەبایە، پێکەوە نامەتان گۆڕیباوە و جارجار پێکەوە ڕۆیشتبانە دەر باشتر نەبوو.

- الحمداللــــە دڵخۆشم بەو شێوەیە، ڕاستە گەر هاوبەشێکی ڕاســـتەقینەم هەبایە بێگومان خۆشـــییەکە زیاتر دەبوو، بەڵام








وەکوو ئەوەی تۆ دەیڵێیت کچێك برادەرم بێت تەنها بۆ ڕابواردن و کاتبەسەربردن، سوپاس بۆ خوا ئێمە لەو جۆرە گەنجانە نین و بەو شێوەیە پەروەردە نەکراوین، هەرگیز حەزم نەکردووە هیچ کچێك بکەمە ئامرازێك بۆ کاتبەسەربردن و هەرکاتێکیش حەزم کرد لێی دوور بکەومەوە...

باران قسەکانی پێ بڕیم و گوتی:

- هەر بەڕاست ئێوە کوڕێکی ئاوان، بەو شێوەیە بیر دەکەنەوە، یان تەنها لە بەرچاوی ئێمە وا خۆتان بە باشە نیشان دەدەن؟

- ڕاستی، پێم وا نییە شتێك هەبێت وام لێ بکات خۆم بەو شێوەیە دەربخەم و ناچاریش نیم. بەڵام تەنها ئەوە نەبێت لای ئێمە و لە دینی ئێمەدا ئافرەت زۆر پیرۆزە و زۆر لەوە گەورەترە تەنها وەکوو کاڵایەك یان شتێك سەیر بکرێت بۆ تێرکردنی حەزەکانی پیاو، یان بەس بۆ کاتبەڕێکردن بێت.

دوای ئەوەی ئەو قسانەم کرد، ویستم بزانم ئەوانیش هاوسەرگیرییان کردووە یان نا، بۆیە پرسیم:

- ئێ واز لە من بێنن، ئەی ئێوە چی؟

میرا یەکەم جار وەڵامی دایەوە، گوتی: من هێشتا شووم نەکردووە، کوڕی زۆریش داوایان کردووم، بەڵام ڕازی نەبووم.





دوای ئەو یاران گوتی: من جارێك هاوسەرگیرم كردووە، بەڵام پێكەوە نەگونجاین، بۆیە دوای ساڵێك لە یەكتری جیا بووینەوە.

بارانیش وتی: منیش بە هۆی ئەوەی پێشكەشكارم داوای زۆرم لێ دەكرێت، بەڵام تا ئێستا حەزم لە ئەنجامدانی هاوسەرگیری نەبووە.

كاتێك ئەوان لە قسەكانی خۆیان تەواو بوون، لێم پرسین: ئایە دڵخۆشن بەو ژیانەی ئێستا تێیدا دەژین.

سەرەتا هەرسێكیان بێدەنگ بوون، دوای ئەوە یاران وەڵامی دایەوە، گوتی:

- بۆچی دەبێت دڵخۆش نەبین لە كاتێكدا پارە، سەیارە، ناوبانگ، شوقەی بەرز و جوان، هەموو ئەو شتانەمان هەیە كە دڵخۆشمان دەكات، بۆیە بەڵێ، ئێمە دڵخۆشین.

منیش وەڵامم دایەوە: ئەوانە تەنها هۆكارێكن بۆ ئەوەی مرۆڤ هەست بە دڵخۆشی بكات و باوەڕیشم وایە هۆكاری گرنگن، بەڵام دڵخۆشیی ڕاستەقینە دەبێت سەرچاوەكەی دڵ بێت. دڵیش هەست بە دڵخۆشیی ڕاستەقینە ناكات تاوەكوو خاوەنەكەی پەیوەندییەكی باشی نەبێت لەگەڵ خوا. بۆیە باوەڕم وایە ئێوە تەنها وا خۆتان نیشان دەدەن كە دڵخۆشن، نەك دڵخۆش بن، ئەو دوو شتەش جیاوازیی زۆریان هەیە لەگەڵ یەكتری.

یاران گوتی: ببورە ئەندازیار، بەڵام تۆ چۆن ڕێگە بە خۆت دەدەیت لەجیاتیی ئێمە بڕیار بدەیت کە ئاخۆ ئێمە دڵخۆشین یان نا.

منیش وەڵامم دایەوە: ڕاستی من بەتەنها مەبەستم ئێوە نەبوو، مەبەستم ئەوانەیە کە ناو و ناوبانگێکی زۆریان هەبوو، شۆخوشەنگ و جوان و پارە و سەیارە و بگرە فڕۆکەی تایبەتیشیان هەبوو، وازیش لەوە بێنە چەند ڤێلا و شوقەی تایبەتیان هەبووبێت، بەڵام کۆتایی زۆرێکیان ئەوە بوو خۆیان کوشت یان هەندێکیان تووشی خەمۆکی و ماددەی هۆشبەر بوون، یان شکستیان هێنا لە ژیانی هاوسەرگیری و پاش ماوەیەک لە هاوبەشی ژیانیان جیا بوونەوە، نموونەشمان زۆرن، (مارلینا مونرو، کە بە یەکێک لە جوانترین ژنەکانی دونیا دادەنرێت، بە هۆی زۆریی وەرگرتنی دەرمانی دژە خەمۆکی مرد، دالیدا شاجوانی میسرِ بۆ ساڵی ١٩٥٤ خۆی کوشت، براد پیت و ئەنجیلا جولی، کە باوەڕم وایە گشت پیاو و ژنێک ئاواتی پێیان خواستووە پاش ماوەیەک لە هاوسەرگیری لە یەکتری جیا بوونەوە) کە ئەوانە لە دونیای ماددە پێویستیان بە هیچ نەبوو، لەسەر تەلەڤزیۆنیش کاتێک دەردەکەوتن، بە دەنگی بەرز پێدەکەنین و هەموومان لە دڵی خۆماندا وا گومانمان دەکرد کە ناکرێت هیچکەسێک هەبێت لەوانە دڵخۆشتر و بەختەوەرتر بێت. بگرە زۆربەمان ئاواتەخوازی ژیانی ئەوان بووین، بەڵام کاتێک کۆتاییەکەمان دەبینین، تووشی شۆک دەبووین، کە چۆن دەکرێت کەسێک بەو هەموو پارە و ناوبانگ و خۆشییەی تێیدایە پەنا





بەرێتە بەر خۆکوشتن و خۆی بکوژێت، یان بۆ دەبێت لە یەکتری جیا ببنەوە و تووشی ئەو هەموو کێشەیە ببن.

میرا زۆر بەباشی گوێی گرتبوو بۆ قسەکانم، هەر بۆیەش کاتێك تەواو بووم پرسیی:

- ئەندازیار، تۆ گوتت کە دڵخۆشیی ڕاستەقینە مرۆڤ ئەو کاتە هەستی پێ دەکات کە پەیوەندییەکی باشی هەبێت لەگەڵ خوای خۆی و دڵی خۆی وابەستە کردبێت بە ئەوەوە، پرسیارەکەی من ئەوەیە، ئایە دەکرێت لەو حەوت ملیار کەسەی لەسەر ئەو زەوییە ژیان دەکەن، تەنها ئەوانە هەست بە دڵخۆشی بکەن کە پەیوەندییەکی باشیان هەیە لەگەڵ خوای خۆیان، لە کاتێکدا ڕێژەی ئەو کەسانە زۆر کەمن لەچاو ئەو حەوت ملیار کەسەی تر؟

- ئێمە دوو جۆر دڵخۆشی و هەستکردن بە بەختەوەریمان هەیە، جۆرێکیان لەو کار و کردارانەوە سەرچاوە دەگرن کە ئێمە ڕۆژانە ئەنجامیان دەدەین، نموونەی گەیشتن بەوەی دەمانەوێت و هاوسەرگیریکردن لەگەڵ ئەو کەسەی دەمانەوێت و بەدەستهێنانی ناوبانگ و کۆکردنەوەی پارەی زۆر و ڕابواردن لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەر و ئەنجامدانی چالاکیی جۆراوجۆر و یارمەتیدانی کەسێکی هەژار و دەستگرتنی کەسێکی نابینا و پەڕاندنەوەی لەوبەری شەقام بۆ ئەوبەری شەقام و سەیران و گەشتوگوزار و کۆبوونەوە لەگەڵ هاوڕێیان و گێڕانەوەی نوکتەی پێکەنیناوی

و بەشداریکردن لە کارێکی خێرخوازیدا. گشت مرۆڤەکان ئەو جۆرە دڵخۆشییەیان هەیە و هەستی پێ دەکەن، بەڵام ماوەی ئەو جۆرە دڵخۆشییە کەمە و زوو تەواو دەبێت، هەروەها بۆ ئەوەی دووبارە هەست بە دڵخۆشی بکاتەوە، پەنا دەباتەوە بەر ئەنجامدانی یەکێك لەو کارانەی لە سەرەوە باسمان کرد، کاتێکیش بێزار دەبێت لە ئەنجامادانی ئەو کارانەی پێشتر باسمان کرد، مرۆڤەکە هەست بە بۆشاییەك لە ژیانی دەکات، ئەو بۆشاییە وای لێ دەکات تووشی خەمۆکی و نائومێدی ببێت، بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەش، زۆربەی کات مرۆڤ یان پەنا دەباتە بەر خۆکوشتن، یا مادده هۆشبەرەکان. لەبەرامبەر ئەوەدا دڵخۆشی و بەختەوەری و ئاسوودەییەکی هەمیشەییمان هەیە، ئەویش ئەو کاتە بەدەست دێت کە مرۆڤ واتایەکی ڕاستەقینەی بۆ ژیانی هەبێت، بزانێت کێیە؟ بزانێت بۆچی دروست کراوە و چارەنووسی چییە؟ لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە بزانێت خوای کێیە؟ کاتێك مرۆڤ زانیی خوای کێیە و زانیی لەبەر چی دروستی کردووە، چیی لێ دەوێت؟ بۆ دەبێت باشە بکات و دوور بێت لە خراپە؟ کاتێك مرۆڤ وەڵامی ئەو پرسیارانەی زانی و ئەو ئەرکانەی جێبەجێ کرد کە خوا لە بەندەیەکی خۆی دەیەوێت، ئیتر ڕاستەوخۆ مرۆڤەکە هەست بە ئارامی و دڵخۆشی و بەختەوەریی ڕاستەقینە دەکات. ڕاستە تووشی کێشە دەبێت و زۆر جاریش سوپای خەم و دڵتەنگی هێرشی بۆ دێنن، بەڵام ئەو خاوەنی خوایەکە هەمیشە بەتەنها جێی





ناهێڵێت و هەمیشە بەدەم داوای بەندەکەیەوەیەتی. ئینجا سەرەڕای ئەو دڵخۆشی و بەختەوەرییە ڕاستەقینەیەی کە خاوەنیەتی، چێژیش دەبینێت لەو کار و کردەوانەی کەسێك ئەنجامی دەدا کە خاوەنی تەنها دڵخۆشی و بەختەوەرییە کاتییەکە بوو.

میرا پرسیی: باشە مرۆڤ چۆن وەڵامی ئەو پرسیارانەی دەست بکەوێت؟

منیش وەڵامم دایەوە وتم: وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە و سەدان و هەزاران پرسیاری تر لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری نازدارمان(ﷺ)دا هەیە؟

میرا دووبارە پرسیی: باشە ئەی ئەوانەی باوەڕیان بەو شتانە نییە کە تۆ باست کردن؟

لێرەدا یاران هاتە قسەکردن و گوتی:

- ئەندازیار، بۆ ئەوەی شتەکە زیاتر ڕوون بێت لای بەڕێزتان، میرا موسڵمان نییە، مەسیحییە! ئێمە موسڵمانین، بەڵام بەڕاشکاوی بیڵێم تەنها لەسەر ناسنامەکەمان وا نووسراوە، ئەگینا پابەند نین بە دینەوە؟

منیش بەسەرسامییەوە گوتم:

- ببورن خاتوونینە، ڕاستی وام زانی میرا خانیش موسڵمانە و تەنها ئەوەیە کە پابەندیتان بە دینەوە کەم بێت.

میرا بزەیەکی کرد، ویستی شتێك بڵێت، لەو کاتەدا هاوڕێکەم تەلەفۆنی کرد، گوتی:

- ئەندازیار گیان، وا خەریکە دەگەینە هەولێر، چی لەو سەیارەیە دەکەن؟ بۆ چ شوێنێکی دەبەن؟

منیش ڕووم کردە کچەکان و پێم گوتن: ئەوە ئەو هاوڕێیەم دەڵێت: ئەوە چی لەو سەیارەیە بکەم.

میرا گوتی: با بەدوای ئێمەدا بێت، دەڕۆین بۆ پیشەسازیی باکوور، لەوێ وەستایەك هەیە هەرکاتێك سەیارەکەم کێشەی هەبێت دەیبەم بۆ لای ئەو.

منیش تەماشایەکی کاتژمێرەکەم کرد، گوتم: کاتژمێر نۆیە ئێستا، ئەو کەسە چی دەکات لەوێ؟

میرا گوتی: ژمارە مۆبایلم پێیە، ئاگاداری دەکەمەوە.

دوای ئەوەی میرا تەلەفۆنی بۆ ئەو وەستایە کرد، ڕۆیشتین بۆ لای ئەو، کاتێك گەیشتین ئەویش تازە دیار بوو دەگەیشتە دوکانەکەی، سەیارەکەمان داگرت و هاوڕێکەم وتی: ئەندازیار گیان، خزمەتێك، ئیشێك، کارێك.

منیش گوتم: بۆ کوێ؟ ئەمشەو ناڕۆیت، پێکەوە دەڕۆین بۆ کۆمپانیا، ئەمشەو پشوویەك بدە، سبەی بڕۆ.





گوتی: نابێت، دەبێت بڕۆمەوە، باوکم سبەی بەڵێنی بە کەسێك داوە کاریان بۆ بکات.

دوای ئەوە میرا پارەی هاوڕێکەمی دا و هاوڕێکەم ڕۆیشت، میرا بەشەرمەوە گوتی: ئەندازیار، لەوە زیاتر نابینە ئەرك بەسەرتەوە، سوپاس بۆ هەموو شتێك، ئیتر ئێوەش بڕۆن و ئێمەش بە تەکسییەك دەڕۆین.

منیش گوتم: نابێت، تازە تاوەکوو نەتانگەیەنمەوە شوێنی خۆتان، لەگەڵ خۆم دەبن.

دوای ئەوە ڕۆیشتین تاوەکوو ئەوەی گەیشتین بە شاری خەونەکان، لەوێ دابەزین، منیش ماڵئاواییم لێ کردن.

پێش ئەوەی بڕۆم، میرا گوتی: ببورە ئەندازیار، ناوونیشانێك، ژمارە تەلەفۆنێك، بۆ ئەوەی دوایی بە خزمەتت بگەین و سوپاست بکەین.

منیش وتم: سوپاسی ناوێت و ئەرکی سەرشانی خۆمان ئەنجام داوە، بەڵام ئەوەش ژمارە تەلەفۆنەکەم و لە دەرەوەی سەد و بیستی لە کۆمپانیا دەمێنمەوە، کۆمپانیای حاجی کەمال، وا خەریکی دروستکردنی یەکەی نیشتەجێبوونین، هەرکاتێك پێویستیتان بە شتێك بوو، من لە خزمەتتدام.

دوای ئەوە ماڵئاواییم لێ کردن و بەرەو کۆمپانیا هاتمەوە، لە ڕێگا هاوڕێکانم بیرکەوتنەوە، بۆیە مۆبایلەکەم دەرهێنا و پەیوەندیم








کرد بە بەڵێنەوە، لێم پرسین لە کوێن؟ ئەویش گوتی: وا تازە خەریکە دەگەینەوە هەولێر، منیش گوتم: سڵاوم بگەیەنە بە هاوڕێیان، پاشان دامخستەوە.

سبەی کاتێك چووم بۆ سەر ئیش، (حاجی کەمال) و (نور)ی کچی لەسەر ئیش بوون، حاجی کەمال بە زەردەخەنەیەکەوە دەستی هێنا و گوتی:

- ئەندازیار، بەخێر بێیتەوە،ماڵێتان چۆن بوون؟

- سوپاس حاجی گیان، ڕێز و خۆشەویستیتان هەیە، الحمدالله ئەوانیش باش بوون، سڵاو و ڕێزیان هەبوو بۆ بەڕێزتان.

دوای ئەویش نور، کە ساڵێك بوو ئەندازیاریی تەواو کردبوو و وەکوو یاریدەدەر لای من ئیشی دەکرد، بە بزەیەکەوە گوتی:

- بەخێر بێیتەوە، باشیت ئەندازیار؟

- زۆر سوپاس، ئێوە چۆنن، باشن؟

دوای ئەوە حاجی کەمال گوتی:

- ئەندازیار، سوپاس بۆ خوا وا خەریکە ئەو پڕۆژەیەش تەواو دەبێت، تۆزێك ئەو ماوەیە دەستوبرد بکەن بەڵکوو بتوانین ئەو پڕۆژەیەی وا خەریکە بڵاو دەکرێتەوە لە وەزارەت بتوانین کێبڕکێ بکەین لەسەری و پڕۆژەکە بۆ ئێمە یەکلایی بێتەوە.





منیش وەڵامم دایە: بەسەر چاو حاجی گیان.

دوای ئەوە حاجی کەمال ئێمەی جێ هێشت و ڕۆیشتە ژوورەکەی خۆی و من و نوریش ڕۆیشتین بۆ لای کرێکارەکان.

دەتوانم بڵێم حاجی کەمال یەکێك بوو لەو دەوڵەمەندانەی کە پارە و سامانی زۆر نەیانگۆڕیبوو، ئەو پیاوێکی باڵابەرز نەبوو، بەڵام ڕەوشت و ئەخلاقی باڵا بوو، دڵی واڵا بوو، کەسێکی خاکی بوو و زۆریش دیندار بوو و خێزانەکەیشی (حاجی سبیعە) ژنێکی تا بڵێی باش بوو، تەنها خاوەنی یەك کچ بوون، ئەویش (نور) بوو. لە قۆناغی دووەمی زانکۆ بووم کاتێك حاجی کەماڵم ناسی و لای ئەو دەستم بە کارکردن کرد و بەتایبەتی هاوینان و کاتی دەوامیش، پاش ئەوەی لە دەوام تەواو دەبووم، دەڕۆیشتمەوە بۆ کۆمپانیا، چوونکە ئەو کات حاجی کەمال بۆخۆی پێشنیاری بۆ کردم لە داخیلی زانکۆ نەمێنم، لە کۆمپانیاوە هاتوچۆ بکەم بۆ زانکۆ. ئەوەش هەمووی لە ڕێگەی یەکێك لە دکتۆرەکانی زانکۆمانەوە کە وانەی پێمان دەگوتەوە، ناوی دکتۆر (ئیدریس) بوو، دکتۆر ئیدریس هاوڕێی مێردی پوورم بوو، چوونکە ئەویش خەڵکی چۆمان بوو، بەڵام دواتر هاتبوو بۆ هەولێر، دۆستایەتییەکی بەهێزیشی هەبوو لەگەڵ حاجی کەمال، هەر بە هۆی ئەوەشەوە بوو کە زۆر لەگەڵ من باش بوو و بۆ من وەکوو مامۆستایەکی تایبەت وا بوو، هەمیشە ئامۆژگاریی دەکردم و دەیگوت:

- موحسین کوڕم، ئەگەر دەتەوێت لە ئیش و کاردا سەرکەوتن بەدەست بهێنی، هەمیشە هەوڵ بدە لایەنی کۆمەڵایەتیت بەهێز بێت، هەوڵ بدە هەمیشە دەمبەخەندە و کەسێکی کراوە بیت، ڕاستگۆ بیت، دڵسۆز بیت، چوونکە مرۆڤی ژیر بە هۆی تێکەڵاوی و ناسینی خەڵکییەوە پارە پەیدا دەکات و مرۆڤی گەمژەش بۆ پارە خەڵکی لە خۆی دەتۆرێنێت.

ڕۆژەکانی هەفتە بەخێرایی تێدەپەڕین، تا ئەوە بوو، ڕۆژی چوارشەممە نزیکی سەعات دە و نیو بوو، مام عەزیز کە ئیش و کاری پاکوخاوێنیی ناو ئۆفیس و چایچیی کۆمپانیا بوو، هات و گوتی:

- ئەندازیار، خاتوونێك وا هاتووە بۆ لای تۆ.

- کێیە؟

- نازانم.

- بیبە بۆ ژوورەکەم، منیش ئێستا ئەو کارە تەواو دەکەم و دێم.

دوای ئەوەی ڕۆیشتمە ژوورەکەم، بینینم وا (میرا)یە بەتەنها هاتبوو، چەپکێك گوڵیشی هێنابوو، دوای ئەوەی بەخێرهاتنم کرد، میرا گوتی:

- ببورە کە بەبێ ئاگاداریی بەڕێزتان هاتووم، هیوادارم هیچ کێشەیەکتان بۆ دروست نەکەم.





- ئەو قسانە چییە، زۆر خۆشحاڵ بووم، بەخێرهاتی، ئەی کوان ئەو دوو خاتوونەی تر، مەبەستم (باران خان و یاران خانە)؟

- ڕاستی بەتەنها هاتم و نەوانم ئاگادار نەکردەوە، ببورە دەبووایە زووتر بێم بۆ سوپاسکردنتان لە پای ئەو شەوەی بۆ ئێوە بووینە بارگرانی، بەڵام خەریکی چاککردنەوەی سەیارەکەم بووم. بۆیەش ئێستا هاتم تاوەکوو پێتان بڵێم حەز دەکەم و گەر ئێوەش حەز دەکەن، ئێوارە میوانی من بن و پێکەوە نانێک بخۆین.

- پێشتریش وتم هیچ پێویست بە سوپاس ناکات، تەنها بە ئەرکی خۆمان هەستاوین، بۆ بانگێشتەکەش، سوپاستان دەکەم و نابمە مایەی زەحمەت بۆتان.

- زەحمەتی چی، خۆ من خواردن دروست ناکەم، دەڕۆین بۆ شوێنێک کە کەشوهەواکەی ئارام بێت و نانێک پێکەوە بخۆین و هەندێک قسەش هەیە حەز دەکەم پێتانی بڵێم، بۆیە حەز ناکەم داواکەم ڕەت بکەنەوە و هیوادارم قبوڵی بکەن.

ڕاستی سەرەتا حەزم نەدەکرد بڕۆم، بەڵام کاتێک وتی: هەندێک قسە هەیە حەز دەکەم پێتی بڵێم، منیش ڕازی بووم و گوتم:

- بەسەر چاو، إن شاء الله هیچ ڕوو نەدات، ئێوارە لەو شوێنەی ئێوە دیاریی دەکەن دێمە خزمەتتان.

میرا دیار بوو کاتێک زانی من بە بانگێشتەکەی ڕزای بووم، خۆشحاڵ بوو، دوای ئەوەی ژمارە مۆبایلەکەی خۆی دانا و

ماڵئاوایی کرد و ڕۆیشت. دوای ئەوەی میرا ڕۆیشت، من خەریکی ڕێکخستنەوەی هەندێک شتی سەر مێزەکە بووم، لەو کاتەدا حاجی کەمال و نوریش هاتنە ژوورەوە، حاجی کەمال گوتی:

- ئەندازیار، ئەو خاتوونە کێ بوو؟ چ ئیشێک ئەوی هێنابوو بۆ ئێرە؟

- ڕۆژی شەممە کاتێک دەگەڕامەوە بۆ هەولێر، سەیارەکەیان تووشی کێشە بووبوو، بۆیە منیش یارمەتیم دان و سەیارەکەم بە کرێنێکی هاوڕێکەم و ئەوانیشم بە سەیارەکەی خۆم هێنایەوە بۆ هەولێر، ئەمڕۆش هاتبوو بۆ ئەوەی لە پای ئەو کارەی ئەو ڕۆژە لەگەڵم کردبوون سوپاسم بکەن.

سەرێکی لەقاند و گوتی:

- ئەها، واتا بۆ سوپاسگوزاری هاتبوو.

- بەڵێ، قوربان.

- کارێکی باشتان کردووە و خوا پاداشتتان بداتەوە، بەڵام ئاگاداری ئەو جۆرە کچانە بە، مەهێڵە زۆر لێت نزیک بکەونەوە.

- بەسەر چاو، حاجی گیان.

- ئەندازیار، نوری کچم پێشنیازێکی هەیە بۆ خانووەکانی نەخشەی چوارەم، بزانە چی دەڵێت و پێکەوە قسەی لەسەر بکەن و دواتر ئاگادارم بکەنەوە.





ـ باشە، بەسەر چاو.

دوای ئەوەی حاجی کەمال ڕۆیشت، نور ویستی باسی پێشنیازەکەی بکات، بەڵام کاتێك گوڵی سەر مێزەکەی بینی، وا هەستم کرد نیگەرانیی پێوە دیارە، نازانم ڕەنگە غیرەشی کردبێت، بۆیە بە ئاهێکەوە گوتی:

ـ دەزانی من ئەو کچە دەناسم، ئەوە میرا بوو، هاوەڵی دووەمی شاجوانی ئاسیا. بە گوێرەی ڤیدۆکانی بێت لە ئینستاگرام و سناپچات، ژیانێکی شاهانە دەژیت. دەزانی منیش دەتوانم خۆشتر و باشتر لەو بژیم و بگەڕێم و تەخشانوپەخشان بکەم بەو پارەیەی باوکم، بەڵام بۆ ڕۆژێکیش حەزم نەکردووە ئەو کارە بکەم، حەزم کردووە هەمیشە کیژێکی باش بم بۆ باوکم و دایکم و ڕێزی ئەو پارانە بگرم کە باوکم پەیدایان دەکات.

ـ بێگومان ئێوە کچێکی ژیرن و ئەو جۆرەی کە بیر دەکەنەوە شایانی ڕێزە.

نور کچێکی تا بڵێت جوان بوو، هەمیشەش سوور بوو لەسەر ئەوەی کە بە باشترین شێوە خۆی داپۆشێت و پۆشتە بێت، دڵنیا بووم لەوەی هەموو کوڕێك حەزی دەکرد کچێکی تێگەیشتووی وەکوو نور هاوسەری بێت. دوای ئەوە نور پێشنیازەکەی کرد، زۆر بەلامەوە جوان بوو، بۆیە پێم گوت:

ـ ئەی ئافەرین، شتێکی جوانە، بڕۆ بچین بۆ لای حاجیی باوکت، بزانین ئەو چی دەڵێت.

دوای ئەوەی ڕۆیشتین بۆ لای حاجی کەمال و لەگەڵ ئەویش دووبارە تاوتوێمان کرد، ئەویش ڕزای بوو و گوتی: ئیشی لەسەر بکەن، بزانین چۆن دەبێت.

پاشنیوەڕۆ کاتژمێر یەك و چلوپێنج خولەك بوو، مەحویی هاوڕێم تەلەفۆنی کرد، گوتی:

ـ ئەرێ کاکە ئەوە تۆ بۆ وەڵامی ئەو تەلەفۆنانە نادەیتەوە؟ دەزانی لە کەییەوە خەریکم بە ئینتەرنێت و سیمکارتەوە تەلەفۆنت بۆ دەکەم، وەڵام نادەیتەوە.

ـ ببورە لەلای حاجی کەمال بووم و مۆبایلەکەشم لە ژووری خۆم بیر چووبوو، تازە مام عەزیز بۆی هێنام. چی بووە، بۆ وا مشەوەشی.

ـ مێردی پوورت تەلەفۆنی بۆ من کرد و گوتی:

ـ موحسین وەڵامم ناداتەوە، بزانە تۆ شتێك ناکەیت، پووری نەخۆشە، وا لە نەخۆشخانەین بزانە گەر مەجالی هەبێت نایەتەوە.

ـ چی، پوورم لە نەخۆشخانەیە!؟

ـ ئارام بەوە، هیچ نییە، پشتیوان بە خوا سەلامەت دەبێت، ئێستا تەلەفۆنێك بکە بۆ مێردی پوورت، دڵنیام زۆر نیگەرانە.





- زۆر باشە برا گیان، زۆر سوپاس بۆ تەلەفۆنەکەت.

دوای ئەوە تەلەفۆنم کرد بۆ مێردی پوورم، گوتی:

- ئێستا وا لە چاودێریی چڕە، گەر بتوانی بێیتەوە زۆر باش دەبێت.

منیش وتم: هەر ئێستا بەڕێ دەکەوم.

دوای ئەوە ڕۆیشتم بۆ لای حاجی کەمال بۆ ئەوەی ئەویش ئاگادار بکەمەوە لە بارودۆخی پوورم و مۆڵەتی لێ وەربگرم بۆ چوونەوەم، مۆڵەتی دا و دەستی بردەوە بۆ گیرفانی، بڕێك پارەی دەرهێنا گوتی: بیگرە.

گوتم: سوپاستان دەکەم، بەڵام پێویستیم پێ نییە.

بەڵام ئەو هەر سوور بوو لەسەر ئەوە، منیش لێم وەرگرت. دوای ئەوە خێرا بەڕێ کەوتم بۆ چۆمان. کاتێك گەیشتمەوە بۆ چۆمان، ڕاستەوخۆ ڕۆیشتم بۆ نەخۆشخانە. کاتێك گەیشتمە نەخۆشخانە، بینیم وا خەریکە مێردی پوورم لەگەڵ دکتۆرەکە قسە دەکات، پاش ئەوەی سڵاوم لێ کردن، دکتۆرەکە گوتی: شتێکی وا نییە، جەڵتەیەکی سووکە، داویەتی لە دەست و قاچی چەپی، بەڵام دەبێت ئاگاداری خۆی بێت و ئێوەش ئاگاداری بن. دواتر ڕۆیشتین بۆ لای پوورم، پوورم بە هۆی ئەو دەرزییانەی بۆیان کردبوو باشتر بوو، دکتۆرەکە گوتی: تاوەکوو شەو چاوەڕێ بکەن، گەر باشتر بوو، دەتوانن بیبەنەوە بۆ ماڵەوە.

دواتر دکتۆر ئارام تەلەفۆنی کرد، گوتی: باشیت موحسین گیان، پوورت چۆنە، باشترە ئێستا، ئەوە بەڵێنیشم لا یە، ئەویش لە تەندروستیی پوورت دەپرسێت.

منیش وەڵامم دایەوە: سوپاس بۆ ئێوە براکانم، الحمدالله ئێستا باشترە، سوپاس بۆ ئەحواڵپرسیتان.

دوای ئەوە بیرم کەوتەوە کە من ئەو ئێوارەیە بەڵێنم بە میرا دابوو بۆ نانی ئێوارە بچم بۆ لای ئەو. خێرا تەلەفۆنەکەم دەرهێناو ژمارەکەی ئەوم لێدا.

ـ بەڵێ.

ـ باشیت خاتوو میرا، منم ئەندازیار موحسین.

ـ دەزانم، فەرموون.

ـ ڕاستی ویستم داوای لێبوردن بکەم، ئەم ئێوارەیە ناتوانم بێمە خزمەتتان.

ـ بۆ شتێك بووە!؟

ـ پوورم جەڵتە لێی داوە، وا ئێستا لە نەخۆشخانەم.

ـ ئۆی، بەداخەوەم بەڕاستی. هیوای سەلامەتیی بۆ دەخوازم، گەر شتێك بە ئێمە دەکرێت، لە خزمەتتداین.

ـ ڕێزدارن، زۆر سوپاس، پشتیوان بە خوا پوورم تەندروستیی باش بێت و هاتمەوە بۆ هەولێر ئاگادارتان دەکەمەوە.





ـ زۆر باشە، بەڕاستی دووبارە زۆر بەداخەوەم.

دوای ئەوە ڕۆیشتمەوە لای پوورم، لای دانیشتم و توند دەستەکانیم گرتبوو و ماچم دەکردن، ئەویش بزەیەکی کرد بۆم. خەریك بوو پوورم شتێك بڵێت، کە دووبارە زەنگی مۆبایلەکەم لێیدایەوە. سەیرم کرد نوری کچی حاجی کەماڵە.

ـ سڵاو، باشیت ئەندازیار.

ـ زۆر سوپاس.

ـ پوورتان چۆنە؟ باشتر بووە ئێستا؟

ـ الحمدالله باشە.

ـ ئەوە باوکم و دایکیشم لەلان، ئەوانیش لە تەندروستیی پوورت دەپرسن.

ـ زۆر سوپاسیان دەکەم. گەورەییان نواند.

ـ باوکم دەڵێت خۆ پێویستی بە هیچ نییە.

ـ نا، زۆر سوپاسی بەڕێزیان دەکەم، خوا لێیان ڕازی بێت و هەمیشە لەشساغ و تەندروست بن.

دوای ئەوەماڵئاوایی کرد و منیش ڕۆیشتم بۆ لای پوورم. الحمدالله تەندروستیی پوورم بەرەو باشتربوون دەڕۆیشت، شەو دکتۆر گوتی: ئێستا ئەو زۆر باشترە، دەتوانن بیبەنەوە بۆ

بەڵام دەبێت هاتوچۆی پێ بکەن و وەرزش بکات بۆ ئەوەی باشتر بێت. دوای ئەوەی بردمانەوە بۆ ماڵ، دراوسێکان و خزمان و دۆستانی مێردی پوورم وردەوردە دەهاتن بۆ سەردانیکردنی پوورم و ئاگاداربوون لە تەندروستیی، ڕۆژبەڕۆژ و ساتبەسات تەندروستیی پوورم باشتر دەبوو، بۆ ڕۆژی هەینی سەعات یازدە دە خولەکی مابوو، لە دەرگا درا، کاتێك چووم بۆ ئەوەی دەرگاکە بکەمەوە، بینیم وا (مەحوی و دکتۆر ئارام و بەلێن و هۆشەنگ) بوون، بەڕاستی زۆر دڵخۆش بووم بەوەی کە بینینم وا هاتوون بۆ سەردانیکردنی پوورم، بەسەرسامییەوە لێم پرسین: ئەوە بۆ وا لەناکاو، بۆ تەلەفۆنێك، شتێکتان نەدەکرد بۆ ئەوەی ئاگادار بم.

هۆشەنگ وەڵامی داوە و گوتی:

ـ ببورە خارە، بەڕاستی خەجاڵەتم، بەڵام من شەو زانیم و دواتریش هاوڕێیان وتیان با بچین بۆ سەردانیکردنیان، منیش بە خۆم وت کەواتە سبەی بچین، تەلەفۆنەکە ناکەم، با شتەکە ببێتە لەناکاو.

ـ یا خوا بەخێر بێن، چاو و دڵم پێتان ڕوون. فەرموون، فەرموون، وەرن با بچینە ژوورەوە.

بەلێن وتی: وەڵاهی حەز دەکەین هەر لێرە ڕابوەستین.

گشتمان دەستمان کرد بە پێکەنین.

دوای ئەوەی ڕۆیشتینە ژوورەوە و سڵاوکردنیان لە پوورم و مێردی پوورم و دانیشتنمان، پوورم گوتی:





- کورم برۆ بانگی یەکێك لە کچی دراوسێکان بکە با بێت خواردنێك، شتێکمان بۆ ئامادە بکات.

خەریك بوو هەڵبستم برۆم، مەحوی گوتی: دانیشە کاکە. پێویستیمان بە کەس نییە، من خۆم خواردنێك ئامادە دەکەم.

منیش دانیشتمەوە، بەڵێن بە مەحویی گوت: باشە کاکە بۆ لێی نەگەڕای بڕوات، بۆ ئەوەی بزانین موحسین دراوسێکانی کچی جوانیان هەیە یان نا.

هەر بەڵێن ئەو قسەیەی کرد، هیچکامێکمان خۆمان پێ نەگیرا، دەستمان کرد بە پێکەنین، تەنانەت پوورم و مێردەکەشی.

هاورێ دیارییەکی جوانە، باوەڕم وایە خوا ئەو دیارییە نادات بە هەموو کەس، هاوڕێکانم لەو دوورەوە هاتبوون تەنها بۆ ئەوەی گەر هیچ نەبێت بۆ چەند کاتژمێرێك بە قسە خۆشەکانیان ئەو ئازارە لەسەر جەستەی پوورم لا بدەن و خەندە بخەنە سەر ڕووی.

دوای ئەوەی بانگی فەرموو، ڕۆیشتین بۆ مزگەوت، پاش ئەوەی هاتینەوە، مەحوی دەستی کرد بە خواردن ئامادەکردن و خواردنێکی بەتامی بۆ ئامادە کردین، پێکەوە لەسەر سفرە نانمان خوارد و دوای ئەوەی تەواو بووین، من و هۆشەنگ سفرەکەمان کۆ کردەوە و قاپ و شتەکانمان شۆرد و دوای ئەوە لەدەوری یەکتری کۆ بووینەوە. بەڵێن گوتی:

ـ موحسین، بەڕاستی مێردی پوورت پیاوێکی تا بڵێیت باش و بەڕێز و قسەخۆشە.

منیش وەڵامم دایەوە، گوتم:

ـ زۆر ڕاستە، ئەو پیاوێکی زۆر باشە، زۆریش میهرەبانە، هەمیشە هەوڵی داوە مێردێکی باش بێت بۆ پوورم، بەڵام ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام لەودا لە ماوەی ئەو دوو-سێ ڕۆژەی کە پوورم نەخۆشە مامەڵەی لەگەڵ پوورم زۆر باشتر بووە، زۆر لە جاران میهرەبانترە لەگەڵی، تەنانەت هەندێك جار کە پوورم تینووی دەبێت یا شتێکی دەوێت، ناهێڵێت من بچم، خۆی خێرا هەڵدەستێت بۆی دێنێت. دەزانی ئەو ڕفتارانەی ئەو چیی بیر هێنامەوە، گفتوگۆی (مۆری و میچ) کە مۆری لە باسی خێزاندا بە میچ دەڵێت:

ـ ئێستا خێزان وەکوو شتێکی زۆر گرنگتر لە جاران دەبینم، ئەگەر ڕاستیت دەوێت، جگە لە خێزان هیچ بناغە و زەمینەیەکی پتەو نییە لەمڕۆدا مرۆڤ لە سەری بوەستێ، ئێستا کە من نەخۆش کەوتووم، بەئاشکرا ئەوەم بۆ دەر کەوتووە. ئەگەر پشتگیری و خۆشەویستی و گرنگیپێدانی خێزانەکەت نەبێ، هیچی وات نییە، خۆشەویستی زۆر زۆر گرنگە... وای دابنێ لە ژنەکەم جیا بوومایەتەوە و ئێستا بەتەنیا بژیامایە، یا منداڵم نەبووایە، دەزانی ئەم نەخۆشییە چەند قورستر دەبوو بۆم! ڕاستی دڵنیا نیم لەوەی بەرگەم دەگرت یا نا، بێگومان خەڵك دەهاتن و سەردانیشیان





دەکردم، هاورێ و هاوپیشەکانیشم دەهاتن، بەڵام هیچکام لەو کەسانە وەك بوونی ئەو کەسە نین کە دەزانی نارِوات، کەسێك کە دەزانی گرنگیی تەواو بە داواکارییەکانت دەدات و بەردەوام چاوی لەسەرت دەبێ. خێزان بەتەنها خۆشەویستی نییە، خێزان ئەوەیە کە بەرامبەرت دڵنیا دەکەیتەوە لەوەی کەسێك هەیە ئاگای لێتە، ئەوەی کە خێزانەکەت بەدەورتەوەن و چاویان لێتە لای من ناوی *پارێزراوی ڕوحیی*ە، جگە لە خێزان، هیچ شتێکی تر ئەو هەستی پارێزراوییە لە ناختدا دروست ناکات، نە پارە، نە ناوبانگ، نە هیچ، تەنانەت کارەکەشت.

دوای ئەوەی باسی ئەو گفتوگۆیەی مۆری و میچم کرد، مەحوی گوتی:

ـ منیش دەمەوێت هەر لەسەر ئەو بابەتە شتێکتان بۆ باس بکەم، ئێمە خزمێکان هەبوو تەمەنێکی زۆری هەبوو، هێشتا ژنی نەهێنابوو، دوای ئەوەی ژنی هێنا، هێزی جارانی نەمابوو، هەر پاش ماوەیەك لەوە نەخۆش کەوت، هیچ منداڵێکیشیان نەبوو، نزیکەی بیستساڵێك لەسەر جێگا کەوت، ئەو ژنە زۆر بەباشی مامەڵەی لەگەڵ پیاوەکەی دەکرد و زۆر بەپاکی ڕای دەگرت، تا ئەوە بوو لە کۆتاییدا پیاوەکە مرد و ژنەکەی بەتەنها جێ هێشت، ئێوارەیەکیان ئەو ژنە هاتبوو بۆ لای دایکم، باسی بارودۆخی خۆی دەکرد، دەگریا و دەیگوت: بێپەنا مامەوە، بێکەس بووم، ماڵم لێ وێران بوو. دەزانی کە ئەو ژنە ئەو قسانەی دەکرد بیرم لە چی دەکردەوە؟

بیرم لەوە دەکردەوە کە ڕەنگە ئەو پیرەپیاوە بۆ ڕۆژێکیش بەوی نەگوتبێت خۆشم دەوێیت، بەڵام بۆ ڕۆیشتنی ئەو دەگریا. ئاخر ئەو بە هەبوونی ئەو هەستی دەکرد پیاوێك هەیە، هەرچەندە ئەو پیاوە نەخۆش بوو، ئەو ئاگای لەو بوو، بەڵام بۆ ئەو هەر هەستێکی دڵنیایی دەدا کە کەسێك لە ژیانیدا هەیە و پەناگەیە بۆی.

هاوڕێکانم تاوەکوو ئێوارە لام مانەوە، پێش ئەوەی بڕۆن، دکتۆر ئارام وتی: موحسین تۆ نایەیتەوە.

منیش وەڵامم دایەوە: نا هەر لێرە دەبم، پشتیوان بە خوا سبەی زوو بەڕێ دەکەوم و دێمەوە.

دوای ئەوەی خواحافیزییان لە پوورم و مێردی پوورم کرد، هاوڕێکانم ڕۆیشتن. منیش تاوەکوو بەیانیی ڕۆژی شەممە مامەوە، پوورم باشتر بووبوو، دەیتوانی بەبێ هیچ ئازارێك دەستەکەی بجووڵێنێت و لەسەر قاچەکانی خۆشی بڕوات. دوای ئەوەی گەیشتمەوە بۆ کۆمپانیا، نور هاتبوو، بەڵام هێشتا حاجی کەمال نەهاتبوو، نور دەربارەی تەندروستیی پوورم پرسیاری کرد و منیش وەڵامم دایەوە و دوای ئەوە نزیکی نیوەڕۆ بوو کاتێك حاجی کەمال هات و گوتی:

– ببورە ئەندازیار، نەهاتین بۆ سەردانیکردنی پوورت و ئەحوالپرسینی، دوعاکارم لە خوا شیفای بەخێر و خێرای بۆ بنێرێت.





- زۆر سوپاس حاجی گیان، بێگومان ئێوە نەشهاتبن، هەر بە هاتوو ئەژمار کراون.

دوای ئەوە دەستمان کردەوە بە کارەکانمان، کاتێک بۆ ئێوارە مۆبایلەکەم دەرهێنا بۆ ئەوەی پەیوەندی بکەم بە میراوە، بەڵام مۆبایلەکەی داخرابوو، ڕۆژانی دواتریش دوو جار هەوڵم دا، بەڵام هەر داخرابوو. ئیتر منیش هیچی تر هەوڵم نەداوە پەیوەندیی پێوە بکەم.

ڕۆژی پێنجشەممە بوو پاش عەسر، بەڵێن تەلەفۆنی کرد، پاش سڵاوکردن گوتی: ئەندازیار گیان زۆر خۆشحاڵ دەبم سبەی ئامادە بن لە شەکراوخواردنەوەکەم لە مزگەوتی مەلا قادری خۆشناو دوای نوێژی عەسر.

منیش بەسەرسامییەوە گوتم:

- ئەوە بەڕاستتە، هەی فێڵزان، ئەی بۆ ئێمە ئاگاداری هیچ نین.

- چی بکەین کاکە، بارودۆخەکە ئاوایە، هەندێک کاری خێر هەیە دەبێت سەرەتاکەی بەنهێنی بێت تاوەکوو ناحەزی بۆ پەیدا نەبێت.

- برا گیان، خوا بە خێر و خۆشی بەیەکتان بگەیەنێت، بەڕاستی پێم خۆش بوو، ئەمن لە ئێستاوە لە خزمەتتدام، هەر ئیشێک، کارێک بە ئێمە دەکرێت، لە خزمەتتداین.








ـ برای ئەزیزن، بەس ئەوەی سبەی پاش عەسرەکەی تەشریف بهێنن، ئەوە بۆ من هەموو شتێکە.

دوای ئەوە خواحافیزیمان لە یەکتری کرد، پاش ئەوەی تەلەفۆنەکەم لەگەڵ بەڵێن تەواو بوو، خێرا پەیوەندیم کرد بە پوورمەوە، پێم گوت:

ـ پووریّ گیان، باشیت تەندروستیت چۆنە؟ کاك حاجی چۆنە؟

پوورم وەڵامی دایەوە، گوتی: زۆر سوپاس کوڕی خۆم، ئەتوو چۆنی، باشیت؟ ئەمن زۆر باشم، جارجارە قاچم سڕ دەبێت، بەڵام جەنابی حاجی بە گەورەیی خۆیان بۆم دەشێلن، ئازارەکەی نامێنێت. چی بکەین، دەردی پیرییە، ئەی نەیانگوتووە پیری و هەزار دەرد.

ـ پووریّ گیان، خوا سەلامەتت بکات و هەمیشە بۆ ئێمە بمێنن. پووریّ گیان؟

ـ گیانی پووریّ، بلێ.

ـ ئەوەی ڕاستی بێت سبەی ناتوانم بێمەوە، بەڵێن بانگێشتی کردووین بۆ شەکراوخوادنەوە، بۆیە ناتوانم بێمەوە.

ـ بەڕاست، پیرۆزی بێت و بەدڵی خۆش بێت، لەجیاتیی من پیرۆزبایی لێ بکە.

ـ بەسەر چاو، قوربانی ئەو پوورە نازدارەم بم، سڵاوم بگەیەنە بە حاجی.





دوای ئەوەی لە تەلەفۆنەکەم تەواو بووم لەگەڵ پوورم، ڕاستەوخۆ تەلەفۆنم کرد بۆ هاوڕێکانم، مەحوی و دکتۆر ئارام و هۆشەنگ، بڕیارمان دا سبەی هەرچوارمان پێکەوە بچین. پێم گوتن پێویست ناکات هیچکامێکتان سەیارەکەی خۆی بهێنێت، من دێم بەدواتاندا. ڕۆژی هەینی ڕۆیشتم بەدوای هاوڕێکانمدا و پێکەوە لە ماڵی دکتۆر ئارام نوێژمان بەکۆمەڵ کرد و بەڕێ کەوتین بۆ مزگەوتی مەلا قادری خۆشناو. کاتێك گەیشتین، ڕۆیشتینە ناو مزگەوتەکە، پڕی بوو لە خەڵکی، دیار بوو هەندێکیان لە خزمانی بووکە خان بوون، ئەوانی تریش خزم و دۆستی کاك بەڵێن بوون. کاتێك سەیری لای مینبەرەکەم کرد، کەسێك لەسەر کورسییەك دانیشتبوو، چاو بە بینینی ڕوون و دڵ بە بیستنی قسەکانی ئارام دەبوویەوە. جلێکی سپیی جوانی لەبەر بوو. کەسێك بوو زۆر دەمێك بوو حەزم دەکرد لە نزیکەوە بە خزمەتی بگەم، لەبەرامبەری لەسەر چۆك دابنیشم، سوود لەو زانست و زانیارییە وەربگرم کە پێی گەیشتووە، ئەو کەسێکە کە لەناومان بە شێخی وتاربێژان ناسراوە، من تا ئێستا کوردێك یان مامۆستایەکم نەبینیوە لەو زمانپاراوتر و ڕەوانبێژتر بێت، ئەو کەسە دکتۆر سید احمد پێنجوێنی بوو. بەڵێنیش لە دەستەچەپی ئەو لەسەر زەوییەکە دانیشتبوو، قاتێکی جوانی کوردیی خاکیی لەبەر کردبوو. دوای ئەوە ئێمە لە گۆشەیەکی مزگەوتەکە دانیشتین، دکتۆر سید احمد دەستی کرد بە وتاردان و گوتی: مزگەوت پێش ئەوەی شوێنی شیوەن بێت،

شوێنی شادییە، هۆڵی پرسە دەبووایە ناوی هۆڵی بۆنەکان بایە، لەجیاتیی ئەوەی خەڵکی بڕوات و هۆڵێك بگرێت بە پارەیەکی زۆر و لەجیاتیی ئەوەی سەرەتای ژیانیان بەخێر دەست پێ بکەن، بە شەڕ و دژایەتیی خوا دەست پێ دەکەن، شتانێك دەکەن کە خوا حەز بە کردنی ناکات. پاش ئەوەی لە وتارەکەی تەواو بوو، لەگەڵ کاك بەڵێن ڕۆیشتن بۆ ماڵی بووکە خان بۆ ئەوەی مارەکردنەکە ئەنجام بدەن. پاش ئەوەی مارەبڕینەکە ئەنجام درا، لە باخچەی پێش ماڵی بووکە خان وێنەیەکی بەکۆمەڵمان گرت لەگەڵ کاك بەڵێن و بووکە خان، پاشان ڕۆیشتین، ئێمە بۆ بازار بۆ لای قەڵا، لەوێ بە هاوڕێکانم گوت:

ــ شتێکتان پێ دەڵێم نەیکەنە هاتوهاوار.

مەحوی گوتی: جارێ تۆ بیڵێ، پاشانیش ئێمە بڕیار لەسەر ئەوە دەدەین.

ــ ها ئەو ڕۆژەی چووین بۆ فێلاو.

هۆشەنگ: ئێ.

منیش وتم: دە کاکە ڕاوەستە با ئەمن قسەی خۆم تەواو بکەم.

هۆشەنگ: باشە.

منیش وتم: پێش ئەوەی من بڕۆم سێ کچ هاتن.





دکتۆر ئارام: ئێ.

منیش وەڵامم دایەوە: بە خوا ئاوا بکەن قسەتان بۆ ناکەم، کاکە واز بێنن. ئەسڵەن ئەمن هەڵەم کرد دەردەدڵ و قسە بۆ ئێوە بکەم.

مەحوی گوتی: کاکە بەڵێن بێت ئەو جارە هیچ نەڵێین.

منیش بەردەوام بووم و گوتم: هەر ئەو سێ کچە ئێوارە، کاتێك گەڕامەوە بۆ هەولێر، بینینم سەیارەکەیان خۆی کێشابوو بە گردەکەی تەنیش جادەکە، دوای ئەوە داوای یارمەتییان لە من کرد.

پاش ئەوە هەموو ڕووداوەکەم بۆ هاوڕێکانم باس کرد.

مەحوی گوتی: ئەوە بۆیە دەڵێم موحسین ماوەیەکە ئاگای لە ئێمە نەماوە، ئەوە هۆکارەکەیەتی.

منیش گوتم: نا بابە، وای لێ مەکەن.

هۆشەنگ گوتی: خارە جا ئێستا ئەوە کەی تەلەفۆن دەکات، ئێمەش بێین لەگەڵت.

منیش گوتم: چی دەڵێیت.

گوتی: هەر ئەوەی کە بیستت.

دوای ئەوە پێکەوە دەستمان کرد بە پێکەنین.

دکتۆر ئارام گوتی: بەڕاستی هەر ئەو کارە جوانانە لە جوامێری وەکوو ئێوە چاوەڕێ دەکرێت، بەڵام من داوایەکی برایانەم هەیە






لە تۆ، هەر چەندە لەوە زۆریش دڵنیام تۆ زۆر لەوە هۆشیارتری بکەویتە داوی ئەو جۆرە کەسانە، بەڵام هەر ئاگاداری خۆشت بیت باشە، هەوڵ مەدە زۆر لێت نزیك بکەونەوە یان لێیان نزیك بکەویتەوە. هەندێك شتە هەیە وەکوو لیتاوێك وایە، هەر ئەوەندەی خۆشە تاوەکوو دەکەویتە ناوی، بەڵام دوای ئەوە بە هەرچوار پەلت هەوڵ دەدەیت لێی بێیتە دەرەوە، ناتوانی، بگرە تاوەکوو هەوڵی زیاتر بدەیت، زیاتر نوقم دەبیت.

منیش گوتم: سوپاست دەکەم، بەڵام شتەکە هێندە گەورە مەکەن، دەعوەتەکە تەنها بۆ سوپاسکردنە و تەواو، باوەڕ ناکەم دوای ئەوە شتێك بمێنێت یان هۆکارێك هەبێت بۆ بینینەوەیان.

پاشان لەگەڵ هاوڕێیانم تا درەنگ لە دەرەوە بووین، پاش ئەوەی نانی ئێوارەمان خوارد و پاشان گشتیانم گەیاندەوە بۆ ماڵەکانی خۆیان، بۆخۆشم ڕۆیشتمە بۆ کۆمپانیا. شەو هەرچەندە تۆزێك درەنگی کردبوو، بەڵام تەلەفۆنەکەم بە دەستەوە گرت و تەلەفۆنێکم کرد بۆ پوورم و ویستم لە تەندروستیی ئاگادار بم، سوپاس بۆ خوا پوورم ساتبەسات باشتر دەبوو، منیش دوای دڵنیایی لە تەندروستیی ئەو و پرسیارکردن لە تەندروستیی حاجیی مێردی، مۆبایلەکەم خستە سەر شەحن و لێی نوستم.

هەواڵێك هەیە هیچکامێکمان حەز ناکەین بیبیستین، دیمەنێك هەیە حەز ناکەین بیبینین، شوێنێك هەیە حەز ناکەین بۆی بڕۆین،





بەڵام هەم هەواڵەکە دەبیستین و هەم دیمەنەکەش دەبینین و هەم هەنگاویش دەهاوێژین بۆ شوێنەکە. ئەویش بیستنی هەواڵی مەرگی ئازیزانە، دیمەنی ساردوسڕی جەستەی بێگیانیانە، هەنگاونان و ڕۆیشتنە بەدوای تەرمەکەیان بۆ گۆڕستان.

زەنگی مۆبایلەکەم لێدەدات، تەماشا دەکەم سەعات حەوتە و ژمارەکەش نەناسراوە، دەست دەنێم بە دوگمەی وەڵامدانەوە:

ـ بەڵێ.

ـ باشیت موحسین، مام قادرم، قادری جیرانتان، خێرا وەرەوە بۆ چۆمان.

ـ چی بووە، پوورم شتێکی لێ هاتووە.

ـ نا هیچ نەبووە، بەس بێیتەوە باشترە.

ـ مام قادر، توو خوا پێم بڵێ پوورم شتێکی لێ هاتووە.

ـ کوڕم ئارامت هەبێت، پێت دەڵێم بەس تۆزێك هێور بەرەوە، گوێ بگرە کوڕم، پوورت ڕۆیشت بەو ڕێگایەی لەپێش هەموومانە، دڵنیا بە ئێمەش دەمرین، مردنی ئازیزانیش تاقیکردنەوەیە بۆ کەسانی دوای خۆیان، تۆش سەبر بگرە، دڵنیا بە خوا پاداشتی ئارامگران ون ناکات.

خۆم ڕاناگرم بە پێوە، مۆبایلەکەم لە دەستم دەکەوێتە خوار.

مام قادر: ئەلوو، ئەلووو، موحسین، ئەلووو.

دواتر مۆبایلەکەی داخستەوە، نزیکەی نیو کاتژمێر بوو نەمدەتوانی تەنانەت بشجوولێم، پاشان تۆزێك خۆم کۆ کردەوە و فرمێسکەکانم سڕین و مۆبایلەکەم هەڵگرتەوە، پەیوەندیم کرد بە مەحوییەوە، پێم گوت کە پوورم مردووە، ناتوانم سەیارەکەم لێبخوڕم، گەر بتوانی بمگەیەنیتەوە ماڵ سوپاست دەکەم، نیوسەعات شتێکی زیاتری ویست تاوەکوو مەحوی و دکتۆر ئارام و بەڵێن و هۆشەنگ بە سەیارەکەی مەحوی گەیشتنە بەر دەرکی کۆمپانیا. کاتێك دابەزین، بەگریانەوە بەرەو ڕووم هاتن، منیان لە باوەش گرت و پێیان دەگوتم ئارام ببمەوە. دوای ئەوە هۆشەنگ سەیارەکەی مەحویی لێخوڕی و بەڵێنیشی لەگەڵ سەر کەوت، مەحوی و دکتۆر ئارامیش لەگەڵ من بوون. لە ڕێگا مەحوی و دکتۆر ئارام هەموو شتێکیان دەکرد، هەموو قسەیەکیان دەکرد تەنها لە پێناو ئەوەی من نەگریم، جارجار ئەوانیش نەیاندەتوانی خۆیان بگرن و فرمێسك چاوانی پڕ دەکردن. کاتێك گەیشتینەوە، تازە تەرمی پوورمیان لە نەخۆشخانە دەهێنایەوە، بردیان بەرەو مزگەوت بۆ ئەوەی بیشۆن، مێردی پوورم لە مزگەوت لەتەنیشت مامۆستای مزگەوت دانیشتبوو، هەوڵی دەدا نەگریت، بەڵام کاتێك منی بینی کە دەگریم، نەیتوانی خۆی بگرێت و دەستی کرد بە گریان، یەکتریان توند توند لەباوەش گرت، دەستیان لەناو دەستی یەکتریدا بوو تاوەکوو تەرمەکەیان شۆرد، پاشان هێنایانە ناو مزگەوت و نوێژمان لەسەر کرد و بەڕێ کەوتین بەرەو گۆڕستان،

دوای ئەوەی تەرمەکەمان شاردەوە، مامۆستای مزگەوت لەسەر گۆڕی بووەرم وتارێکی کورتی دا بۆ ئامادەبووان، وتی:

ـ خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ﴾ دەبێت هەمووومان تاڵاوی مردن بچێژین. ئازیزان، ئێمە ڕۆژانە ئازیزانمان دەهێنین بۆ ئێرە، پاشان دەڕۆین و پاش ماوەیەك لەبیریان دەكەین، بەختەوەر ئەو كەسەیە كە خۆی لەبیر نەكات، لەبیری نەكات بۆچی هاتۆتە بوون، ئێمە وا دەزانین كەسەكە مرد و تەواو، لە كاتێكدا گەشتی ڕاستەقینە لەمەودوا دەست پێ دەكات، تا ئێرە تۆ بوویت بڕیارت دەدا چی بكەی و چی نەكەیت، بەڵام لەمەودوا كارەكانت بڕیار دەدەن چیت بۆ دەكەن و چیت بۆ ناكەن، خوا بە گەورەیی خۆی ئەم مردووە و ئێمەش بخاتە بەر بەخشندەیی خۆی.

دوای ئەوەی مامۆستا وتارەكەی تەواو كرد، گۆڕستانمان جێ هێشت و بەرەو مزگەوت ڕۆیشتینەوە، خەڵكی زۆر دەهاتن بۆ پرسە و سەرەخۆشی، هاوڕێكانیشم هەمیشە لە نزیكی من بوون، زووزوو دەیانگوت هیچت ناوێت. هاوڕێكانم هەموو كار و شتێكی خۆیان واز لێ هێنابوو و لەگەڵ من هاتبوون، تەنانەت بەڵێنیش كە دوێنێ ژنمارەكردنی بوو، وازی لە هەموو كارێكی هێنابوو و هاتبوو. حاجی كەمالیش لەگەڵ كۆمەڵێك لە كارمەندی كۆمپانیا هاتبوو، دكتۆر ئیدریسیش هاتبوو.

دەزانی چەند گرنگە كە ئازیزێكت دەمرێت، كۆمەڵە كەسانێك هەبن دڵت بدەنەوە، كەسانێك ڕێگری بكەن لە فرمێسكەكانت، ئەمن

وا بووم، نازانم خەڵکی تریش چۆنن، هەرکاتێک کەسێک دەهات بۆ سەرەخۆشیکردن و دڵدانەوەم، کاتێک دەڕۆیی وا هەستم دەکرد بەشێکی ئازار و خەمەکانم لەگەڵ خۆی دەبات. ئاخر زۆر قورسە ئازیزێکت بمرێت و سەیری چواردەورت بکەیت کەسێک نەبێت دڵت بداتەوە و بتلاوێنێتەوە. بگریت و کەسێک نەبێت پێت بڵێت مەگری.

دوو ڕۆژ زۆر بەقورسی ڕۆیشت، هاوڕێکانم بانگ کرد و پێم وتن بەڕاستی نازانم چۆن سوپاستان بکەم، ڕاستی حەز ناکەم بڕۆن، بەڵام دەزانم وازتان لە ئیش و کار و ماڵ و منداڵتان هێناوە و ئەو دوو ڕۆژە لای من بوون، خوا بیکاتە توێشووی قیامەت بۆتان إن شاء الله.

مەحوی گوتی: ئەو قسانە مەکە براکەم، هاوڕێیەتییەک بۆ ڕۆژێکی ئەوا نەبێت، هەر نەبێت باشترە.

دوای ئەوە هاوڕێکانم ڕۆیشتن بۆ لای مێردی پوورم و سەرەخۆشی کۆتاییان لێ کرد و ڕۆیشتن، من و مێردی پوورم ماینەوە، خزمەکانی مێردی پووریشم مابوون، میوانەکان کەم بووبوون، جارجارە گەر کەسێک دەر کەوتبایە. دە ڕۆژ زۆر بەقورسی تێپەڕی، کە تەماشای مێردی پوورم دەکرد، وا هەستم دەکرد ئەو دە ڕۆژە بە جۆرێک گۆڕابوو، باوەڕت نەدەکرد ئەوە ئەو کەسەی پێشتر بێت.

ئێوارەی ڕۆژی دەیەم، کە دەیکردە دووشەممە، سێ-چوارێک لە ڕیشسپی و خزمانی مێردی پوورم هاتن بۆ ماڵمان، مام خدر، کە





مامی مێردی پوورم بوو، ڕووی کردە من و گوتی: کوڕم دەزانم دڵتان بریندارە و خەفەتبارن، بەڵام شتێك هەیە ئەمە لەگەڵ خزمان باسمان کردووە و پێمان باش نییە ئەو ماڵە لەوەی زیاتر بێژن بێت، بۆیە دەمانەوێت ژنێکی بۆ (حاجی صاڵح)ی بێنین، مێردی پوورم ناوی (صاڵح) بوو، پاش ئەوەی چوون بۆ حەج لەگەڵ پوورم، پێیان دەگوت حاجی صاڵح.

منیش ڕووم کردە مام خدر و پێم گوت: مامە ئێوە گەورە و ڕیشسپیی ئێمەن، چۆنتان پێ باشە ئەوە بکەن.

مام خدریش زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: هەر ئەوەم لێ چاوەڕێ دەکردی کوڕی خۆم.

دواتر بەردەوام بوو، گوتی: ماڵێ ڕەزای ئامۆزام، کچێکیان هەیە ناوی (زەینەب)ە، کچێکی جوانی بەڕەوشتە، تا ئێستا دیارە قسمەت نەبووە مێردی بکات، بۆیە تەمەنی نزیکە لە حاجی صاڵحی و پێم وا بێت بۆ یەکتری زۆر گونجاون، پێشتر قسەمان لەگەڵ کردووە، ئەویش ڕازی بووە. بۆیە تا زووتر ئەو ئیشە خێرە بکرێت باشترە، قەرەباڵغیی ناوێت و دوو-سێ پیاو لەگەڵ حاجی صاڵح و مامۆستا دەنێرین بۆ ئەوەی مارەی بکەن و حاجی صالحیش دەستی بگرێت و بیهێنێتەوە بۆ ماڵێ، بۆ ئەوەی چیتر ئەو ماڵە بێ ژن نەبێت. ماڵی بێ ژن وەکوو ماڵی بێ ڕووناکی وایە.

دوای ئەوە ئەوان ڕۆیشتن، مێردی پوورم ڕووی کردە من و گوتی:

ـ کوڕم موحسین، گوێ بگرە با شتێکت پێ بڵێم. شتێکە کە تا ئێستا تەنها خوا و من و کەسێکی تر دەیزانین.

منیش گوتم: فەرموو حاجی گیان، گوێم بۆ ڕاگرتوویت.

حاجی بەردەوام بوو و گوتی: باوکی من کە (حاجی محمد)ی ناو بوو لەگەڵ باپیری تۆ کە ناوی (ڕەسوڵ) بوو، پێکەوە هاوڕێ بوون، هاوڕێی گیانیبەگیانی، تەنانەت ئامادە بوون لەسەر یەکتری خۆشیان بە کوشتن بدەن، بۆ ئەوەی ئەو هاوڕێیەتییەیان هەر وا بەهێزی بمێنێت و بگرە بەهێزتری بکەن، باوکم داوای لە باپیرت کردبوو کە کچە گەورەی خۆی کە ناوی (شیرین بوو) بداتە من. پوورت واتا (شیرین) کچێکی خرپنی باڵا مامناوەندی جوان بوو، باپیریشت بێ ئەوەی پرسێك بە (شیرین) بکات ڕزای بووبوو بە داواکاریەکەی باوکم. باپیرت ڕۆیشتبوویەوە بۆ ماڵ و بە داپیرەت و شیرینی وتبوو، خۆتان ئامادە بکەن ڕەنگە ئەمشەو یا سبەی ماڵی حاجی محمدی بێنە داخوازیی شیرینی بۆ صاڵحی کوڕیان، ئەمن بەو داواکارییەی ڕازی بووم و حەزیش ناکەم کەس بەرهەڵستیی ئیشەکەم بکات، داپیرەت ڕووی کردبوویە باپیرت و پێ گوتبوو: دەزانم ئێوە لەگەڵ حاجی محمد دوو هاوڕێی زۆر نزیکی یەکترن، بەس نەدەبوو پرسێك بکەی بە کچەکەشت ئینجا ئەو کارەت





کردبایە، باپیرت بە داپیرەتی گوتبوو: ئەمن کچی خۆم دەناسم، ئەمن چ بڵێم ئەو ناڵێت نا. ئیتر پووریشت زانیبووی قسەکردن بێسوودە، ڕازی بووبوو. ئەوە بوو ئێمە سبەی پاش نیوەڕۆکەی هاتین بۆ ماڵی باپیرت و مارەبڕینەکەمان کرد و ئەو کات وا بوو، هەر ئەو کات ژنیان بە سواری وڵاخێك دەهێنا بۆ ماڵی زاوا. پوورت کچێکی فەقیر بوو، چییان پێ بوتبایە جێبەجێی دەکرد، زۆر قسەی نەدەکرد، بەو شێوەیە ژیانی هاوسەرگیرمان دەست پێ کرد، ڕاستی سەرەتا مامەڵەی من لەگەڵ پوورت باش نەبوو، چوونکە فێر نەبووبووم مامەڵەیەکی دروست بکەم لەگەڵ ژنان، بەڵام وردەوردە خوا یارمەتیی دام و توانیم خۆم لە دڵی پوورت شیرین بکەم و ژیانێکی ئارام بژین، ساڵێك بەسەر هاوسەرگیرماندا ڕۆیشت و هیچ هەواڵێك نەبوو لە منداڵبوون، خزمەکان و هەندێك جار ماڵیشمان دەیانگوت ئەوە بۆ هیچ دیار نییە، تا ئەوە بوو باوکم کۆچی دوایی کرد، باپیرت بە کۆچی باوکم زۆر خەفەتبار بوو، ڕەنگە هەر ئەوەش هۆکار بووبێت کە نەیتوانیبێت لە دووریی هاورێکەی زۆر ئارام بگرێت، دوای شەش-حەوت مانگ ئەویش کۆچی دوایی کرد، بە هۆی مردنی باوکم و باپیرتەوە، ماوەیەك کەس باسی ئەوەی نەدەکرد بۆچی منداڵتان نابێت، بەڵام پاش ماوەیەك دووبارە پرسیارەکان دەستیان پێ کردەوە، هەندێکیان دەیانگوت دەبێت کێشە لە کامیان بێت، هەندێکی تریش دەیانگوت صاڵح بۆچی ژنێکی تر ناهێنی. ڕاستی ئەوەندەی پرسیارەکانی ئەوان

ئازاریان دەدام، منداڵنەبوونەکەمان ئازاری نەدەدام، هەرچۆنێك بێت دوو ساڵ و نیومان بەو شێوەیە بەڕێ کرد، تا ئەوە بوو یەکێك لە برادەرەکانی براکەم ڕۆژێکیان گوتی: صاڵح وا نابێت، بۆ ناچی بۆ شار لەگەڵ خێزانت، سەردانێکی دکتۆر بکەن بزانن کێشە لە کامتانە، ئەوە بوو چەند جارێك لەگەڵ شیرین ڕۆیشتین، تا ئەوە بوو ڕۆژێکیان دکتۆرەکە بانگی کردم و گوتی: کاك صاڵح، بە گوێرەی هەموو ئەو پشکنینانە بێت کە ئێمە بۆ تۆ و خێزانەکەتمان کرد، پشکنینەکان وا دەری دەخەن کە گرفتەکە لە خێزانتە و ئێوە هیچ کێشەیەکتان نییە. سەرەتا کە دکتۆر ئەو قسانەی کرد، ڕاستی دڵم خۆش بوو کە زانیم گرفتەکە لە من نییە، بەڵام دواتر بیرم لە شیرین کردەوە، بیرم لەوە کردەوە گەر بێت و خزمەکانم و ماڵیان بزانن، ناهێڵن بگاتە سبەی کچێکی ترم بۆ دەدۆزنەوە و پێم دەڵێن دەبێت ژنی دووەم بهێنی، بیرم لەوە کردەوە شیرین چەند دڵبەخەمە بە هۆی مردنی باوکیەوە، گەر ئێستا بزانێت کە کێشەکە لەوە و من ژنێکی تری بەسەر دەهێنم، دەبێت چەندە ڕقی لە من و لە باوکی بێت. بەڵام گەر بڵێم کێشەکە لە منە، ئەو کات بۆ هەمیشە دەمی ماڵیان و خزمەکانیشم دەبەستم، نە چیتر باسی منداڵبوون دەکەن و نە چیتر باسی ژنهێنان دەکەن، ڕاستی بڕیاری دووەم بۆ من زۆر قورس بوو، بەڵام هەموو بیرم لای ئەوە بوو چۆن دڵی شیرین ڕابگرم و ئازاری نەدەم. بۆیە بە دکتۆرەکەم گوت: تکایە بەڵێنم پێ بدە کە هیچکەسێك و شیرین بەتایبەتی نەزانێت کە کێشەکە لە ئەوەوەیە، دوای ئەوە هاتمە دەرەوە لای دکتۆرەکە.





شیرین گوتی: چی بوو؟

منیش گوتم: هیچشتێك.

شیرین گوتی: چۆن دەبێت، پاش ئەو هەموو پشکنینە، هیچ شتێك دەر نەکەوتبێت.

منیش گوتم: بۆ هێندە بەلاتەوە گرنگە ئەنجامی پشکنینەکان.

شیرین ڕووی کردە من و گوتی: بۆچی، تۆ بەلاتەوە گرنگ نییە؟!

گوتم: نەخێر.

شیرین بەسەرسامییەوە گوتی: مادام بەلاتەوە گرنگ نەبوو، بۆچی هاتی.

وەڵامم دایەوە: نازنم. دواتر گوتم: شتێك بڵێم؟

شیرین وەستا لە ڕۆیشتن و گوتی: دەتەوێ چی بڵێیت؟

وڵامم دایەوە: پشکنینەکان دەریان خستووە کێشەکە لە منەوەیە، واتا منم هۆکاری منداڵنەبوونمانم.

شیرین کە ئەو قسەیەی گوێ لێ بوو، بزەیەکی کرد گوتی: صاڵح، نازانم تۆ چۆن تێم دەگەیت، بەڵام دەزانی خۆشحاڵم بەوە، من دڵنیام لە خۆم کە بەتەنها جێت ناهێڵم، بەڵام دڵنیا نیم لەوەی ئاخۆ تۆ بەتەنها بەجێم دەهێڵی یا نا. دڵنیا نیم لەوەی بڕۆیت و ژنێکی تر بهێنی و ئەو کات لەبەر ئەو من لەبیر بکەیت.

کاتێک ئەو قسانەم لە شیرین بیست، زانیم چەندی خۆش دەوێم، بۆیە دڵخۆش بووم بەوەی کە پێم گوت کێشەکە لە منەوەیە لەلای ئەو، کاتێک گەیشتینەوە گوندیش، وام بە خزمان گوت کە کێشەکە لە منەوەیە، ئەوانیش تا ئەمڕۆی لەگەڵدا بێت بەلای ئەو بابەتەدا نەچوونەوە، هۆکارێکی تریش کە وای لێ کردم زیاتر دڵخۆش بم بە بڕیارەکەم، هاتنی تۆ بوو بۆ ناو ماڵمان، بەڕاستی هاتنی تۆ نوێبوونەوەیەک بوو بۆ ژیانمان، ماڵی ئێمەت پڕ کرد لە خێر و خۆشی.

قسەکانی حاجی صاڵح منیان تووشی سەرسووڕمان کردبوو، بە خۆم دەگوت: دەبێت حاجی هێندە پوورمی خۆش ویستبێت کە تەنها لەبەر دڵی ئەو ناچار بووە ئەو هەموو ساڵە ئەو نهێنییە نەدرکێنێت، ئایە دەکرێت ئەوەندە دڵی پوورمی بەلاوە مەبەست بووبێت کە ناچار بووە تەمەنێک خۆی لە نازی باوکایەتی بێبەش بکات، خۆی لە یەکێک لە جوانترین و خۆشترین وشەکانی ئەو دونیایە بێبەش بکات کە ئەویش وشەی (بابە)یە! هەر دواتر خۆم بە خۆم دەگوت دەکرێت ئەو چیرۆکەی تەنها بیانوویەک بێت بۆ ئەوەی زوو بڕوات و ژنێکی تر بهێنێت، بۆ ئەوەی دوایی من گومانم لە دڵسۆزی و خۆشەویستیی ئەو نەبێت بۆ پوورم.

کاتێک خۆر هەڵهات، دونیا جۆرێکی تری لێ هاتبوو، ماڵ گۆڕابوو، هەر دەتگوت کەسێک لێرە نەمردووە، خزمانی حاجی صاڵح ئامادەکارییان دەکرد و شێویان لێدەنا بۆ ژنهینانەکەی حاجی

صاڵح، پاشنیوەڕۆ حاجی صاڵح بە خۆی و ژنە تازەکەی هاتنەوە ماڵ. ئیتر دڵنیا بوومەوە کە جێگایەك نەماوە بۆ من لەو ماڵەدا، بۆیە پاش عەسر ڕۆیشتم بۆ لای حاجی صاڵح و پێم گوت:

ـ حاجی گیان، من دەبێت بڕۆمەوە بۆ هەولێر، دڵنیام ئیش و کاری زۆر چاوەڕێمە لە کۆمپانیا. ڕاستی دەمەوێت زۆر سوپاست بکەم بۆ هەموو ئەو ساڵانەی کە وەکوو کوڕی خۆت مامەڵەت لەگەڵ من کرد و منت پەروەردە کرد، گەر مۆڵەت بدەن، دەمەوێت شتەکانم بەیەکجاری کۆ بکەمەوە و بڕۆم بۆ هەولێر.

حاجی صاڵح گوتی: ئەوە چی دەڵێت کوڕم، ڕۆیشتنی چی، تۆ تازە بەشێکی لەو ماڵە و لە من، دڵنیا بە بۆ هیچ شوێنێك ناڕۆیت، دڵنیام ئەو قسانە بەس لەبەر ئەوە دەکەیت کە ژنێکی تر لەجیاتیی پوورت لەو ماڵەدایە، بەس دڵنیات دەکەمەوە (زەینەب)یش وەکوو پوورت ژنێکی باشە.

منیش وەڵامم دایەوە: گومانم لە باشیی خاتوو زەینەب نییە، إن شاء الله بەختەوەر دەبن پێکەوە، بەڵام من خۆم وا حەز دەکەم و وا ئاسوودەترم.

حاجی صاڵحیش گوتی: چۆن ئاسوودەیت و بە چ شتێك ئاسوودەیت، ئەوە بکە.

دوای ئەوەی شتەکانم کۆ کردەوە و خستمە ناو سەیارەکەم، حاجی صاڵح بەرەو لام هات و گوتی: بگرە کوڕم، ئەوە ئەو پارانەیە کە لەو چەند ساڵەی ئیشکردنت پەیدات کردووە، گەر شتێکمان لێ خەرج کردبێت، گەردنمان ئازاد بکە.

زۆر هەوڵم دا بڕێك لەو پارەیە بگێڕێتەوە، بەڵام گوتی: پێویستیم بە پارە نییە، گەر پێویستیشم پێ بوو، زەوی و موڵکمان زۆرە، هەندێك دەفرۆشم.

دوای یەکترلەئامێزگرتن، ماڵئاوایی‌یم لە حاجی صاڵح و خاتوو زەینەبی خێزانی کرد.

بەڕێ کەوتم بەرەو هەولێر، وەك هەمیشە هاوڕێی سەفەری تەنهاییم بیرکردنەوە بوو، بیرکردنەوە لە پوورم و مێردی پوورم، دەبێت پوورم هەستی چۆن بووبێت پاش ئەوەی وای زانیوە کە هۆکاری منداڵنەبوونیان مێردەکەیەتی، لە کاتێکدا کێشەکە لە ئەودا بووە، باوەڕم وایە وای زانیوە قوربانییەکی گەورەی داوە بەوەی کە لەگەڵ حاجی صاڵح بمێنێتەوە و ڕزای بێت ماڵەکەی خاڵی بێت لە دەنگی منداڵ و خۆشەویستیی مێردەکەی بەسیەتی. دەبێت چەند کەسمان هەبێت وەکوو پوورم بیر بکاتەوە، وا بزانێت شتێکی گەورەی کردەووە، لە پێناو ئەوانی تر قوربانییەکی گەورەی بە خۆی داوە لە پێناو مانەوە لەگەڵ ئەوانی تر، لە کاتێکدا ئەوانی ترن کە خۆیان کردۆتە قوربانی لە پێناو ئێمە و پارێزگاریکردن لە ئێمە.

زەنگی مۆبایلەکەم منی دەرهێنا لەو بیرکردنەوانە، کاتێك تەماشای مۆبایلەکەم کرد بینیم وا نوری کچی حاجی کەماله تەلەفۆن دەکات، وەڵامم دایەوە:

ـ بەڵێ.

ـ السلام علیکم، باشیت ئەندازیار، تەندروستیان چۆنە، هیوادارم باش بن.

ـ زۆر سوپاس، ئێوە چۆنن، حاجی کەمالی باوکتان و حاجی سەبیعە خاتوونی دایکتان چۆنن؟

ـ الحمدالله هەموومان باشین، زۆر سوپاس.

ـ فەرموون، ئیشێك، کارێکتان هەبوو.

ـ ڕاستی هەر حەزم کرد ئاگاداری تەندروستیان بم و بزانم چۆنن. ئەوە دایکیشم لەلام دانیشتووە، سڵاوی هەیە بۆتان.

ـ گەورەییتان نواند، زۆر سوپاسی ئەحواڵپرسینەکەتان دەکەم. سوپاس بۆ خوا باشم، وا خەریکە بەرەو هەولێر دەگەڕێمەوە.

ـ دێنەوە بۆ هەولێر.

ـ بەڵێ.

ـ دایکم دەڵێت دەبێت بۆ ئێوارە بێتە ماڵی ئێمە.

ـ سوپاسی دایکتان دەکەم و ڕێز و سڵاوم هەیە بۆیان، بەڵام نابمە ئەرك بەسەرتانەوە.

دیار بوو نور مۆبایلەکەی دابوو بە دایکی و دایکی وتی:

ـ باشیت کوڕی خۆم، ئەرکی چی، ئەو قسانە جارێکی تر لەگەڵ ئێمە مەکە، بۆ ئێوارە چاوەڕوانتین.

ـ هەرشتێك ئێوە بیڵێن.

دوای ئەوەی پەیوەندییەکە تەواو بوو، تۆزێك خێرایی سەیارەکەم زیاد کرد بۆ ئەوەی بتوانم نیوکاتژمێرێك پێش مەغریب بگەمەوە بۆ کۆمپانیا و ئاوێك بکەم بە خۆمدا و بە جلێکی ترەوە بڕۆم بۆ ماڵی حاجی کەمال. کاتێك گەیشتمەوە بۆ کۆمپانیا، هەموو ئەوانەی لەوێ دەمانەوە، هاتن بۆ لام بۆ بەخێرهاتنەوە و دوعایان دەکرد بۆ پوورم، منیش دوای ئەوای لەگەڵ یەکەبەیەکەی ئەوان قسەم کرد و سوپاسم کردن، ڕۆیشتمە ژوورەکەم، پاش نیوکاتژمێر هەر لە کۆمپانیا نوێژی مەغریبم کرد و بەرەو ماڵی حاجی کەمال بەڕێ کەوتم. پاش بیست خولەك دەگەمە بەردەمی ماڵی حاجی کەمال، زەنگەکە لێدەدەم، نور دێت دەرگاکە دەکاتەوە، لچکێکی ڕەشی پۆشیوە، چەند جوان ڕەشی لێ دەهات، ڕوخساری دەتگوت مانگی چواردەیە لەنێو هەورە تاریکەکاندا لە جێگایەکەوە سەری دەر هێناوە و دەدرەوشێتەوە، بە زەردەخەنەیەکەوە پێم دەڵێت:

ـ فەرموون.





باشیت ئەندازیار.

ـ السلام علیکم، باشیت ئەندازیار.

ـ وعلیکم السلام، بەخێر بێنەوە ئەندازیار، چۆنن باشن.

ـ زۆر سوپاس.

ـ فەرموون لێرەوە.

ماڵی حاجی کەمال حەوشێکی گەورەیان هەبوو، ئەم ئێوارەیە بڕیاریان دابوو لەناو باخچەی حەوشەکەیان نان بخۆین، وا دەگەینە ناو باخچەکە، حاجی کەمال و خێزانی لەدەوری مێزێکی نانخواردنی بازنەیی دانیشتبوون، کاتێك گەیشتم، هەردووکیان هەڵستانە سەر پێ و حاجی دەستی هێنا بۆ تەوقەکردن و گوتی:

ـ بەخێر بێیتەوە ئەندازیار، بۆخۆتان خۆش بن، إن شاء الله ئەمە کۆتا خەمتانە.

منیش وەڵامم دایەوە: زۆر سوپاس، حاجی گیان، خوا ئێوەش بەدوور بگرێت لە خەم و خەفەت.

دواتر حاجی سەبیعەی خێزانی گوتی:

ـ خوا لە پوورتان خۆش ببێت و جێگای بەهەشت بێت، ببورە کە نەمانتوانی لەگەڵ حاجی بێین بۆ پرسەکە.

ـ زۆر سوپاس بۆ ئێوەش، ئەو دوعایانەت هەموو شتێکن، خوا لێتانی قبوڵ بکات.

دوای ئەوە دانیشتین و دەستمان کرد بە نانخواردن، بەدەم نانخواردنەوە باسی ئەوەم بۆ کردن کە مێردی پوورم ژنێکی تری هێناوە و منیش کەلوپەلەکانی خۆم بەیەکجاری هێناوەتەوە بۆ هەولێر و لەمەودوا نیازم وایە بەیەکجاری لە هەولێر بژیم.

حاجی کەمال، پاش ئەوەی گوێی گرت بۆ هەموو قسەکانی من، بە پارچە قوماشە سپییەکەی سەر مێزەکە دەم و لووتی خۆی پاك کردەوە و گوتی:

ـ دڵنیام بڕیاری ژنهێنانەوە و ئەوهاش زوو بۆ مێردی پوورت شتێکی قورس بووە، بەڵام هەم بۆ ئەو و هەمیش بۆ تۆ ئەوها باشتر بوو و ئەویش تۆزێك بەساڵدا چووە، ژنێك باشتر دەتوانێت ئاگاداری بێت، هیوادارم لەمەودوا تۆش بیرێك لە خۆت بکەیتەوە، تۆش لەمەودوا پێویستە خەمێك لە خۆت بخۆیت و هاوسەرگیری بکەیت، هەرکاتێك کچێکی باشت دۆزییەوە، ئاگادارم بکەوە من خۆم بۆت دەچمە داخوازی.

منش وەڵامم دایەوە: زۆر سوپاس حاجی گیان، ئەوەشیان لە گەورەیی خۆتانەوەیە، إن شاء الله هەرشتێك هەبوو، ئاگادارت دەکەمەوە.

نور دیار بوو خۆشیی دەهات لە قسەکانی باوکی، کاتێك سەرەتا حاجی باسی هاوسەرگیریی منی کرد، نور بزەیەکی کرد و کاتێك دواتر حاجی باسی ئەوەی کرد ئەگەر کچێکت دۆزییەوە





من خۆم بۆت دەچمە داوا، دیار بوو نور تۆزێك چاوەكانی بۆ یەك بردەوە، وەكوو ئەوەی بڵێت، بۆچی بۆی دەچیتە داخوازی، ئەوە نییە من هەم، نور كچێك بوو باوەڕم وایە خەونی هەموو كوڕێك بوو، هەموو سیفەتێكی جوانی و باشی لەو كچەدا بوونی هەبوو، بەڵام من بۆ ڕۆژێكیش بیرم لەوە نەكردەوە یان وا هەست بكەم ئەو بكەم بە هاوسەری خۆم، نەمویستووە ماڵی حاجی وا تێبگەن هەموو باشیی من لەگەڵ ئەوان تەنها بۆ ئەوەیە لەگەڵ كچەكەیان هاوسەرگیری بكەم.

دوای ئەوەی نانەكەمان خوارد، ڕۆیشتین بۆ سەر هەندێك كورسیی تر، كە لەدەوری حەوزی ئاوەكە دانرابوون، كاتی چاخوردنەوە بوو، حاجی كەمال گوتی:

ـ ئەندازیار، ئەو پرۆژەیەی وا خەریكە بەو نزیكانە دەر بچێت بۆ من زۆر گرنگە، گەر ئەو پرۆژەیە بۆ ئێمە بێت، كۆمپانیاكەمان دوو هێندەی تر ناوی گەورە دەبێت.

منیش چایەكم گرت بە دەستەوە و وەڵامم دایەوە: پشتیوان بە خوا پرۆژەكە بۆ ئێمە دەبێت.

تاوەكوو نزیكی سەعات نۆ لای ماڵی حاجی كەمال مامەوە، دوای ئەوەی سوپاسگوزاریی خۆم نیشان دا لەسەر ئەو بانگێشتە، خواحافیزیم لێ كردن و لە ماڵی ئەوان هاتمە دەرەوە، دوای ئەوەی سواری سەیارەكەم بووم، تەماشای كاتژمێرەكەم كرد، بینیم هێشتا

کات ماوە و دڵم حەز ناکات بچمەوە بۆ کۆمپانیا، تەلەفۆنم کرد بۆ مەحوی، دوای ئەوەی وەڵامی دایەوە و پاش ئەحواڵپرسین پێم گوت:

ـ لەماڵیت؟

ـ بۆ هاتوویتەوە بۆ هەولێر، بەڵێ، لە ماڵم.

ـ وتم گەر کەستان میوان نییە و مەجالت هەیە، حەز دەکەم سەرێکتان لێ بدەم.

ـ یا خوا بەخێر بێن، چاوەڕێتانم.

کاتێك گەیشتمە بەردەم ماڵی مەحوی، بینیم وا بەڵێن و هۆشەنگیش تازە دەگەیشتنە ماڵیان، سڵاومان لە یەکتری کرد و پێم گوتن:

ـ ئەوە ئێوە چی دەکەن لێرە.

ـ مەحوی تەلەفۆنی بۆ کردین، وتی گەر کاتتان هەیە وەرن کۆ ببینەوە، موحسین هاتۆتەوە.

کاتێك ڕۆیشتینە ژوورەوە، بینینم وا دکتۆر ئارامیش لەوێیە، ماڵی دکتۆر ئارام زۆر دوور نەبوو لە ماڵی مەحوی.

پاش ئەوەی یەکتریمان لەئامێز گرت و دانیشتین، هەموو ئەوەی لەنێوان پوورم و مێردی پوورم ڕووی دابوو بۆم باس کردن و





پێشم گوتن کە مێردی پوورم ژنێکی تری هێناوە. بەردەوام بووین لە قسەکردن تاوەکوو درەنگانێکی شەو، بەڕاستی ئەو دانیشتن و بینینەی هاوڕێکانم بۆ من زۆر گرنگ بوو، هەستێکی تری پێ دەدام، ئەوانیش هەمیشە هەوڵیان دەدا لە ڕێگەی ڕفتارەکانیان وا لە من بگەیەنن کە من بەتەنها نیم و ئێمە هەموومان یەك خێزانین.

سێ هەفتە تێپەڕیبوو بەسەر کۆتا پەیوەندیم لەگەڵ میرا، پاش ئەوە هیچ دەنگ و ڕەنگێکی نەبوو، پاش تێپەڕبوونی چوار ڕۆژی تر و بۆ ڕۆژی پێنجەم کە دەیکردە یەکشەممە، خەریك بوو کات ببێتە کاتژمێر سێ، کە مۆبایلەکەم زەنگی لێدا، کاتێك تەماشام کرد، میرا بوو.

وڵامم دایەوە: بەڵێ.

ـ باشیت ئەندازیار، میرام، خۆ دەمناسیتەوە؟

ـ بەڵێ، دەتانناسمەوە.

ـ زۆر داوای لێبوردنم هەیە، بەڕاستی نەمتوانی پەیوەندیت پێوە بکەم، چوونکە لە کوردستان نەبووم، بە گەشتێك ڕۆیشتبووم بۆ دوبەی، دوێنێ شەو گەڕامەوە، کاتێك تەماشای مۆبایلەکەم کرد، بینیم ئێوە تەلەفۆنتان کردبوو. هەر ئەو کات ویستم تەلەفۆنت بۆ بکەم، بەڵام کاتەکەی درەنگ بوو. ئەمڕۆ گەر کاتتان هەبێت، حەز دەکەم لە شوێنێك یەکتری ببینین.








ـ بەخێر بێنەوە، لە خزمەتتدام، چ شوێنێک ئێوە پێتان باشە، من دێم بۆ ئەوێ.

ـ زۆر باشە، ئێستا بە نامە شوێنەکەت بۆ دەنێرم لە وەتس ئاپەوە.

دوای ئەوە ماڵئاوایی کرد و منیش ڕۆیشتم کەلوپەلی ئیشەکەم کۆ کردنەوە و لە ژوورەکەم دام نان و دەستم کرد بە ئامادەکاری. دوای ئەوەی بانگی مەغریبی فەرموو، نوێژم کرد، دواتر ڕۆیشتم بۆ ئەو شوێنەی ئەو بە نامە بۆی ناردبووم، خواردنگەیەکی کوردەواری بوو، کاتێک چوومە ژوورە، بینیم لە گۆشەیەکەوە دانیشتووە، هەر کە منی بینی دەستێکی بەرز کردەوە، منیش ڕۆیشتم بۆ لای، جلێکی شینی ئاسمانیی پۆشیبوو، قژە ڕەشە تۆخەکەی هەموو کۆ کردبوویەوە و بەسەر شانی چەپیدا بەری دابۆوە، دوای ئەوەی سڵاوم لێ کرد، گوتی:

بەخێر بێیت، زۆر سوپاس کە بانگێشتەکەمت قبوڵ کرد، هیوادارم شوێنەکەتان بەدڵ بێت، ڕاستی خۆم زۆر ئێرەم بەدڵە، زۆر جار لەگەڵ باران و یاران دێین بۆ ئێرە.

ـ زۆر سوپاس، شوێنێکی خۆش و پاک دیارە، لە هەمووی گرنگتر ئارامیشە.

ـ ئێ ئەندازیار، تەندروستیان چۆنە، ئۆ ببورە لەبیرم چوو تەندروستیی پوورتان چۆنە ئێستا، باشترە؟



ـ سوپاس بۆ خوا خۆم باشم، بەڵام پوورم دوو هەفتە دەبێت
 کۆچی دوایی کردووە.

ـ چی؟ ئۆ نۆ، بەڕاستی شەرمەزارم، بمبورە، ڕاستی نەمزانی، گەر بمزانیبایە دڵنیا بە تەلەفۆنم بۆ دەکردی و پرسەی خۆم ئاراستە دەکردی، هیوادارم ڕوحیان ئاسوودە بێت لەناو گۆڕدا. هاوبەشی خەمتانم.

ـ کێشەیەك نییە، زۆر ئاساییە، زۆر سوپاستان دەکەم.

دوای ئەوە هەریەکێکمان داوای ئەو خواردنەی کرد کە دەمانویست، لە کاتی نانخواردنەکە لێم پرسی:

ـ ئەی ئێوە چۆنن، خاتوو باران و یاران چۆنن؟

ـ زۆر سوپاس، من زۆر باشم، ئەوانیش باشن.

ـ یەکەم جار کە تەلەفۆنت کرد، گوتت شتێك هەیە دەتەوێت پێمی بڵێیت؟

دەستی برد بۆ پەرداغەکە و قومێکی لێدا، پاشان گوتی:

ـ ئەندازیار، بیرتە ئەو ڕۆژەی کە سەیارەکەم خەراپ بووبوو، تۆش یارمەتیت داین و بە سەیارەکەی ئێوە هاتینەوە هەولێر، لەناو سەیارەکەدا پرسیارێکت لێمان کرد، کە گوتت: ئایە ئێوە ئاسوودە و دڵخۆشن؟ بیرتە ماوەیەك وەستاین ئینجا وەڵامان دایتەوە.









ـ بەڵێ، بیرمە.

ـ دەزانی ئەو ڕۆژە هیچمان وەڵامی ڕاستیمان پێ نەوتی!

ـ چۆن چۆنی؟ تێناگەم.

ـ ڕێگەم پێ بدە بۆتی باس بکەم.

ـ فەرموو.

ـ ڕاستی ماوەیەک دەبێت هیچ شتێک ئەو چێژ و خۆشییەم پێ نابەخشێت کە پێشتر پێی دەبەخشیم، هیچ چێژ نابینم لەو کارانەی دەیانکەم، گەر لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانیش وا خۆم دەر دەخەم کە خۆشحاڵم، تەنها درۆیەکە و وا فێر کراوین کە خۆمان دڵخۆش و ئاسوودە نیشان بدەین، وا نیشانی بدەین ئێمە دڵخۆشترین و بەبەختترین کەسین. بەڵام وا نییە، ئێستا من خۆم پێ بەدبەختترین کەسە، دەزانی چییە، دەڵێیت لە گۆماوێکی پیسدام، جگە لە بۆگەنیوەکەی هەست بە هیچی تر ناکەم، بەڵام کەسێک نەبووە تا ئێستا من دەستی یارمەتیی بۆ درێژ بکەم و لەو گێژاوە دەرم بهێنێت، تا ئەوە بوو ئەو ڕۆژە تۆم ناسی، کاتێک بینیم بێ ئەوەی چاوەڕێی هیچ بکەیت و هیچت پێ بدەین و بمانناسی و بتناسین یارمەتیی ئێمەت دا، شێوزای قسەکانت ئارامیی پێم ئەدا، بۆ ساتێك هەستم کرد تۆ ئەو کەسە بیت کە دەتوانی یارمەتیم بدەیت، بەڵام دواتر گومانم بۆ پەیدا بوو.





ـ لە چ شتێک؟

ـ لەوەی کە باسی ئیسلامت کرد، لەوەی کە وتت دڵخۆشی و ئاسوودەیی ڕاستەقینە لە ئایینی ئیسلامدا دەدۆزیتەوە، بەڵام پرسیارەکەی من ئەوە بوو، ئایە دەکرێت ژنێک دڵخۆش و بەختەوەر و ئاسوودە بێت لەناو دینێک کە ئەو دینە باوەڕی بە مافەکانی ژنان و ئازادیی ژنان نییە، بەزۆر پۆشاک و حیجابی بەسەردا سەپاندوون، کردوونی بە کۆیلەی پیاو، مافی چێژبینین لە ژیان و چوونەدەرەوەی لێ ستاندوون و بەزۆر لە گۆشەیەکیماڵەکەی زیندانیی کردوون و ناهێڵن بەدوای خەون و ئاواتەکانی خۆیاندا بڕۆن، ئایینێک ڕێگەی داوە بە پیاو بۆ ئەوەی حەزەکانی تێر بکات، لە یەک کاتدا لەگەڵ چەند ژنێک هاوسەرگیری بکات و ڕاببوێرێت و چێژیان لێ ببینێت، بەڵام ژن تەنها بۆی هەیە لەگەڵ یەک پیاودا بێت، ئایینێک ڕێگری بکات لەوەی کچێک مافی ئەوەی نەبێت کوڕێکی خۆش بوێت و لەگەڵی دەر بچێت و بیناسێت و بزانێت ئەو کەسە شایانی ئەوەیە ببێتە هاوسەری، ئایینێک پێی وایە شایەتیی دوو ژن بەرامبەر بە یەک پیاوە، ئایینێک لە موڵک و سامانێک کە باوک بۆ کچ و کوڕەکانی جێی هێشتووە ستەم لە کچ بکات و بە دوو خوشک ئینجا هێندەی برایەک میرات بەرن، ئایینێک ڕێز و گەورەیی پیاوی داوە بەسەر ئافرەتدا. ئایە پێم ناڵێیت و دەتوانی پێم بڵێیت چۆن ژنێک دەتوانێت لەنێو هەموو ئەو ستەمانەی دەرحەقی دەکرێت دڵخۆش و ئاسوودە بێت؟!

بزەیەکم کرد و پێم گوت:

ـ بەڵێ، دەتوانم وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەت بدەمەوە، بەڵام پێم بڵێ لەکوێ گوێت لەو قسانە بووە، لە چ شوێنێك ئەو شتانەت بینیون، هۆکار چییە سەرەڕای هەموو ئەو ناوبانگ و خۆشی و شتانەی هەتە هەست بە ئاسوودەیی ناکەیت؟ چ شتێك وای لێ کردوویت هەست بکەیت لە گۆمێکی پیسدایت؟

ـ گەر تۆ بەڵێنم پێ بدەیت بەوەی کە بتوانی وەڵامی ئەو پرسیارانەم بدەیتەوە، ئەوا منیش ئەو شتانەت پێ دەڵێم.

ـ بەڵێن بێت.

ـ یەکەم جارە کە بەڕاستی وا هەست دەکەم دەتوانم متمانە بە پیاوێك بکەم، تکایە متمانەکەم مەشکێنە، تکایە ئەوەی لێرە باسی دەکەین، با کەس نەیزانێت؟

ـ بەڵێنی ئەوەشت پێ دەدەم، بێخەم بە لەوە.

کات درەنگی کردبوو، بۆیە ڕێك کەوتین سبەی لە هەمان شوێن و لە هەمان کاتدا یەکتری ببینینەوە، دوای ئەوە ماڵئاواییمان لە یەکتری کرد و لە یەکتری جودا بووینەوە. بەڕێ کەوتم بەرەو کۆمپانیا، سبەی لەسەر کار حەزم دەکرد خێرا کات بڕوات بۆ ئەوەی دووبارە دابنیشمەوە لەگەڵ میرا، بەپەرۆش بووم بزانم چۆن ژیانێك ژیاوە. هەرچۆنێك بێت، کارەکانم تەواو کرد و چاوەڕێ بووم نوێژی





مەغریب بکەم ئینجا بڕۆم، دوای ئەوەی نوێژی مەغریبم کرد، بەڕێ کەوتم بۆ هەمان شوێن. هێشتا میرا نەهاتبوو، پاش دە خولەك ئینجا میرا دەر کەوت، دوای ئەوەی سڵاوی کرد، گوتی:

ـ ببورە ئەندازیار، درەنگ کەوتم، کارێکم هەبوو دەبووایە تەواوم کردبایە.

ـ زۆر ئاساییە، ئێ تەندروستیان چۆنە، باشن؟

ـ زۆر سوپاس، وا خەریکە لەگەڵی دەڕۆین.

ـ دوێنێ لە چ شوێنێك وەستاین؟

ـ لەو شوێنەی بڕیار بوو ئێوە وەڵامی پرسیارەکانم بدەنەوە و منیش باسی ژیانی خۆم بکەم.

ـ زۆر ڕاستە، گەر بەلاتانەوە ئاسایی بێت، حەز دەکەم سەرەتا ئێوە باسێکی ژیانی خۆتان بکەن. گەر حەزیش ناکەن، هەڵی بگرن بۆ دوای وەڵامی پرسیارەکان.

ـ هیچ کێشەیەك نییە، بەسەر چاو، من باسی ژیانی خۆمت بۆ دەکەم.

ـ چاوانت ساغ بن.

ـ زۆر سوپاس لەگەڵ چاوانی ئێوەش.

دوای ئەوە میرا دەستی کرد بە گێڕانەوەی ژیانی خۆی و گوتی:

ـ قۆناغی دووی زانکۆ بووم بەشی دەرمانسازی، کاتێك دایکم کۆچی دوایی کرد. پاش ئەوەی ماوەیەك تێپەڕی بەسەر کۆچی دایکمدا، باوکم بڕیاری دا دووبارە ژن بهێنێتەوە، باوکم چوو کچێکی هێنا کە تەنها بە سێ ساڵ لە خۆم گەورەتر بوو، باوکم پیاوێکی دەوڵەمەند بوو، ڕەنگە ئەوەش هۆکار بووبێت بۆ ئەوەی ئەو کچە ڕازی بێت مێرد بکات بە کەسێکی بەتەمەنی وەکوو باوکم، هەرچەندە باوکیشم تەمەنی زۆر نەبوو، تازە دەبوو بە پەنجا ساڵ، دوای ئەوەی هاوسەرگیریی کرد لەگەڵ ئەو کچە، باوکم بڕیاری دا لەگەڵ باوەژنەکەم بەیەکجاری کوردستان جێ بهێڵن و بڕۆن بۆ کەنەدا، پێش ئەوەی بڕوات، باوکم دوای لێ کردم منیش بڕۆم لەگەڵیان، بەڵام من پێم گوت: باوکە گیان، من وا خەریکە دەخوێنم، ناتوانم لە نیوەی ڕێگا واز لە خوێندنەکەم بهێنم و لەگەڵ ئێوە بێم، بۆیە ڕێك کەوتین من لە کوردستان بمێنمەوە و خوێندنەکەم تەواو بکەم و ئەویش هەرکاتێك پێویستم بە پارە بوو بۆم بنێرێت. ئەوان ڕۆیشتن و من بەتەنها مامەوە، دەستم کرد بە خوێندن و لەپاڵ ئەوەش چێژبینین لە ژیانی لاوێتیم. کچێکی جوانی بیست ساڵان بووم، تەنانەت لە کۆلێژیش باسی جوانیی من دەکرا، کوڕان دەیانویست خۆم لێ نزیك بخەنەوە و کچانیش ئیرەییان پێ دەبردم، لای مامۆستا و دکتۆرەکانیشم زۆر خۆشەویست بووم، هەم کچێکی جوان بووم، هەمیش زیرەك بووم، دکتۆرەیەکمان هەبوو ناوی (ساکار) بوو، ساڵی دووەمی زانکۆ پاش کۆچی لەناکاوی





دایکم ناسیم، زۆر منی خۆش دەویست، هەمیشە دەیگوت میرا هەرشتێکت ویست بە خۆم بڵێ، بە جۆرێك لەلام خۆشەویست بوو وەکوو دایك و خوشکێکی گەورە لێم دەڕوانی، وا هەستم دەکرد تاکە کەسە کە خەمی منیەتی، تانەت لە باوکیشم کە بە هۆی ژنە تازەکەیەوە خەریك بۆو وردەوردە کچە تاقانەکەی لەبیر دەکرد، کچێکی لاو بووم، کەم ئەزموون بووم، هەرچیی بگوتبایە باوەڕم دەکرد و هەرچیی گوتبایە بیکەم دەمکرد، سەرەڕای ئەوەی سێ جار هاوسەرگیریی کردبوو و جیا بووبوویەوە، بەڵام زۆر ڕقی لە پیاوان بوو، دەیگوت پیاوان ژنیان بەس بۆ حەزە پیسەکانی خۆیان دەوێت، تۆشیان بەس تا ئەو کاتە لا گرنگە و تۆیان دەوێت تا حەزەکانیان تێر دەبێت، دوای ئەوە فەرامۆشت دەکەن و نرخێکت نییە لایان، هەمیشە منی دەبرد بۆ کۆڕ و کۆبونەوەکانیان، ئەو ئەندامی کارای یەکێك لە ڕێکخراوەکانی بەرگریکردن بوو لە مافی ژنان، هەمیشە لە دانیشتنەکانیان بە جۆرێك لە جۆرەکان باسی پیاویان دەکرد، وەکوو ئەوەی کە پیاو و ژن وەکوو دوژمنی یەکتری هاتوونەتە دونیاوە، بەشی زۆری دانیشتنەکانیان بە خراپە باسی ئیسلامیان دەکرد، دەیانگوت: ئایینێکە ژنی کردووە بە کۆیلەی پیاو و ئازادیی لە ژن سەندۆتەوە و بەزۆر جلوبەرگیان لەبەر دەکەن و ناهێڵێت وەکوو چۆن پیاوان چێژ دەبینن لە خۆشی و ڕابواردن لەگەڵ ژنان، ئەوهاش ژن چێژ ببینێت لە پیاوان بە حەزی خۆی. بەردەوام ئەوە قسەکانی ئەوان بوو، دڵنیام هەر کچ و ژنێك ئامادەی کۆڕەکانیان

دەبوو، پاش تەواوبوونی کۆڕەکان نەفرەتی لە پیاوان دەکرد و جگە لە ڕق، هیچ شتێکی تری نەدەبردە دەرەوە، جگە لەوە، دوای ئەوەی ساڵی دووەمی خوێندنەکەم بەباشی تەواو کرد، هاوینەکەی منیش زۆربەی کات لای ئەو بووم، لەگەڵ ئەو بووم، تەنانەت هەندێك جار دەڕۆیشتم بۆ شوقەکەشی و شەو لەلای ئەو دەمامەوە و هەندێك جاریش لە ئامادەکردنی کۆڕ و کۆبوونەوەکان یارمەتیم دەدا، ساڵی سێیەمی خوێندم هاتەوە، دوای تێپەڕبوونی دوو مانگ، ڕۆژێکیان دکتۆرە ساکار هات بۆ لام، گوتی: میرا تۆ کچێکی زۆر جوانی، باڵایەکی بەرز و جوانیشت هەیە، زیرەکیت و گشت مەرجەکانی بەشداریکردنت تێدایە، دڵنیام گەر بەشداری بکەیت لە پێشبڕکێی ئەمساڵی شاجوانی ئاسیا، تۆ دەبیتە براوە و شانازییەکی مەزن بۆ ئێمەی کورد و ناو و ئاڵای وڵاتەکەمان بەرز رادەگریت، منیش قسەکانی ئەو کاری تێ کردم و پێم گوت: بەڵام چۆن چۆنی بەشداری بکەم، گوتی: خەمی ئەوەت نەبێت، (عیسا یاسین) هەیە بەرپرسێکی باڵایە و دەوڵەمەندێکی دیاریشە، ئەو یارمەتیمان دەدات و هەموو تێچووی تۆ لەئەستۆ دەگرێت، پاش ئەو قسانە ڕۆیشتمەوە بۆ ئەو شوێنەی لێی نیشتەجێ دەبووم بۆ ئەوەی پەیوەندی بکەم بە باوکمەوە و ئاگاداری بکەمەوە بەشداری دەکەم لە پێشبڕکێیەکی لەو جۆرەدا، بەڵام باوکم هیچ وەڵامێکی نەبوو، سێ ڕۆژ بەدوای یەکدا هەوڵم دا تەلەفۆنی بۆ بکەم، بەڵام وەڵامێك نەبوو، ئەوە بوو دوای ئەوە دەستم کرد

بە ئامادەكارییەكان و جێبەجێكردنی هەر كارێكی پێویست بە بەشداریكردن لە پێشبڕكێكە و مۆڵەتم لە زانكۆ وەرگرت و بەرێ كەوتم بەرەو وڵاتی كۆریای باشوور، لەو وڵاتە پێشبڕكێكە ئەنجام دەدرا، ماوەكەی بیستوپێنج ڕۆژ بوو، دوازدە كچ لە دوازدە وڵاتی جیاجیا بەشدارییان كردبوو، تەمەنی هەموویان لەنێوان هەژدە بۆ بیستوپێنج ساڵیدا بوو، هەریەكێكمان بە ئاواتی ئەوە هاتبووین كە ببێتە براوەی نازناوەكە، هەندێكیان دەیانگوت: هەموو خەونیان تەنها ئەوەیە وەكوو شاجوان هەڵبژێردرێن، تەنانەت باجی گەیشتن بەو نازناوە هەرچییەك بێت قبوڵی دەكەین. پێنەدەچوو هیچكامێك لە كچەكان كچی خراپ بن، هەموویان یەك دونیا خەونی جوانی بۆ ژیانی خۆی هەبوو، یەكێكیان خەونی ئەوە بوو نازناوەكە بەكار دەهێنێت بۆ ئەوەی كاری خێرخوازیی پێ ئەنجام بدات، یەكێكی تریان خەونی ئەوە بوو لەو ڕێگەیەوە بناسرێت و پاش ئەوە لەگەڵ كوڕێكی دەوڵەمەند هاوسەرگیری بكات، یەكێكی تریان دەیویست دوای ئەوەی بووە براوەی پێشبڕكێكە، ببێتە ئەكتەر و لە فیلم و دراماكان ڕۆڵ ببینێت، ڕاستی تاكە ئامانجی من ئەوە بوو كە بە هۆی ئەو نازناوەوە بەناوبانگ ببم و چێژ وەر بگرم لەو ناوبانگ و پارەیەی لە ڕێگەی ئەوەوە دەستم دەكەوێت، بیستوچوار ڕۆژ تەنها ئێمەیان دەگێڕا بەناو كۆریادا و شوێنە گەشتیارییەكان و شوێنە خۆش و جوانەكانی كۆریایان نیشان دەداین، هەندێك جاریش بانگیان دەكردین بۆ هۆڵێك، كە تەنها دەبوو جلی ژێرەوە لەبەرمان

بێت و نمایشیان بۆ بکەین، بە وتەی خۆیان، ئەوەش خاڵی لەسەرە بۆ بوون بە شاجوان، جارجارە ئەو کەسانەی لە لیژنەکە بوون لێمان نزیك دەکەوتنەوە و دەستیان دەهێنا بە قژ و شان و کەمەرمان، پێیان دەگوتین ئەو شتانە بە ئاسایی وەر بگرین و بەشێکن لە پێشبڕکێکە، ئێمەش هیچکامێکمان هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو لە ترسی ئەوەی لیژنەکە لێمان تووڕە نەبێت و لای گشتمان ڕوون بوو کێ زیاتر بەدڵی ئەوان مامەڵە بکات و بجووڵێتەوە و داواکارییەکانیان جێبەجێ بکات، ئەو دەبێتە براوە، ئەو بیستوچوار ڕۆژەی پێش پێشبڕکێکە ئێمەیان بە جۆرێك مەست کردبوو، دەمانگوت کەسێك لەو جۆرە پێشبڕکێیانە بەشداری نەکات، نازانێت تام و چێژی ژیان چۆنە، ئێوارەیەکیان کەسێك هات و گوتی: بۆ ئێوارە بانگێشتی نانی ئێوارە کراویت لەلایەن یەکێك لە ئەندامانی لیژنە، منیش بەدڵخۆشییەوە بە بانگێشتنامەکە ڕازی بووم و ڕۆیشتم، دوای ئەوەی لە هۆتێلێکی پێنج ئەستێرە نانمان خوارد، دوای لێ کردم لەگەڵی بچم بۆ ژوورێك، منیش شتەکەم بە ئاسایی وەر گرت، بەڵام کاتێك ڕۆیشتینە ژوورەکە، بینیم وا دەرگاکە دادەخرێت و دەیەوێت لە من نزیك بکەوێتەوە، سەرەتا هیچ کاردانەوەیەکم نەبوو، وام دەزانی تەنها بە چەند ماچێك واز دەهێنێت، بەڵام دواتر تێگەیشتم شتی تری دەوێت، بەڵام من ڕەتم کردە و هەرچەندە ویستی زۆرم لێ بکات، من ڕازی نەبووم، دوای ئەوەی کە زانیی من خۆم نادەم بەدەستیەوە، تفێکی کردە ناو چاوم و دەرگاکەی کردەوە،

پاش ئەوە منیش گەڕامەوە بۆ ئەو هۆتێلەی ئێمەی لێ دەماینەوە، تاوەکوو گەیشتمەوە شوێنەکەم، هەر دەگریام نەفرەتم دەکرد لە خۆم بۆ بەشداری کردن لەو پێشبڕکێیە، دوای ئەوەی گەیشتمەوە بۆ هۆتێلەکە، کچێکی ئەفغانی و کچێکی ئوردەنی کە زانییان گریاوم، هاتن بۆ لام، منیش تەواوی ڕووداوەکەم بۆ گێڕانەوە، ئەوانیش وتیان دڵنیا بە بەتەنها ئەو ڕفتارە خراپانە بەرامبەر تۆ نەکراوە، ئەو شتەی لە تۆیان ویستووە لە ئێمەش داوا کراوە، کچە ئەفغانییەکە ناوی (پەرستۆ) بوو، گوتی: هەموو هیوایەکی من ئەو نازناوەیە، لە پێناو ئەو نازناوە شەڕم لەگەڵ دایك و باوکیشم کردووە، تاوەکوو وای لێ هات باوکم گوتی گەر بەشداری بکەیت لەو پێشبڕکێیە، ڕێگای ئەو ماڵە لەبیر بکە، بۆیە دەبێت بیسەلمێنم ئەوان هەڵەن، بەڵکوو دەبێت وایان لێ بکەم شانازیشم پێوە بکەن. کچەکەی تر کە ئوردەنی بوو، ناوی (أحلام) بوو، ئەویش گوتی: بەڵێ، دەبێت بۆ هەمووان بیسەلمێنین ئێمەش شایانی ئەوەین ئەو ژیانە بژین کە خۆمان دەمانەوێت. ڕۆژی بیستوپێنجەم هات، ئەو ڕۆژەی هەمووان بەتامەزرۆییەوە چاوەڕێی بووین، پاش ئەوەی هەریەکێکمان لە ئەو نماییشەی لەسەری پێویست بوو بیکات و ئەو شتانەی دەبوو بیڵێت وتمان، کاتی ڕاگەیاندنی سێ کۆتا کاندید هات، دڵمان بە جۆرێك لێیدەدا، کە باوەڕ ناکەم دڵی هیچکامێکمان پێشتر بەو جۆرەی لێدابێت. کاتێك ناوەکان ڕاگەیاندران، ناوی من و کچێکی پاکستانی و ئوسترالی خوێندرایەوە، دڵم زۆر خۆش

بوو، بەڵام کە بینیم وا خەریکە پەرستۆ دەگریت، حەزم نەدەکرد بەو جۆرەی ببینم، کاتی ئەوە هات هاوەڵی دووەمی شاجوان ئاشکرا بکرێت، هەرسێکمان دەستمان خستبوویە ناو دەستی یەکتری و توندتوند دەستی یەکتریان دەگوشی، تا ئەوە بوو گوێم لێ بوو: میرا لە عێراقەوە بوو بە هاوەڵی دووەمی شاجوان، بۆیە ناوی عێراق خوێندرایەوە، چوونکە لەژێر ناوی عێراق بەشداریم کردبوو، دوای ئەوە هاوەڵی یەکەمی شاجوان ئوستوراڵی بوو و کچە پاکستانییەکەش بوو بە شاجوانی ئاسیا.

میرا ویستی شتێك بڵێت، ئەوە بوو یەکێك لە کاپتنەکان هات و گوتی:

ـ ببورن، ماوەیەکی زۆرە دانیشتوون و داوای هیچتان نەکردووە.

کاتێك تەماشای کاتژمێرەکەم کرد، بینیم وا سەعاتێکە ئێمە دانیشتووین. بۆیە بە کاپتنەکەم گوت:

ـ ببورە، بە هۆی گفتوگۆکەمانەوە لەبیرمان کردووە داوای خواردنەکە بکەین.

دوای ئەوەی داوای خواردنەکەمان کرد، بە میرام گوت:

ـ خەریك بوو باست دەکرد، بەردەوام بە.

میرا بەردەوام بوو گوتی: دوای ئەوەی پێشبڕکێکە تەواو بوو، پەرستۆ و أحلام هاتن بۆ ئەوەی پیرۆزباییم لێ بکەن، منیش





سوپاسم کردن و ڕووم کردە پەرستۆ و پێم گوت: ئێستا بەتەمایت چی بکەیت؟

وڵامی دامەوە: نازانم، دەگەڕێمەوە بۆ ئەفغانستان، بەڵکوو بتوانم بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە.

دوای ئەوەی بووین بە هاوڕێی یەکتری و لە ئینستاگرام یەکترمان فۆڵەو کرد و بەڵێنمان بە یەکتری دا زووزوو هەواڵی یەکتری بپرسین و گەر کرا سەردانی یەکتریش بکەین. پاش ئەوە ماڵئاواییمان لە یەکتری کرد، پێش ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ فڕۆکەخانە، دکتۆرە ساکار پەیوەندیی پێوە کردم و پیرۆزبایی لێ کردم گوتی: دڵنیام شایانی ئەوە بوویت ببیتە شاجوان، بەڵام هاوەڵی دووەمی شاجوانیش خراپ نییە.

دوای ئەوەی بەڕێ کەوتم بۆ فڕۆکەخانە و سواری فڕۆکەکە بووم و پاش ماوەیەك لە فڕۆکەخانەی هەولێر فڕۆکەکەمان نیشتەوە، کاتێك دابەزیم، دکتۆرە ساکار و کۆمەڵێك ژن و کچی تر بە پێشوازییەکی گەرمەوە بەرەو ڕووم هاتن، هەندێك کەناڵی ڕاگەیاندنیشیان هێنابوو، دوای ئەوەی گەیشتمە لای ئەوان، گوڵبارانیان کردم و بەگەرمی پێشوازییان لێ کردم، کەناڵەکان چاوپێکەوتنیان لەگەڵ دەکردم و فلاشی کامێراکان مەستیان کردبووم، بە جۆرێك خۆشحاڵ بووم، دڵنیا بووم گەر بووبام بە شاجوانیش، هەر ئەوەندە خۆشحاڵ دەبووم و پێشوازیم لێ دەکرا،

سوپاسی دکتۆرە ساکارم کرد بۆ هەموو شتێك، ئەویش گوتی: چیت بینیوە کچم جارێ، ئەوە سەرەتایەتی، ببینە چۆن کەناڵەکان ڕیز دەبەستن بۆ چاوپێکەوتنت و کۆمپانیاکان شەڕ دەکەن بۆ گرێبەستکردن لەگەڵت، هەر واش دەر چوو کە گوتی، بە ماوەیەکی کەم تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان پڕیان بوو لە ناوی من، ئینستاگرام و سناپچاتەکەم بە ماوەیەکی زۆر کەم بە سەدان هەزار فۆڵەوەرسیان پەیدا کرد، ئێوارەی هەمان ڕۆژ یەکێك لە دیارترین کەناڵەکان، کە تەنها ئیشی گەورەکردنی کەسە بێسوودەکانە لەناو کۆمەڵگا، بڕیار بوو چاوپێکەوتنم لەگەڵ بکەن، پێشکەشکارەکە (باران)ی هاوڕێم بوو، تا ئەو ڕۆژە هیچ پەیوەندییەکمان نەبوو پێکەوە، بەڵام من ئەوم دەناسی، بەڵام هەر لەپاش چاوپێکەوتنەکەوە بووین بە هاوڕێ، دواتر لەگەڵ یارانی خوشکیشی بووین بە هاوڕێ، ڕۆژبەڕۆژ ناوی من گەورەتر دەبوو، کار و ڕیکلامی زۆرم بۆ پێشنیاز کرا، زۆر دڵخۆش بووم، بە خۆم دەوت: بەڵێ، ئەوە بوو دەمویست، ئەو هەموو ناوبانگ و خۆشییەم دەویست، ئێوارەیەك دکتۆرە ساکار پەیوەندیی پێوە کردم و گوتی: مژدەم بدەرێ، (عیسا یاسین) تۆی بانگێشت کردووە بۆ هۆتێلەکەی، بڕۆ و سوپاسی بکە بۆ هەموو شتێك کە بۆ تۆی ئەنجام داوە.

پێم گوت: ئەی تۆ نایەیت؟

گوتی: من هەندێك کاری گرنگم هەیە، با بۆ جارێکی تر بێت.





بۆ ئێوارە سەیارەیەکی مۆدێل بەرز هات بەدوامدا و منی برد بۆ هۆتێلەکەی (عیسا یاسین)، لەوێ عیسا یاسین پێشوازییەکی گەرمی لێ کردم و پیرۆزبایی لێ کردم و زۆر وەسفی جوانییەکەمی کرد. ئاهەنگێکی وەکوو پیرۆزبایی بۆ من ساز کردبوو، منیش زۆر دڵخۆش بووم کە دەمبینی وا کەسێکی دەوڵمەند و دیار گرنگیم پێ دەدات، دەنگی مۆسیقا بڵند بوو و جۆرەها مەشرووب پێشکەش دەکرا، عیسا یاسین هات بۆ لام و پێی گوتم: ئەو شەرەفەم پێ دەبەخشیت تۆزێك سەمام لەگەڵ بکەیت جوانی نێو جوانان. منیش داواکەم قبوڵ کرد و پێنج خولەکێك سەمامان کرد، پاشان پەرداغێکی هێنا، گوتی: ئەوە جۆرێکی تایبەتی شەرابە، لای من زۆر تایبەتە، بەس پێشکەشی ئەو کەسانەشی دەکەم کەلای من زۆر تایبەتن، منیش بە زەردەخەنەیەکەوە پەرداغەکەم لێ وەرگرت و خواردمەوە، زۆر قورس بوو، سەرمی دەسووڕاند، بە جۆرێك سەرخۆشی کردبووم، ئاگام لە خۆم نەمابوو، کاتێك بەئاگا هاتمەوە، لەسەر جێگایەکی نوستن بووم بێ ئەوەی هیچ جلوبەرگێکم لەبەردا بێت، کاتێك تەماشای تەنیشت خۆم کرد، بینینم وا عیسا یاسین لەپاڵم ڕاکشاوە، پەلامارم دا و پێم گوت: هەی بێنرخ، ئەوە چیت لێم کردووە.

زللەیەکی توندی لێ دام گوتی: *****، ئەوە بە منت وت بێنرخ، ئەوەیە وەڵامی ئەو هەموو چاکەیەی لەگەڵم کردی، بۆ نەتدەزانی کاتێك کەسێك چاکەیەکت لەگەڵ دەکات دەبێت تۆش بە چاکە وەڵامی بدەیتەوە، ئینجا خۆ بەزۆر نەمهێناوی، خۆت بە پێکانی

خۆت هاتیت، ئەی ئەو هەموو ئاهـ و ناڵە و خۆشییەت لە چی بوو، بیرت نییە چیت پێ دەگوتم.

دەستم کرد بە گریان و پێم گوت: تۆ تەمەنی باوکی منت هەیە و منیش تەمەنی کچە بچووکی تۆ، چۆن ئەوەت لەگەڵ کردم، بۆچی؟

دەستی بۆ ژێر سەرینەکە برد و دەمانچەیەك و سەفتەیەك پارەی دەر هێنا، هەمووی دۆلار بوو، پارەکانی بۆ لای من فڕێ دا و گوتی: بەبێدەنگی ئەو پارانە هەڵبگرە و بڕۆ، دەنا زۆر خراپ ڕوو دەدات، دەمیشت دادەخەیت، دەنا خۆم بۆت دادەخەم.

پارەکانم پێدا دایەوە پێم گوت: بۆ تۆ من بە چی تێگەیشتووی، منت پێ لەشفرۆشە.

دوای ئەوە بەگریانەوە لە هۆتێلەکە هاتمە دەرەوە، خێرا تەلەفۆنم کرد بۆ دکتۆرە ساکار، بەگریانەوە پێم گوت: لەکوێیت؟

وڵامی دامەوە: چی بووە؟ بۆچی دەگریت؟ وا لە بینای ڕێکخراوم، وەرە بۆ ئەوێ.

خێرا ڕۆیشتم بەرەو ئەوێ، کاتێك گەیشتم، خۆم هەڵدایە ناو ئامێزی، بەگریانەوە گوتم، بەدبەخت بووم.

وتی: چی بووە؟ بۆ دەگریت؟ ئەو فرمێسکانەت بسڕە و پێم بڵێ عیسا یاسین شتێکی پێ گوتوویت؟





فرمێسەکانم سڕی و گوتم: خۆزگە تەنها هەر قسە بایە.

دوای ئەوە تەواوی ئەوەی بەسەرم هات بۆم گێڕاوە. پاشان پێم گوت: یارمەتیم بدە، تۆ نەتدەگوت هەرکاتێک پێویستیت بە یارمەتی بوو پێم بڵێ، ئەی ئێرە ئەو ڕێکخراوە بۆ بەرگریکردن نییە لە مافەکانی ژنان، یارمەتیم بدە سکاڵای لەسەر تۆمار بکەم، بیدە دادگا بۆ ئەوەی بە سزای خۆی بگات.

دکتۆرە ساکار فرمێسکەکانی سڕیم و گوتی: سەیر کە کچی خۆم، دەزانم چیت بەسەر هاتووە، دەزانم سەختە باوەڕ بەوە بکەیت و ئەوە قبوڵ بکەیت کە بەسەرت هاتووە، بەڵام هەوڵ بدە لێم تێبگەیت، عیسا یاسین بەرپرسێکی باڵایە، دەستی دەڕوات و پشتی هەیە و کەسێکی مەترسیدارە، هەوڵ بدە ئەوەی ڕووی دا لەبیری بکەیت، دەتەوێت تەنها بە هۆی شتێکی بچووکەوە کە ڕووی داوە داهاتووی خۆت وێران بکەیت، تۆ تازە وا لە سەرەتای ڕێگایت، دەبێت بەرگەی شتی سەختتریش بگریت. بهێنە بەرچاوت ئەو شەوە هیچ ڕووی نەداوە، فرمێسکەکانت بسڕە و زەردەخەنە بکە، پێبکەنە بۆ ژیان، چێژ ببینە لەو هەموو ناو و ناوبانگەی کە پەیدات کردووە، ئینجا بزانە هەموو ئەوەی ئێستا پێی گەیشتووی، ئەو میرایەی ئێستا هەیە، بە هۆی یارمەتییەکانی ئەو پیاوەوەیە، بێنە بەرچاوت لە پای هەموو ئەو شتەی ئەو بۆ تۆی کردووە، تۆش ئەوەندەت بۆ ئەو ئەنجام داوە، هەر ئەوەندە.

کاتێک ئەو قسانەم لەو بیست، تووشی شۆک بووم، هیچم پێ نەدەگوترا. پاشان گوتی: هەندێک کارم هەیە ئەنجامیان دەدەم و ئێستا دێمەوە، تۆش ئەرداخێک ئاو بخۆوە دڵنیام باشتر دەبیت.

پاش ئەوە ڕۆیشتم بۆ گۆشەیەک و دانیشتم، لەبەر خۆمەوە دەگریام، ژنێکی سی ساڵان هات بۆ لام و کلینکسێکی پێ دام بۆ ئەوەی فرمێسکەکانی پێ بسڕم و لام دانیشت و گوتی: ڕاستی، نازانم بۆچی دەگریت، بەڵام دڵنیام دەردی تۆش لە دەردی من کەمتر نییە.

دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆی و گوتی: چوار ساڵە هاوسەرگیرم کردووە و خاوەنی دوو کوڕم، مێردەکەم فەرمانبەرە، پیاوێکی باشە، تا ئێستا نەیهێڵاوە لە هیچمان کەم بێت و چاوشۆڕی هیچکەس بین، ئیتر ژیانی هاوسەرگیری وایە، زۆر جار دەمەقاڵە و شەڕیشی تێ دەکەوێت، بەڵام ڕێکخراوەکانی ژنان و ئەو ڕێکخراوانەی خۆیان بە ناوی بەرگریکردن لە مافی ئافرەت ناساندووە، وایان لە ئێمە گەیاندووە کە مێردەکەت مافی ئەوەی نییە پێت بڵێت پشتی چاوت برۆیە، وا تێگەیەندراوین کە پیاو بۆی نییە هاوارێکی بچووکیش بکات بەسەرماندا، کۆتا جار لەگەڵ هاوسەرەکەم لێمان بوو بە دەمەقاڵێ، ئێستا کە بیر دەکەمەوە، سنوورم زۆر بەزاندبوو، بە مەبەستیش وام دەکرد تاوەکوو ئەوەی لێم بدات و دوای ئەوە منیش بێم لە ڕێکخراوەکانی مافی ژنان سکاڵای لەسەر تۆمار بکەم بۆ ئەوەی فێری بکەم جارێکی تر

دەنگ بەسەر مندا بەرز نەکاتەوە، دوای دەمەقاڵەیەکی زۆر خۆی نەگرت و دوو زللەی لێم دا، ئاخری ئەوەی کرد کە من دەمەویست، منیش خێرا خۆم کۆ کردەوە و ویستم لە ماڵ بێمە دەرەوە، گوتی: بۆ کوێ؟ گوتم: دوایی خۆت دەزانی بۆ کوێ ڕۆیشتووم. بەدوامدا هات و لەبەرم دەپاڕایەوە، ژنەکە بگەڕێوە حەیامان مەبە، سەیر کە منداڵەکان چۆن دەگرین و هاوار دەکەن، بەڵام من گوێم بۆ قسەکانی ئەو نەگرت و ڕاستەوخۆ هاتم بۆ ئێرە، وا نزیکەی مانگێکە لێرەم، ڕۆژەکانی سەرەتا هەموو شتێك لێرە جوان دەر دەکەوت و بە خۆم دەوت بۆ شوێنە ڕاست و دروستەکە هاتووم، کاتێکیش ماڵی باوکم و مێردەکەم زانییان لێرەم، سێ ڕۆژ بەدوای یەکتردا هاتن، بەڵام من ڕازی نەبووم لەگەڵیان بچمەوە، پێم گوتن: دەبێت لە دادگا وەڵامی ئەوەم بداتەوە بزانم بۆچی لێی دام، دەبێت بزانێت باجی دەستبەرزکردنەوە لە ژنێك چییە. بەڵام پاش ئەوە ڕۆژبەڕۆژ بۆم دەر دەکەوت کە لە چ دۆزەخێکدا گیرم خواردووە و بۆ چ دۆزەخێك هاتووم. لەو ماوەیەدا سێ جار لەلایەن ئەو پیاوانەی وا خۆیان دەر دەخەن دۆستی ڕێکخراوەکانی مافی ژنانن، دەستدرێژییان کردوومەتە سەر، بە جۆرێکم لێ هاتووە تف و نەعلەت لە خۆم دەکەم، تەنانەت ڕووم نییە بگەڕێمەوە، ماڵێشم داوای لێبوردن بکەم دوای ئەو هەموو شتەی بەسەرمدا هاتووە، نازانم چیم لێ دێت، زۆر جار بیر لە خۆکوشتن دەکەمەوە، ئاخر من لە چیم کەم بوو، ماڵم هەبوو، مێردم هەبوو، دوو کوڕی جوانم هەبوو، خەمی

هیچم نەبوو، نازانم بۆچی وام لە خۆم کرد. ئێستاش نازانم دادگا چیم بۆ دەکات تازە، هەرچی بکات دڵنیام تازە من دۆڕاوم لەو بابەتەدا.

کاتێك سەیری میرام کرد، بینیم وا خەریکە فرمێسك لە چاوانی دێنە خوار، منیش خێرا کلینکسێکم هێنایە دەرەوە و پێم دا. لێی وەر گرتم و سوپاسی کردم، پاشان بەردەوام بوو و گوتی: دەزانی ئەندازیار، ڕێکخراوەکانی ژنان لە چی دەچن، لەو ئاگرە دەچن تۆ دەتەوێت خۆتی لەبەر گەرم بکەیتەوە، بەڵام کاتێك بەئاگا دێیتەوە، ئەو ئاگرە وا خەریکە تەواوی گیانت دەسووتێنێت. دوای ئەوە چاوەڕێی دکتۆرە ساکار نەبووم بگەڕێتەوە، هەڵستام و ڕاستەوخۆ ڕۆیشتمەوە بۆ شوقەکەم، تاکە پەناگەیەك کە شکم بۆی چوو هانای بۆ بەرم، باوکم بوو، مۆبایلەکەم بە دەستەوە گرت و تەلەفۆنم بۆ کرد، بەڵام دووبارە داخرابوو، ئێوارە دکتۆرە ساکار تەلەفۆنی بۆم کرد و گوتی: ئەرێ دیارە تۆ چی دەکەیت کچم، بۆ بەبێ پرسی من ڕۆیشتیەوە، دەی ئەوە کێشە نییە، خێرا بڕۆ خوارەوە وا سەیارەیەك لە بەردەم شوقەکەت وەستێنراوە و دیاریی عیسا یاسینە بۆ تۆ. ویستم شتێك بڵێم، ئەو بەردەوام بوو و گوتی: هەوڵ مەدە ڕەتی بکەیتەوە، بڕۆ وا سویچەکەی لەسەرە و بە ناوی خۆشتەوە کراوە، بە دڵێکی خۆش لێی بخوڕیت. کاتێك ڕۆیشتمە خوارەوە، ئەو سەیارەیە بوو کە خەونم پێیەوە دەبینی، سبەی ڕۆیشتم بۆ زانکۆ بەو سەیارەیە، بەڵام هەموو شتێك گۆڕابوو، ئەو میرایەی پێشتر زۆر لەو میرایەی ئێستا لەناو زانکۆ جیاوازە، کاتێك ڕۆیشتم،

بینیم وا خەریکە گشتیان بەخێرهاتنەوەم دەکەن و پیرۆزباییم لێ دەکەن، هەندێکیان داوای وێنەگرتنم لێ دەکەن. کاتێک ئەو دیمەنانەم دەبینی، بیرم لە قسەکانی دکتۆرە ساکار دەکردەوە کە پێی گوتم: ئەو شتە لەبیر بکەم کە ڕووی داوە، بۆ ساتێک دەنگێکی سەیر لە ناخمدا هاواری کرد و گوتی: گەمژە، ببینە چۆن دەورەیان لێت داوە تەنها بۆ ئەوەی وێنەیەکت لەگەڵ بگرن، دەزانی چەندت پێویستە تاوەکوو کار بکەیت بۆ ئەوەی ئەو جۆرە سەیارەیەی کراوەتە دیاری بۆت بیکڕیت، هیچ شتێک ڕووی نەداوە، لەبیری بکە، وای دابنێ ئەوە قوربانییەکی بچووکە بە خۆت داوە بۆ ئەو شتەی کە دەتەوێت پێی بگەیت. ڕابردوو فەرامۆش بکە و بەئومێدەوە بۆ داهاتوو بڕوانە. دوای ئەوە دکتۆرە ساکار هات و گوتی: دوای ئەوەی لە زانکۆ تەواو بووین، دەڕۆین بۆ شوێنێک. منیش پرسیم بۆ کوێ دەڕۆین؟ ئەویش سەیرێکی کردم و گوتی: میرا ئەوە چیتە، دەزانی ئەو ماوەیە پرسیار زۆر دەکەیت، نزیکەی نیوکاتژمێر لە شوێنێک ئیشمان هەیە و زوو تەواو دەبین. دوای ئەوەی ڕۆیشتین بۆ ئەو شوێنە، بینیم وا یاران و باران و دوو کچی تریش دانیشتوون. دوای ئەوەی نزیکەی دە خولەکێک چاوەڕێیان کرد عیسا یاسین لەگەڵ دوو پیاوی تر هاتنە ژوورەوە، جگەرەیەکی بە دەمەوە بوو، ڕووی کردە ئێمە و گوتی: چیتان دەوێت داوای بکەن، چی دەکەن بیکەن، کەس ڕێگرتان نییە، بەڵام لەبەرامبەر ئەوەشدا من داوای چیم لێ کردن دەبێت ئەنجامی بدەن، من داوای

شتی کەم لە ئێوە دەکەم و لەبەرامبەردا شتی زۆرتان پێشکەش دەکەم. پاش ئەوەی ئەو جۆرە قسانەی بۆ کردین، تەماشایەکی منی کرد و زەردەخەنەیەکی کرد و ڕۆیشتن، دوای ئەوەی زانیم باران و بارانیش هەر کار بۆ ئەو دەکەن، لێیان نزیک بوومەوە، سڵاوم لێ کردن و پاشان دەستمان کرد بە قسەکردن لەگەڵ یەکتری، دوای ئەوە دکتۆرە ساکار هات و گوتی: با بڕۆین. منیش گوتم: تۆ بڕۆ، من دوایی دێمەوە. ئەو ڕۆیشت و من لەگەڵ یاران و باران ڕۆیشتم بۆ شوقەکەی ئەوان، لەوێ دەستمان کرد بە دەردەدڵکردن لەگەڵ یەکتری، بڕیارمان دا لەگەڵ یەکتری ڕاستگۆ بین و هەرچیی بەسەرمان هاتووە بۆ یەکتری باسی بکەین. من تەواوی ئەوەی بەسەرمدا هاتبوو بۆم باس کردن، دواتر یارانیش گوتی: ئێمەش هەر لە ڕێگەی دکتۆرە ساکارەوە عیسا یاسینمان ناسی، کاتێک بۆ یەکەم جار عیسا یاسین من و بارانی بینی، پێی گوتین: یاران جەستەیەکی جوانت هەیە، تۆ بۆ مۆدێلی باشیت. باران تۆش کچێکی قسەزانی، دەتکەم بە پێشکەشکار. بارانی خوشکیشم وەڵامی دایەوە و وتی: ئاخر بەڕێزم، من هیچ لە ڕاگەیاندن نازانم، عیسا یاسین زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: ئاخر کچی جوان، هەڵگرتنی مایکێک و ڕۆیشتن بۆ لای کەسانێک کە هیچ قسەیەک نازانن و هیچیان پێ نییە هێندە قورسە، هەموو ئیشی تۆ ئەوەیە بڕۆیت بۆ لای ئەو کەسانەی ئێمە بۆت دیاری دەکەین و ئەو پرسیارانەیان لێ دەکەیت کە ئێمە بۆت ئامادە دەکەین، بەکورتی و

کوردی، تۆ گەمژەکانمان بۆ بەناوبانگ دەکەیت. دواتر ڕووی کردە من و پێی گوتم: تۆش هەموو ئەوەی لەسەرت پێویستە جارجار پۆستێك بکەیت و ئەو شتە پۆست بکەیت کە ئێمە بۆت دادەنێین. لە خوارەوەش وێنەیەکی نیمچەڕووتی خۆت دابنێ. پێش ئەوەی بڕوات، بە هەریەکێکمان بڕی هەزار دۆلاری پێ داین، باوەڕمان بە چاوانی خۆمان نەدەکرد، پاش ئەوەی ئەو ڕۆیشت، دکتۆرە ساکار گوتی: کچینە ئەوە چییە، بەس ئێوە ئازا بن ئەوەی ئەو پێتان دەڵێت بیکەن، بۆخۆشتان نازانن پارە چۆن دێت. دواتر شوقەیەکی پێمان دا و سەیارەیەکیشی کڕی بۆمان، قسەکانم بە یاران بڕی و لێم پرسین: ئێوە چۆن چۆنی دکتۆرە ساکارتان ناسی؟ باران گوتی: ئێمە خەڵکی باشوور نین و لای خۆمان بارودۆخی ئابووری زۆر خراپە و ژیانی خەڵکی سەختە، خەڵکی بەئەستەم نانی ڕۆژیان پێ پەیدا دەبێت، بۆیە ئێمەش لەگەڵ خوشکەکەم بڕیارمان دا بێین بۆ باشوور، چوونکە بیستبوومان لێرە بارودۆخ باشترە و ژنیش دەتوانێت کاری باشی دەست بکەوێت، ئەو کاتەی هاتین هیچکەسمان نەدەناسی، ماوەیەکی زۆر لێرە ماینەوە و هیچ کارێمان دەست نەدەکەوت، خەریك بوو بڕیار بدەین بگەڕێینەوە، بەڵام دواتر بیرمان کردەوە بۆ سەرێك نەدەین لە ڕێکخراوەکانی ژنان، بەڵکوو ئەوان بتوانن شتێکمان بۆ بکەن، بۆیە ڕۆیشتین بۆ ڕێکخراوێکی ژنان بۆ ئەوەی یارمەتیدەرمان بن بۆ ئەوەی کارێك بدۆزینەوە، لەوێ بوو دکتۆرە ساکارمان ناسی، هەر کە زانیی ئێمە خەڵکی پارچەیەکی تری

کوردستانین، خێرا بە زەردەخەنەیەکەوە بەرەو ڕووومان هات و بەخێرهاتنی کردین و بەڵێنی پێ داین کارمان بۆ بدۆزێتەوە، ماوەیەك لە ڕێکخراوەکە دەماینەوە و شوێنێکی باشیان هەبوو و کچ و ژنی تریشی لێ بوو، تا ئەوە بوو ڕۆژێك گوتی: وەرن لەگەڵم، ئێمەی برد بۆلای عیسا یاسین و لەوێ عیسا یاسین بەخێرهاتنێکی گەرمی کردین، ئەو قسانەی پێشتر پێم گوتی بە ئێمەی گوت. جاری دووەم کاتێك ڕۆیشتین بۆ لای، پێی گوتین: کچینە چاکەیەکی ترم لە ئێوە دەوێت، هەموو ئەوەی من لە ئێوەم دەوێت ئەوەیە شەوانە بڕۆن بۆ ئەو شوێنانەی ئێمە بۆتان دیاری دەکەین و چەند کاتژمێرێك لەوێ دەمێننەوە، پاشان دەگەڕێنەوە بۆ شوقەی خۆتان. ڕاستی ئێمە موسڵمانین، بەڵام تا ئێستا پابەندن نەبووین بە دینەوە، بۆیە زۆر گوێمان نەدەدا بەوەی چ کارێکە، تەنها کارێك بێت بتوانین لە ڕێگەیەوە پارە کۆ بکەینەوە و ژیانمان خۆش بکەین، ئێمە وەکوو پێشکەشکار و مۆدێل ناسرابووین، بەڵام کارمان ئەوە بوو کاتێك وەفدێکی دەرەکی دەهات بۆ هەولێر، شەو ئێمە بچین بۆ لایان و بۆ چەند کاتژمێرێك ئەوەی ئەوان دەیانەویست جێبەجێی بکەین، ڕاستی ئەوەندەمان نەبوونی چێشتبوو، بەلامانەوە گرنگ نەبوو چ کارێکە دەیکەین، ئەوەی بۆ ئێمە گرنگ بوو ئەوە بوو کە پارەیەکی باشمان دەست دەکەوێت و دەتوانین خۆش بژین و یارمەتیدەرێکی باشی ماڵێشمان بین. پاش ئەوە یاران زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: دەزانی، من جارێك هاوسەرگیرم کردووە و جیاش





بووەمەتەوە، بەردەوام بوو و گوتی: جارێکیان عیسا یاسین هات بۆ لام و پێی گوتم: هەوڵ بدە لەگەڵ کوڕێك پەیوەندی دروست بکەیت، ناسراو بێت باشترە. ڕاستی ئەو کات لە قسەکانی تێنەدەگەیشتم، پێویست نەبوو تێشبگەم، ئەو چیی وتبایە ئێمە ئەوەمان دەکرد، تا ئەوە بوو کوڕێکی قۆزم ناسی، بەڵام زۆر ناسراو نەبوو، وا خۆم نیشان دەدا کە خۆشم دەوێت و عاشقی ئەوم، بۆیە بە عیسا یاسینم گوت: ئەوەی تۆ وتت جێبەجێم کردووە، کوڕێکم شەیدای خۆم کردووە، گوتی: ئافەرین، بەردەوام بە تاوەکوو من پێت دەڵێم چی بکەیت. ئەوە بوو پەیوەندییەکەمان بەردەوام بوو، تاوەکوو ئەوەی ڕۆژێك عیسا یاسین گوتی: بەو کوڕە بڵێت مارەت بکات، منیش وەکوو ڕۆبۆتێکم لێ هاتبوو، چیی پێدەگوتم ئەوەم دەکرد. ئەوە بوو باوك و دایکم هاتن بۆ ئێرە و لەگەڵ ئەو کوڕە هاوسەرگیریم کرد، ماوەی ساڵێك وا خۆم نیشان دەدا لەو ڤیدیۆیانەی بڵاوم دەکردنەوە ئێمە بەختەوەرترین و عاشقترین کەسین، لە کۆمێنتەکان زۆر کەس ئاواتی بە ژیانی ئێمە دەخواست. ئارایشگایەکی ژنانەشم دانابوو، وا خۆم دەر دەخست لە ڕێگەی ئەو ئیشەوەیە پارەم دەست دەکەوێت، کوڕێکی چەندە گەمژە بوو، وای دەزانی عاشقی ئەوم، بەو شێوەیە ژیانمان کرد تا ئەوە بوو نزیکەی ساڵێك تێپەڕی، عیسا یاسین ڕۆژێکیان گوتی: هەوڵ بدە لە خۆتی بێزار بکەیت و وای لێ بکەیت داوای جیابوونەوەت لێ بکات، گەر هەر نا، خۆت داوای جیابوونەوەی لێ بکە، ئەوە بوو

ڕۆژێك بەگریانەوە ڤیدیۆیەکم بڵاو کردەوە و گوتم: لەگەڵ مێردەکەم لە یەکتری جیا بووینەوە، ئیتر ئەو ڤیدیۆیە تەواوی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی هەژاند، هەفتەیەك باس باسی جیابوونەوەی ئێمە بوو، لەو کوڕە جیا بوومەوە و بەوێرانی جێم هێشت بێ ئەوەی بزانم چ تاوانێکی گەورەم بەرامبەر بەو هەژارە کردووە، دوایی بۆم دەرکەوت کە عیسا یاسین بۆچی داوای لێ کردم هاوسەرگیری بکەم لەگەڵ ئەو کوڕە و بۆچییش لێی جیا ببمەوە. ئەو کات بارودۆخی هەرێم باش نەبوو، خەڵکی نارازی بوون لەبەرامبەر ئەوەی موچە نییە و درەنگ دەکەوێت و خەڵکی داواکاریی هەبوو، تا ئەوەی ترسیان هەبوو کە خەڵکی خۆپیشاندانی سەرتاسەری بکات، بەڵام ئەوان باش ئەو خەڵکەیان دەناسی، دەیانزانی دەکرێت بە دروستکردنی شتێك لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان خەڵکی خەریکی چی دەبن و چی لەبیر دەکەن، ئەوە بوو خەڵکی بە هۆی جیابوونەوەی ئێمەوە لەبیری کردبوو کە وا خەریکە داوای مافەکانی خۆیان دەکەن، ئەوان بەو شێوەیە سیاسەت دەکەن، هەرکاتێك بزانن وا خەریکە خەڵکی بەئا گادێتەوە، خێرا شتێك دروست دەکەن، ڕووداوێك گەورە دەکەن بۆ ئەوەی خەڵك لەبیری بکات داوای چییان دەکرد، کەسێك دێنن و لە ڕاگەیاندنەکانەوە وا نیشانی دەدەن کە مایەپووچ بووە، هونەرمەندێك دێنن لە هاوسەرەکەی جیای دەکەنەوە، حیجاب بە کچێك دەکەن و دواتر خۆیان وای لێ دەکەن حیجابەکە فڕێ بدات، کەسایەتییەکی دیار دەگرن یا بزری دەکەن،








خەڵکیش بێئاگایە لەوەی چی دەگوزەرێت، هەموو ئەوەی خەڵکی لێی ئازایە ئەوەیە بێت و لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان جنێو و قسەی نەشیاو بکات و بێئاگایان بکەن لە ڕاستیی ژیانی خۆیان.

میرا خەریك بوو باسی یاران و بارانی دەکرد، تا ئەوە بوو کاپتنەکە هات و گوتی: ببورن بەڕێزان، بەڵام وا خەریکە شوێنەکە دادەخەین، کاتێك تەماشای کاتژمێرەکەم کرد، سەعات یازدە و نیو بوو. باوەڕم بەوە نەدەکرد، بە جۆرێك چووبووینە ناو بابەتەکەوە، لەبیرمان کردبوو کە کات زۆر درەنگی کردووە، بۆیە بڕیارمان دا سبەی بابەتەکە تەواو بکەین لە هەمان شوێن کە لێی وەستاین.

دوای ئەوەی ماڵئاواییمان کرد لە یەکتری، ڕۆیشتمەوە بۆ کۆمپانیا، سبەی لە کۆمپانیا حاجی کەمال هات و گوتی: ئەندازیار، ئەو پێنجشەممەیە إن شاء الله ئەو پڕۆژەیە کۆتایی پێ دەهێنین و چاوەڕێی پڕۆژەکەی تر دەبین. منیش گوتم: إن شاء الله.

ئیش و کار زۆری نەمابوو، بەڵام دەبوو تۆزێکیش دەستوبرد بکەین بۆ ئەوەی ئەو شتانەی ماوە تەواویان بکەین، بۆیە زۆر ماندوو بووم، کاتێك نوێژی عەسرم کرد، خۆم شۆرد و چووم بۆ ئەوەی تۆزێك بخەوم و ئەو ماندوویێتییەم لە جستە بێتە دەرەوە، دەمزانی خەوی پاش عەسران خراپە، بەڵام چارم نەبوو، زۆر ماندوو بووم، کاتێك هەڵستام، کاتی بانگی مەغریب بوو، ڕۆیشتم دەستنوێژم شۆرد و نوێژم کرد و ڕۆیشتم بۆ هەمان شوێنی جاران،







کاتێک گەیشتم، میرا لەوێ بوو و چاوەڕێی دەکردم. دوای ئەوەی سڵاوم لێ کرد، پێم وت: ببورە خۆ زۆر نییە چاوەڕێمی. وەڵامی دامەوە: نەخێر، منیش تازە گەیشتم.

دوای ئەوەی خواردنمان داواکرد، دەستمان کردەوە بە باسەکەی خۆمان.

میرا بەردەوام بوو، وتی: یاران و باران وا خۆیان نیشان دەدا کە زۆر دڵخۆشن و ضێژ دەبینن لە ژیان، بە جۆرێک قسەکانیان کاریگەریی هەبوو لەسەر منیش، تا وای لێ هات منیش بە جۆرێک لە جۆرەکان خۆم گونجاند لەگەڵ ئەو بارودۆخە، خوێندنەکەم فەرامۆش کردبوو، دوو جار ئاگادارکردنەوەم بۆ هات کە ڕێژەی ئامادەنەبوونم زۆرە، هەردوو جارەکە دکتۆرە ساکار بۆی چاک کردم، بەڵام جۆرێکم لێ هاتبوو، زۆر گرنگیم بە خوێندن نەدەدا. دوو-سێ مانگ تێپەڕی، تا ئەوە بوو ڕۆژێکیان هەواڵێکی سەیرم بینی، بینیم وا نووسراوە کچە مۆدێلی ئەفغانی پەرستۆ لە نەخۆشخانەیە و تووشی ڕووداوی هاتوچۆ بووە و بارودۆخی ناجێگیرە، خێرا پەیوەندیم کرد بە أحلامەوە، ئەویش ئاگاداری ئەوە بوو چی ڕووی داوە، بۆیە بڕیارمان دا بیچین بۆ لای پەرستۆ، بۆ ڕۆژی دواتر من توانیم عەسرەکەی بگەمە ئەفغانستان و بچم بۆ لای پەرستۆ، شەو أحلامیش هات، پەرستۆ بەردەوام دەگریا و تەندروستییشی باش نەبوو، ئێمەش کە ئەومان دەبینی بەو جۆرە ئازار دەچێژێت، بەرگەمان نەگرت و دەستمان کرد بە گریان، پاش

ماوەیەك أحلام لە پەرستۆی پرسی: ئەوە چۆن چۆنی تووشی ئەو ڕووداوە بوویت. پەرستۆ هەرچەندە بەئەستەم دەیتوانی قسە بکات، بەڵام هەر جۆرێك بێت و بە زۆرلەخۆکردن دەستی پێ کرد و گوتی: ئەو کاتەی لە پێشبڕكێكە بووین، پێم گوتن دایك و باوكم پێیان گوتم گەر بەشداری بکەم لەو پێشبڕكێیە ئەوا دەبێت ناوونیشانی ئەو ماڵە لەبیر بکەم، کاتێکیش کە نەمتوانی ببمە شاجوان و بەتێکشکاوی گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، باوکم ڕێگەی نەدا بچمەوە بۆ ماڵ و پێی گوتم من بێبەریم لە تۆ و کچێکم نییە بە ناوی پەرستۆوە، ئیتر منیش سەرگەردان بووم، نەمدازانی چی بکەم، ڕۆیشتم بۆ هۆتێلێکی هەرزان بۆ ئەوەی لێی بمێنمەوە، هیچ کارێك نەبوو بیکەم، بارودۆخی ئابووریم باش نەبوو، تا ئەوە بوو ئێوارەیەکیان ژنێك هات و گوتی: دەمەوێت یارمەتیت بدەم، پێی گوتم تۆ کچێکی جوانی، دڵنیام خەڵکی پارەی باش دەدەن بە تۆ، پێی گوتم کۆمەڵێك کەسانی گرنگ هەن ناسراون، سیاسەتمەدار و بازرگان و هونەرمەند و کەسی دیارن، داوای کچ دەکەن لە ئێمە و پارەیەکی باشمان پێ دەدەن، لەبەرامبەردا ئێمەش شەو کچیان بۆ دەنێرین، تۆش کچێکی جوانی و دوای ئەوەی لە پێشبڕكێی شاجوانی ئاسیا دەر کەوتی، چەند کەسێك داوایان لێ کردووم تۆیان بۆ ببەم و وتوویانە نرخەکەی هەرچەند بێت ئێمە دەیدەین، دەشزانم تۆ چەند پێویستیت بە پارەیە، ئاگادارم کە دایك و باوکت لە ماڵەوە وەدەریان ناوی. کاتێك قسەکانی تەواو کرد،








گوتی: ئەوە بڕی ئەو پارەیەیە کە تەنها بۆ چوونەلای ئەو بەرپرسە دەستت دەکەوێت، کاتێك تەماشای پارەکانم کرد، باوەڕم نەدەکرد بە چاوەکانم، ئەو پارەیە زۆر زۆر بوو، بیرم کردەوە ئەفغانستان بەو بارودۆخە ئابوورییەوە و خەڵکی بەو هەژارییەوە، کەچی بەرپرسێکی چەپەڵ ئامادەیە تەنها بۆ تێرکردنی حەزە پیسەکانی خۆی ئەوەندە پارە بدات بە من. ژنەکە پێی گوتم: کاتی زۆرمان لە بەردەست نییە، گەر ڕازی بیت، بانگی کچەکان دەکەم جلوبەرگت بۆ بهێن و ئامادەت بکەن بۆ ئەوەی بڕۆیت بۆ ئەو شوێنە، چارێکم نەبوو جگە لە ڕازیبوون، چوونکە پارم پێویست بوو، بۆیە ڕازی بووم و ڕۆیشتم، کاتێك گەیشتم و بینیم چ کەسێکە، تووشی سەرسووڕمان بووم، ئاخر ئەو پیاوێکی زۆر زۆر گەورە و ناسراو بوو و پلەی وەزیری هەبوو لە حکومەت، گەر ویستبات بیبینی، لانی کەم دەبوو سێ مانگ پێشتر ئامادەکاریت بۆی کردبایە، کەچی وا ئێستا بەڕووتی بەرامبەر من لەسەر جێگاکە ڕاوەستاوە. دوای ئەوەی حەزە پیسەکانی ئەو تێر بوون و من گەڕامەوە بۆ شوقەکەم، سبەی ژنەکە پەیوەندیی کرد و گوتی: ئافەرین، جەنابی وەزیر زۆر تۆی بەدڵ بووبوو. ئیتر بەو شێوەیە بەردەوام بووم، هەر شەوێك لەلای کەسێك بووم، سێ شەو لەمەوپێش ڕۆیشتم بۆ لای کەسێك، پیاوەکە زۆری خواردبوویەوە، دواتر تووشی گەشکە بوو و کەفی لە دەم دەهاتە دەرەوە، منیش زۆر ترسام، ڕامکردە دەرەوە، کاتێك گەیشتمە سەر شەقام، ئاگام لە خۆم نەمابوو و زۆریش






ترسابووم، کاتێك بەئاگا هاتمەوە، خۆم لەسەر تەختی نەخۆشخانە بینییەوە.

من و أحلام زۆر گریاین بۆ ئەو بارودۆخەی ئەوی تێدایە، دواتر لە ژووری پەرستۆ هاتینە دەرەوە و ڕۆیشتین بۆ لای پەرستارێك و پێمان گوت هەرشتێك بوو ئاگادارمان بکاتەوە، دواتر ڕۆیشتین بۆ شوێنی مانەوەمان، پرسیارم کرد لە أحلام چی دەکەیت و چی ناکەیت، ئاهێکی قووڵی هەڵکێشا و وەڵامی دامەوە و گوتی: هاوسەرگیرم کردووە لەگەڵ کوڕە بازرگانێك، بەڵام هیچ ئاسوودە نیم لەگەڵی، چوونکە دەزانم خیانەتم لێ دەکات، هەرچەندە چەند جارێکیش بە باوك و دایکی ئەوم گوتووە، بەڵام گوێ بۆ قسەکانم ناگرن، بۆیە منیش بێدەنگیم هەڵبژاردووە، دواتر أحلام ڕووی کردە من و گوتی: تۆ چۆنی؟ منیش وەڵامم دایەوە، بارودۆخی منیش لە هیی ئێوە باشتر نیە، دواتر باسی بەشێك لە نەهامەتییەکانی خۆم بۆ کرد. بە هۆی ئەوەی زۆر ماندوو بووبووین بە سەفەرەوە، زوو خەوتین، بەڵام کاتژمێر سێ بوو پەیوەندییەکی تەلەفۆنی هات، أحلام وەڵامی دایەوە، پەرستارەکە بوو، گوتی: ئەو کچەی ئێوە هاتوون بۆ لای نیوکاتژمێر بەر لە ئێستا گیانی لەدەست دا. أحلام ڕاستەوخۆ دەستی کرد بە هاوارکردن و گریان، پاشان بەڕاکردن ڕۆیشتین بۆ نەخۆشخانە، دواتر تەرمەکەمان وەر گرتەوە و تا سبەی چاوەڕوان بووین، بردمان بۆ گۆڕستان و ناشتمان و پاشان بەگریانەوە لەسەر گۆڕەکەی پەرستۆ من و أحلام یەکتریمان لەئامێز گرت و ماڵئاواییمان کرد لە یەکتری.

میرا دووبارە خەریك بوو دەگریا، پاش ئەوە پێی گوتم: دڵنیام لەو قسەیەی ئێستا دەیکەم گەر لەشکرەکان بوونیان نەبایە، ئەمڕۆ گوێت لە وشەی لەشفرۆشەکان نەدەبوو. پاش ئەوەی لە ئەفغانستان گەڕامەوە، لە زانکۆوە هەواڵم بۆ هات کە من دەر کراوم لە زانکۆ. ڕاستی زۆر بەلامەوە گرنگ نەبوو، وا بیرم دەکردەوە و بە خۆم دەگوت گەر خوێندنیش تەواو بکەم، ڕوبعێکی ئەو پارەیەی ئێستا دەستم دەکەوێت لە دەرمانسازی دەستم ناکەوێت. ڕۆژبەڕۆژ خۆم لەبیر دەکرد و زیاتر ئاوێتەی ئەو جیهانە پیسەی ئەوان دەبووم، یاران و باران هەمیشە وایان لێ دەکردم کە وا هەست بکەم خۆشبەختترین کچم، بەردەوام پێکەوە بووین، پێکەوە گەشتمان دەکرد، پێکەوە بەرنامەمان دەکرد، هەموو شتێکمان پێکەوە بوو، وا نیشانی خەڵکیمان دەدا ئێمە بەختەوەرترین کچین و هەرکەسێك وەکوو ئێمە بێت دڵخۆشە و دەزانێت تام و چێژی ژیان چییە و هەرکەسێك و کچێك وا نەبێت، ژیانی نییە، ئەندازیار بەسەرهاتی ڕێوییە کلکبڕاوەکەت بیستووە؟ ڕێگەم بدە بۆتی باس بکەم. ((دەگێڕنەوە جارێك کلکی ڕێوییەکیان بڕیبوو، هەموو ڕێوییەکان لێی کۆ بوونەوە و پێیان گوت: کوا کلکت؟ وەڵامی دانەوە: خۆم بڕیومە، ئێستا ئازادم و جەستەم زۆر سووکە و کاتێك بە پێ دەڕۆم وا هەست دەکەم دەفڕم. یەکێك لە ڕێوییەکان فریوی خوارد و کلکی خۆی بڕی، بەڵام زۆر ئازاری دەدا و ڕۆیشت بۆ لای ئەو ڕێوییەی کلکی بڕابوو، پێی گوت: تۆ بۆ درۆت کرد؟ من لەتاو ئازارەکەم

ژیانم نەماوە، خەریکە دەمرم. ڕێوییە کلکبڕاوەکە وەڵامی دایەوە: بێدەنگ بە بارێوییەکانی تر گاڵتەمان پێ نەکەن، بەردەوام وا خۆت نیشان بە کە دڵخۆشیت و ئاسوودەیت، با ژمارەمان زیاد بکات، وای لێ هات ژمارەی کلکبڕاوەکان ئەوەندە زیادی کردبوو، گاڵتەیان بەو ڕێوییانە دەکرد کە کلکیان هەیە)). ڕێك ئەوە ژیانی ئێمەیە، تەنها نیماییشکەرێکی ساختەین، وا خۆمان نیشان دەدەین کە دڵخۆشین، بەڵام وەڵاهی ئێمە خەمبارترین و دڵتەنگترین چینی کۆمەڵگاین، زۆرێکمان بۆ ئەوەی تۆزێك هەست بە دڵخۆشی بکەین، پەنا دەبەینە بەر مادده هۆشبەرەکان و حەپ خواردن، گەر بڵێم لە سەددا هەشتای زیاتری ئەوانەی مۆدێلن و هونەرمەندن لە خەمۆکییەکی قورسدا ژیان دەکەن. ئێستا پێم بڵێ، ئایە ئەو ژیانەی من بۆم باس کردی و پێیدا تێپەڕیوم، دەکرێت کچێك تێیدا هەست بە دڵخۆشی بکات.

میرا بزەیەکی کرد و گوتی: ئەندازیار، ئەوە هەموو ئەوە بوو کە من بۆم باس کردی و بەڵێنەکەی خۆم گەیاندە جێ، هیوادارم تۆش بتوانی وەڵامی پرسیارەکانم بدەیتەوە.

منیش وەڵامم دایە: دڵنیا بە لەوەی منیش بەڵێنەکەی خۆم بەجێ دەگەیەنم.

شەو درەنگی کردبوو، بڕیارمان دا لە سبەییەوە وەڵامی پرسیارەکان بدەمەوە، بەڵام کاتەکەمان گۆڕی و بڕیارمان دا سبەی سەعات پێنج یەکتری ببینین.

دوای ئەوەی میرا ڕۆیشت، ماوەیەك من لەسەر مێزەکە مامەوە، ترسم هەبوو لەوەی ئاخۆ دەتوانم وەڵامانێك بدەمەوە کە بتوانن تینوویێتیی دڵە تینووەکەی میرا بشکێنن، وەڵامانێك بن کە میرا دەیەوێن، وەڵامانێك بن کە بتوانن ببنە هۆی ڕزگاکردنی میرا لەناو ئەو دونیا پیسەی تێی کەوتووە، بەردەوام لەناو ئەو بیرکرنەوەنەدا بووم تاوەکوو گەیشتمەوە بۆ کۆمپانیا، دوای ئەوەی نوێژی عیشام کرد، داوام لە خوا کرد یارمەتیم بدات لەوەی بتوانم گەر هیچ نەبێت ببمە هۆی ڕزگارکردنی کەسێك و دەستگرتنی کەسێك لە تاریکییەوە بیهێنم بەرەو ڕووناکیی ئیمان.

سبەی زوو هەستام لە خەو، بۆ ئەوەی ئەو دوو ڕۆژەی ماوە بتوانین کارەکان تەواو بکەین و پرۆژەکە پێشکەشی حکومەت بکەینەوە، چەندە بیرم لای کارەکەم بوو، دوو ئەوەندە بیرم لای ئەو پرسیارانە بوو کە میرا کردبوونی و دەبوو منیش وەڵامم دابانەوە، کات خێرا دەڕۆیشت، ئەوە بوو بۆ نوێژی عەسر ڕۆیشتمەوە بۆ ژوورەکەم و جلەکانم گۆڕی و بەرێ کەوتم بەرەو هەمان ئەو خواردنگەیەی کە پێشتر لەوێ چاومان بە یەکتری دەکەوت. کاتێك گەیشتم میرا هاتبوو، کە سەیری میرام دەکرد، لە ڕۆژانی پێشووتر زۆر بەپەرۆشتر دیار بوو، دوای ئەوەی سڵاوم لێ کرد، ئەویش سڵاوەکەی وەڵام دایەوە، لێم پرسی:

ـ ئەمڕۆ جیاوازتر لە ڕۆژانی تر دەتبینم، شتێکی نوێ هەیە؟





بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دامەوە و گوتی:

ـ تینووم، تینووی ئاو نا، تینووی دڵخۆشی و ئاسوودەیی و هەستکردن بە بەختەوەری، دەزانیت چەندێکە لە دڵەوە پێنەکەنیوم، دەزانی چەندێکە هەستم بە دڵخۆشیی ڕاستەقینە نەکردووە، ئێستاش وەکوو ئەو کەسە وام کە لە بیاباندا لە دوورەوە ئاوێك دەبینێت، بە ئاواتەوەیە تراویلکە نەبێت و ئاوێکی ڕاستەقینە بێت و تینوێتیی بشکێنێت، منیش ئاوام، لەوەتەی تۆ گوتووتە کە دەتوانی وەڵامی پرسیارەکانم بدەیتەوە، بەو شێوەیە تامەزرۆم، ئێستا وا خەریکە لە دوورەوە ئومێدێك هەیە لە کۆتاییدا لەو بیابانە پڕ لە دڕکوداڵە ڕزگارم بێت و بگەمە شوێنێك کە بەهارێکی نوێ بهێنێتە ژیانمەوە. ئێستاش لەوە زیاتر حەز ناکەم قسە بکەم، حەز دەکەم تۆ دەست بکەیت بە وەڵامی پرسیارەکانم، نازانم پرسیارەکانت بیر ماوە یان نا؟

ـ بەڵێ، بیرم ماون. بەڵام حەز دەکەم من بە شێوازێکی جیاواز وەڵامی پرسیارەکانت بدەمەوە، ئەویش لە ڕێگەی باسکردنی گرنگیی ئافرەت لە کچێکی بچووکەوە تاوەکوو دەبێتە دایکێکی بەساڵداچوو لە ئایینی ئیسلامدا.

ـ کەواتە زۆر باشە، با دەست پێ بکەین، چۆن ئاسوودەی بەو شێوەیە وەڵام بدەوە، گرنگ ئەوەیە من وەڵامەکانم دەست بکەوێت.

ـ بسم الله، بە ناوی ئەو خوایەی کە دروستکەری گشتمانە، هەمووشمان دەبێت بۆ لای ئەو بگەڕێینەوە. پێش ئەوەی باسی

ئافرەتت بۆ بکەم لە دینی ئیسلام، ڕێگەم پێ بدە باسێکی ژنت بۆ بکەم پێش هاتنی ئیسلام و بارودۆخی چۆن بوو لە کۆمەڵگادا و خەڵکی چۆنیان لە ژن دەڕوانی. بۆ ئەوەی ڕوون بێت و بزانین کێ نرخ و قەدری ژنی زانیوە و ڕێزی لێ گرتووە و کێش سووکایەتیی پێ کردووە و بە چاوێکی کەمتر لە پیاو تەماشای کردووە. کێیە شەڕی کردووە لەسەر مافەکانی ژن و جەنگاوە بۆ ئازادیی ڕاستەقینەی ژنان و کێش ژنی کردووە بە کۆیلە و نەهێشتووە ژنان دەنگ بەرز بکەنەوە و داوای مافەکانی خۆیان بکەن؟ ئایە کامەیان یەکسانیی ڕاستەقینە دابین دەکەن بۆ ئافرەت. ئایینی ئیسلام یان ئەو ڕێکخراوانەی بە ناو خۆیان ناو ناوە ڕێکخراوەکانی بەرگریکردن لە مافەکانی ژنان؟ ئایە ئەوەی ئەو ڕێکخراوانە بانگەشەی بۆ دەکەن، تا چەند خزمەتی کردووە بە ژن و ژنی پاراستووە؟

- ئەوەیان هەر شتێکی زۆر باشە، بۆ ئەوەی بەتەواوەتی و بەیەکجاری ڕەش و سپیم لەلا دەر کەوێت.

- پاش ئەوەی پەروەردگار ئادەم و حەوای ڕەوانە کرد بۆ سەر زەوی، هێواش-هێواش نەوەکانیان دەستیان کرد بە زۆربوون و تا ئەوەی بوون بە میللەت و نەتەوەی جیاواز و لە شوێنی جیاواز نیشتەجێ بوون. شەیتان لەگەڵیان بوو، هەمیشە لە دەرفەتێک دەگەڕا نەوەکانی ئادەم لەخشتە بەرێت و ڕێگای ڕاستیان لێ ون بکات. بۆیە وردەوردە دەستی کرد بە لادانیان لەسەر ڕێگای ڕاستی

و ڕەنگە یەکەم شتێکیش کە کردبێتیان بریتی بووبێت لە تێرکردنی ئارەزووەکانیان و دواکەوتنی حەزەکانیان و ئەنجامدانی زینا و بەدڕەوشتی، لەو ساتەوە مرۆڤ درکی بەوە کرد کە پیاوان خاوەن هێز و توانایان هەیە بەسەر ژندا، بۆیە دەستیان کرد بە چەوساندنەوە و ئازاردان و بەکارهێنانیان وەکوو خزمەتکار و کاڵایەك تەنها بۆ تێرکردنی حەزەکانیان، پێنەدانی خۆراك و تەنها ئەو خواردنە نەبێت کە لە خۆیان زیاد بووە، بارودۆخ بەو شێوەیە درێژەی کێشا، جۆرەکانی سزادان پێشکەوتووتر بووبوون، تاوەکوو ئەوەی دەستیان چوویە کوشتنی ژنەکانیان، ئەمە بارودۆخی ژن بوو لەناو میللەتە جیاوازەکانی جیهان، گەل و نەتەوەکان ڕای جیاوازیان هەبوو لەسەر ژن، بەڵام لەسەر سزا و ئەشکەنجەدانی ژنان کۆك بوون. ئەغریقییەکان کە لە کۆنترین گەلەکانی جیهانن، باوەڕیان وا بوو ژن دارێکی ژەهراوییە، کڕین و فرۆشتنی پێوە دەکرا وەکوو هەرشتێکی تر لە بازاڕدا. ڕۆمانییەکان دەیانگوت ژن ڕوحی نییە، گەر ویستبایان سزای ژنێك بدەن، ئەوا زەیتی سوورەوەکراویان پێدا دەکرد یان دەیانخستە دووی ئەسپێك تاوەکوو دەمرد. چینییەکان باوەڕیان وا بوو ژن دوای مردنی پیاوەکەی دەبێت بەزیندوویی بنێژرێت. لای هیندییەکانیش بارودۆخی ژن لە گەلەکانی تر باشتر نەبوو، بە هەمان شێوە بە شێوەیەکی ئێجگار خراپ لە ژنانیان دەڕوانی و باوەڕیان وا بوو دەبێت چۆن کاتی مردنی پیاوەکەی کە دەسووتێنرێت، ئەویش بسووتێنرێت. فارسەکان ڕێگەیان بە خۆیان

دابوو کە هاوسەرگیری بکەن لەگەڵ مەحرەمەکانیان. جوولەکەکان پێیان وا بوو ژن نەفرەتە، چوونکە هۆکارێکە بۆ لەخشتەبردنیان و پیسە لە کاتی سووڕی مانگانە و دەستی بەر هەرشتێك بکەوێت ئەو شتەش پیس دەکات و ئەو کاتەی ژن لە سووڕی مانگانەدا بوو، بۆی نەبوو لەناو ماڵدا بژیایە، دەبووایە بچێت لە شوێنی ئاژەڵەکان ژیانی کردبایە، تاوەکوو سووڕی مانگانەی تەواو دەبێت. عەرەبەکانی پێش ئیسلام بە جۆرێك ڕقیان لە ژن بوو، هەر وەکوو ڕقی پیاوێك لە مردن و بەزیندوویی زیندەبەچاڵیان دەکردن، ڕەنگە ئەوەی تا ئێرە بۆم باس کردی ئازاربەخش بێت و باوەڕکردنی قورس بێت، بەڵام لەوە قورستر و ئازاربەخشتر ئەوە بوو کە فەرەنسییەکان ئەنجامیان دا لە کۆبوونەوەیەك لە ساڵی ٥٨٦ زایینی، کە تێیدا باس لەوە دەکرا ئایە ژن وەکوو پیاو مرۆڤە یان مرۆڤ نییە! ئایە ڕوحی هەیە یان بێڕوحە؟ گەر ڕوحی هەیە، ڕوحی ئاژەڵە یان مرۆڤ؟ گەر ڕوحی مرۆڤیشی تێدا بێت، ئایە لە ئاستی ڕوحی پیاودایە یان کەمترە؟ لە کۆتاییدا گەیشتنە ئەوەی کە بەڵێ ژنیش مرۆڤە، بەڵام دروست کراوە بۆ خزمەتکردنی پیاوەکەی. پەرلەمانی ئینگلتەرا لە سەردەمی هێنریی هەشتەم بڕیارێکی دەرکرد بەوەی ژن بۆی نییە (کتێبی پیرۆز) بخوێنێتەوە، چوونکە پیسە. ئێستا با بەدیاریکراوی ڕاست باسی بارودۆخی ژن بکەین پێش هاتنی ئیسلام لەنێو عەرەبەکان، ژن لای ئەوان شتێك بوو جێگای شەرم بوو، مێبوون تاوان بوو، گەر کەسێك

لە کاتی لەدایکبوونی منداڵەکەی هەواڵی بۆ هاتبایە کە ژنەکەی کچێکی بووە، دەڕۆیشتە ژوورێك و بۆ ماوەیەك نەدەهاتە دەرەوە، یان ڕاستەوخۆ دەڕۆیشت ئەو کچەی زیندەبەچاڵ دەکرد. خوای گەورە ئەو دیمەنەمان زۆر جوان بۆ باس دەکات لە قورئانی پیرۆز و دەڵێت: ﴿وَإِذا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالْأُنْثى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ۝ يَتَوارى مِنَ الْقَوْمِ مِنْ سُوءِ ما بُشِّرَ بِهِ﴾ سورەتی النحل ئایەتی ٥٨.

دەزانی واتای ئەو ئایەتەی ئێستا بۆم خوێندییەوە چییە؟ ئەوەیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ((گەر یەکێك لەوان مژدەی بۆ هاتبایە بەوەی کە ئەو منداڵەی لەدایك بووە کچە، ئەوا لە ناخۆشیی ئەو هەواڵە ڕەنگی ڕوخساری دەگۆڕا و زۆر دڵگران و خەمبار دەبوو و خۆی دەخواردەوە لە ناخۆشیی ئەو هەواڵەی پێی دراوە و ماوەیەك خۆی لە خەڵکەکە دەشاردەوە و خۆی دادەبڕاند)). ژن لای ئەوان هەر وەکوو پارە و ئاژەڵ تەنها کاڵایەك بوو کڕین و فرۆشتنیان پێوە دەکرد، ژن بۆی نەبوو میرات وەربگرێت و هیچ حەقێکی نەبوو لای مێردەکەی، ژمارەی تەڵاقەکان دیاریکراو نەبوون، ژمارەی ژنەکانی دیاریکراو نەبوون، کاتێکیش مێردەکەی دەمرد، دەبووایە خراپترین جلوبەرگ بپۆشێت و نینۆکەکانی چاك نەکات و خۆی پاك نەکاتەوە و قژەکانی شانە نەکات و کاتێکیش باوك دەمرد، کوڕە گەورەکە ژنی باوکی مارە دەکردەوە. لە یەك کاتدا کۆمەڵێك پیاو پێکەوە دەڕۆیشتن لەگەڵ ژنێك جووت دەبوون و پاشان کە منداڵەکە لەدایك دەبوو، ژنەکە بە ئارەزووی خۆی کەسێکی وەکوو باوکی








منداڵەکە هەڵدەبژارد و پیاوەکانیش بۆیان نەبوو ڕەتی بکەنەوە. یان هەندێك ژنەکانی خۆیان دەنارد بۆ ئەوەی سەرجێیی بکەن لەگەڵ کەسایەتییە گەورە و دیارەکان بۆ ئەوەی کوڕێکیان ببێت سیفەت و تایبەتمەندیی کەسەکە هەڵبگرێت. یان هاوسەرگیریی کاتی تەنها بۆ چێژوەرگرتن. هەموو ئەوانەی ئێستا بۆم باس کردیت هەمووی تێڕوانینی نەتەوە و دینە جیاوازەکان بوون بەرامبەر ئافرەت، بەڵام لە ئێستاوە باسی ئافرەتت بۆ دەکەم لە دینە جوانەکەی ئێمە کە دینی ئیسلامە و بۆت باس دەکەم کە ئایینی ئێمە چۆن لە ژن دەڕوانێت و چ پەیامێك و تێڕوانینێکی هەیە بەرامبەر بە ژن.

میرا بەسەرسامییەوە پریسی:

ــ هەر بەڕاست، پێشتر بەو شێوەیە مامەڵە دەکرا لەگەڵ ژن؟

ــ بەڵێ، گەر خراپتر نەبووبێت، باشتر نەبووە. بەڵام سوپاس بۆ خوا پاش ئەوەی دینی ئیسلام هات، بارودۆخەکە تەواو گۆڕدرا، خوا لە ڕێگەی کتێبە پیرۆزەکەیەوە کە بۆ پێغەمبەرمانی نارد پێگە و جێگای بەرزی بۆ ئافرەت دانا و کردیە هاوشانی پیاو و ئەو شوێنەی پێ دا کە شایانی بوو، ڕزگاری کرد لەوەی وەکوو کۆیلە و ژێردەستەی پیاو تەماشا بکرێت، بۆیە لە قورئانی پیرۆز گەر سەرنج بدەین لە چەندەها شوێن خوای گەورە ناوی ژنی لەگەڵ پیاو هێناوە و بگرە لە هەندێك شوێن ژنی پێش پیاو خستووە. دەمەوێت هەندێك لەو ئایەت و فەرموودانەت بۆ باس بکەم کە خوا و پێغەمبەر باسیان لە گرنگیی ئافرەت کردووە و داوایان لە پیاوان

کردووە بە باشە مامەڵەیان لەگەڵ بکەن، سەرەڕای ئەوەی یەکێك لە گەورەترین سورەتەکانی قورئان بە ناوی ژنانەوەیە (النساء) و سورەتێکی تریش بە ناوی (مریەم)ەوەیە. دەمەوێت ئەوەشت لا ڕوون بێت، باشترین کەسێك ئێمە وەکوو نموونە وەری بگرین و چاوی لێ بکەین بۆ مامەڵکردن لەگەڵ ئافرەت و هەموو شتێکدا بریتییە لە پێغەمبەرمان محمد(ﷺ)، ئەو باشترین پێشەنگە بۆ ئێمە. خوای گەورەش لە وەسفی ئەودا دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾ سورەتی ئەنبیاء ئایەتی ١٠٧. خوا ئامانجی خۆی بە پێغەمبەر فەرموو و پێی گوت: ((بەڕاستی تۆمان تەنها بۆ ئەوە ناردووە ببیتە ڕەحمەت و مایەی خێر و خۆشی بۆ هەموو شتێك)). ڕاستە دینێکە بۆ ڕزگاکردنی مرۆڤایەتی بە نێر و مێیەوە و ڕێنموونیکردنیان بۆ ڕێگای ڕاست هاتووە، بەڵام ڕەنگە هەڵە نەبم گەر پێت بڵێم بەشێکی هەرە زۆری ئەو ڕەحمەتە بەر ئافرەتان کەوتووە، جگە لەوەی مرۆڤەکانی ڕزگار کرد لە بەندایەتیکردنی مرۆڤ بۆ مرۆڤ بۆ بەندایەتیکردنی بەندە بۆ دروستکراوی خۆی و ڕزگارکردنی ئافرەت لەو ستەم و ناخۆشییانەی لەناو کۆمەڵگای ئەو کاتەدا تووشی بووبوو. هەر بۆیەش لە چەندین شوێنی قورئاندا و لە چەندین فەرموودەدا ئەوە دەبینین خوای گەورە نێر و مێی هاوشانی یەکتری باس کردووە. خوای گەورە لە چەندین شوێنی قورئاندا پێمان دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ

عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ واتا: ((ئەی خەڵکینە، بێگومان ئێمە هەمووتانمان لە نێر و مێیەك دروست کردووە (کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە) و کردوومانن بە چەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە. بەڕاستی بەرێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتانە کە زۆرتر لەخواترسە و فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا خۆی زانا و ئاگایە بە هەمووان)) سورەتی الحجرات ئایەتی ١٣. لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت: ﴿فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ﴾ واتا: ((خوا وەڵامی ئەوانەی دایەوە کە هانا و هاواریان بۆلای ئەو بردبوو و پێی فەرموون: بەڕاستی من هەوڵ و کۆشش و کار و کردەوەی هیچکام لە ئێوە بەزایە نادەم، چ نێرینە و پیاوتان، چ مێینە و ئافرەتتان (چونکە) هاوکاری یەکتر بوون لە چاکە و چاکەکاریدا)) ئالی عیمران ئایەتی ١٩٥. لە جێگایەکی تردا دەفەرموێت: ﴿قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ (٣٠) وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ...﴾ واتا: ((ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بە پیاوانی ئیماندار بڵێ: چاویان بپارێزن (لە سەرنجدانی ئافرەتانی نامەحرەم) هەروەها نامووس و عەورەتی خۆیان لە حەرام بپارێزن، بێگومان ئەوە پاکتر و پوختترە بۆیان (بۆ دڵ و دەروون و ڕواڵەت





و ڕوح و لاشەیان) بەڕاستی خوا ئاگادارە بەو هەڵسوکەوت و ڕفتارانەی کە دەیکەن(٣٠) بە ئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ: چاویان بپارێزن (لە تەماشاکردنی نامەحرەم) داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناهـ...)) سورەتی نور ئایەتی ٣٠ و ٣١. لە چەند جێگایەکی تردا خوای گەورە دەیەوێت گەورەیی دایك و باوکمان نیشان بدات، بۆیە دەفەرمووێت: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا﴾ واتا: ((پەروەردگار فەرمانی پێ کردوون جگە لەو کەسی تر نەپەرستن، هەروەها بڕیاری داوە چاکەکاریش بن لەگەڵ دایك و باوکتان، هەرکاتێك یەکێکیان یان هەردووکیان بە پیری کەوتنە لای تۆ (تەنانەت) ئۆفیان لە دەست مەکە و (هەرگیز) پێیاندا هەڵمەشاخێ و هاواریان بەسەردا مەکە، بەردەوامیش قسە و گفتوگۆت لەگەڵیاندا با چاك و جوان و بەجێ بێت)). سورەتی الاسراء ئایەتی ٢٣. هەر لە باسی دایك و باوکدا لە شوێنێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾ واتا: ((ئێمە فەرمانمان داوە بە ئادەمیزاد بە چاکە ڕفتار بکات لەگەڵ دایك و باوکیدا، دایکی ئێش و ئازار و لاوازی و بێتاقەتییەکی زۆرەوە (بە پێستی سکی نۆ مانگ) هەڵی گرتووە. بڕینەوەشی لە دوای دووساڵە، فەرمانمان پێ دا کە ئەی ئینسان، سوپاسگوزاری منیش و دایك و باوکیشت بە، دڵنیا بە گەڕانەوەتان

هەر بۆ لای منە)). سورەتی لوقمان ئایەتی ١٤. ئێستاش با بچینە خزمەتی پێغەمبەرمان(ﷺ) بزانین ئەو چۆن باسی ئافرەتی کردووە. لە زۆر شوێن و جێگا باسی ئافرەتی کردووە، لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: (إنما النساء شقائق الرجال) واتا: ئافرەت بەشێکە لە پیاو و هاوەڵی پیاوانن. لە جێگایەکی تردا و لە حەجی ماڵئاواییدا یەکێك لەو شتانەی زۆری خەم بوو، بریتی بوو لە ئافرەتان، بۆیە فەرمووی: (أستوصوا بالنساء خيرا) واتا: لەگەڵ ئافرەتان باش بن. لە جێگایەکی تردا دەفەرموێت: (لا يكرم المرأة إلا الكريم، ولا يهين المرأة إلا اللئيم) واتا: ڕێزدار نەبێت ڕێزی ئافرەت ناگرێت، بێڕێزییشی بەرامبەر ناکات مەگەر کەسێکی بێڕێز نەبێت.

من بەردەوام بووم لە قسەکانم کاتێك گوێبستی بانگی مەغریب بووم، بۆیە بە میرام گوت: من دەچم نوێژ دەکەم، تۆش داوای خواردن بکە.

میرا وەڵامی دایەوە: چی بۆ تۆ داوا بکەم.

منیش زەردەخەنەیەکم بۆ کرد و پێم گوت: چیت بۆ خۆت داوا کرد، ئەوەش بۆ من داوا بکە.

میراش بە بزەیەکەوە گوتی: زۆر باشە.

دوای ئەوە من ڕۆیشتم نوێژ بکەم و کاتێك گەڕامەوە، بینینم میرا داوای مەندیی (خواردنێکی یەمەنییە) کردبوو، لە کاتی نانخواردندا من دەستم کردەوە بە تەواوکردنی قسەکانم، پێم گوت:







-ئەوەی تائێرە بۆم باس کردیت گرنگیی ئافرەت بوو بە شێوەیەکی گشتی لە دینی ئێمەدا، کە دیینی ئاشتی و پێکەوەژیانە. ئێستاش با بێین بەتایبەتی و پلەبەپلە لە کچێکی بچووکی نازدارەوە تاوەکوو دەبێتە کچێکی پێگەیشتوو و کاتی شووکردنی دێت و دوای ئەوەی دەبێت بە دایك و بەتەمەندا دەچێت باس بکەین. ئافرەتان بۆ پیاوان ڕەحمەتن، سەیرکە کاتێك کچ دەبێتە هۆی ئەوەی خوا لە دایك و باوکی خۆش ببێت و خوا بە هۆی کچەوە دەرگاکانی دۆزەخ دادەخات لەسەریان و کاتێکیش پێدەگات و هاوسەرگیری دەکات، دەبێتە هۆی تەواوکردنی نیوەی ئیمانی هاوسەرەکەی، کاتێکیش دەبێت بە دایك دەبێتە هۆی ڕێگریکردنی لە چوونی منداڵەکانی بۆ دۆزەخ، چوونکە بەهەشت لەژێر پێی دایکاندایە وەکوو پێغەمبەرمان لە فەرموودەیەکدا باسی دەکات. لە کاتێکدا خەڵکی شەرمیان لە بوونی کچ دەکرد، خوا کچی کردە خەڵاتی پێغەمبەری ئازیزمان، نەك کچێك، بگرە کۆمەڵێك کچ، لەوانە (زەینەب و ڕوقیە و أم کلسوم و فاتیمە)، هەموو ئەو کچانەشی لە ئازیترین و خۆشەویستترین خێزانی بوون کە دایکمان خەدیجەیە، ڕەزای خوای لێ بێت، هەمووشیان گەورە بوون و شوویان کرد، ڕاستە خوا کوڕیشی دا بە پێغەمبەر، بەڵام تەمەنی کوڕەکانی کورت بوو و هەر بە تەمەنێکی زۆر کورت بۆ لای خۆی دەیبردنەوە، پێغەمبەر کچەکانی زۆر خۆش دەویست و زۆریش ڕێزی دەگرتن، تەنانەت کاتێك دەهاتن بۆ لای، لەبەریان هەڵدەستا و ماچی دەکردن و بە گوڵی ناو دەبردن

و فەرمانی دەکرد بە خەڵکی و دەیفەرموو: (لا تکرهوا البنات، فإنهن المؤنسات الغالیات) واتا: رقتان لە کچان نەبێتەوە (خۆشتان بوێن)، چوونکە کچەکان دڵخۆشکەری (خێزان و خانەوادەن) و ڕێزدار و بەهادارن. هەروەها پێغەمبەر هانی موسڵمانانی داوە بەوەی کە ئەگەر بێت و کەسێك کچی بوو و باش پەروەردەی کردن و گەورەی کردن و بەباشی بەرێی کردن بۆ ماڵی مێردی خۆی، ئەوا بەهەشتی بۆ مسۆگەرە، وەکوو لە فەرموودەیەکدا دەفەرمووێت: ((مَن عالَ جاریتینِ حتی تبلُغا، جاء یومَ القیامة أنا وهو کهاتین) وضمَّ أصابعه)) واتە: هەرکەسێك دوو کچ بەخێو بکات تاوەکوو باڵغ دەبن، لە ڕۆژی قیامەتدا کە دێت من و ئەو ئاواین لە بەهەشت (پەنجەکانی هێنایە تەنیشت یەکتر).

ئینجا ئەو کچە کە تەمەنی گەورە دەبێت و دەگاتە تەمەنی پێگەیشتن، خوا فەرمانی پێ کردووە کە خۆی داپۆشێت و حیجاب بکات، تۆش پرسیت ئیسلام بەزۆر حیجاب بە کچ و ژنان دەکات، پێت دەڵێم نەخێر، لە ئایینی ئێمەدا زۆرلێکردن نییە، بەڵام کاتێك کەسێك باوەڕ بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی دێنێت و بانگەشەی ئەوە دەکات کە گوایە خوا و پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت، ناکرێت سەرپێچیی ئەوانیش بکات و لە قسەی ئەوانیش دەربچێت، چوونکە خوا فەرمانی کردووە کە دەبێت خۆیان داپۆشن، ئایە تۆ گەر خاوەنی شتێکی بەنرخ بیت، چیی لێ دەکەیت؟ بێگومان هەوڵ دەدەیت ئاگاداری بیت و کەس نەیبینێت، تەنها کەسانێك کە

متمانەت پێیان هەیە و لە تۆوە نزیکن. یا با بێین باسی ئەوە بکەین تۆ دەڕۆیت بۆ بازاڕ، مۆبایلێکی جوانی گرانبەها دەکڕیت، بەڵام ڕاستەوخۆش داوا لە کەسەکە دەکەیت بەرگێك و درعێکت پێ بدات. باشە گەر لێت بپرسن بۆچی بەرگی بۆ دەکڕیت و درعێك لە شاشەکەی دەدەیت؟ دڵنیام تۆ بێ ئەوەی دوودڵ بیت دەڵێیت بۆ ئەوەی مۆبایلەکەم پارێزراو بێت لە هەر زیانێکی دەرەکی. باشە مۆبایلێك ئەوەندە گرنگی پێ بدەیت و هەوڵی پاراستنی بدەیت و لەلات بەنرخ بێت، کە مۆبایل شتێکی ئەوەندە گرانبەهاش نییە، ئایە ئافرەت کە خوا ڕێزی لێ ناوە و لە جوانترین و باشترین شێوەدا دروستی کردووە، ئەولاتر نییە بەوەی خۆی بپارێزێت و خۆی داپۆشێت؟ ئافرەت لای ئێمە بەنرخە، پیرۆزە، بێنە بەرچاوت باخێك گەر پەرژین کرابێت و باش داپۆشرابێت، کەس ناتوانێت لێی نزیك بکەوێتەوە و بچێتە ناوی، مەگەر لە ڕێگەی دەرگایەکەوە نەبێت، بەڵام گەر هات و هیچ پەرژینێك نەبوو، هەموو کەسێك و هەرکاتێك بیەوێت دەچێتە ناو باخەکە، تاوەکوو ڕۆژێك دادێت وا هەست ناکەیت ئەوە باخ بووبێت، چوونکە هیچ شتێکی لە باخ ناچێت، بەڵام باخێك کاتێك بە پەرژین دەورە دراوە، ڕۆژبەڕۆژ جوانییەکەی زیاد دەکات، ئەوەش وەڵامێکە بۆ ئەوانەی دەڵێن حیجاب جوانیی ئافرەت کەم دەکاتەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە، حیجاب هەم جوانیی ئافرەت و ڕێز و نرخی ئافرەتیش لە چاوی پیاواندا زیاد دەکات. بۆیە فەرمانکردن بە پۆشتەیی ئافرەت لە

سوودی ئافرەتە، ستەم نییە لە ئافرەت، بەڵکوو بۆ پاراستنی ئافرەتە لە دەست پیاوی برسی و هەوەسباز. گەر سەیرێکی وڵاتانی ڕۆژئاوا بکەین، دەبینین ئەو ئافرەتانەی لە دەرەوە کار دەکەن زۆربەی هەرە زۆری بە هۆی جلەکانیانەوە گێچەڵ و دەستدرێژییان دەکرێتە سەر، چوونکە کاتێك ژنێك جلێکی نیمچەڕووت لەبەر دەکات، گەر ڕاستەوخۆش نەبێت، ئەوا ناڕاستەوخۆ پیاو وا تێدەگات کە ئەو ژنە دەڵێت تەماشام بکەن. بۆیە خوا لە پێناو ئاسوودەیی ژنان فەرمانی پێیان کردووە کە خۆیان پۆشتە بکەن.

تۆ وتت کە ئایینی ئێوە ڕێگریی کردووە لەوەی کچ و کوڕ یەکتریان خۆش بوێت و لەگەڵی دەربچێت و بیناسێت و بزانێت ئەو کەسە شایانی ئەوەیە ببێتە هاوسەر و باوکی منداڵەکانی. بەڵام من پێت دەڵێم ئایینی ئێمە ڕێگریی لە خۆشەویستی نەکردووە، بەڵکوو ئایینی خۆشەویستییە، بەڵکوو پێغەمبەر پێمان دەفەرموێت لە فەرموودەیەکدا: (لم یر للمتحابین مثل النکاح) واتا: نەمبینیوە باشتر بۆ دوو کەس کە یەکتریان خۆش بوێت، جگە لە هاوسەرگیری. خۆشەویستی حەرام نییە، بەڵام ئەوەی خەڵکی بە ناوی خۆشەویستییەوە دەیکات حەرامە، گەر خۆشەویستی حەرام بایە، بۆچی خوا مەرجی هاوسەرگیریکردنی داناوە بەوەی دەبێت کچەکە ڕازی بێت و نابێت بەزۆر درابێت بە شوو، وەکوو پێغەمبەر لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: (لا تنکح البکر حتی تُستَأذن، قالوا: یا رسول الله، فکیف إذنها قال: أن تسکت) واتە: کچ مارە ناکرێت





تاوەکوو مۆڵەتی لێ وەر نەگیرێت، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) مۆڵەت لێوەرگرتنی چۆنە؟ فەرمووی: بێدەنگبوونیەتی (چوونکە جاری وا هەیە کچ شەرم دەکات بڵێ: دەمەوێت شوو بە فلان کەس بکەم). بەڵام خۆشەویستیی نێوان کوڕ و کچیش کۆمەڵێك ڕێگا و بنەمای خۆی هەیە. ئەوە خۆشەویستی نییە تۆ بێیت بە ناوی خۆشەویستییەوە کچ بێ جلوبەرگ بکەیت، یاری بە عیزەت و کەسایەتیی بکەیت و پێی ڕاببوێریت، بەڵکوو ئەوە خۆشەویستییە ئەگەر خۆشەویستەکەت لەبەرامبەرت وەستابێت، بوێریی ئەوەت نەبێت سەر هەڵبڕی و تەماشای بکەیت، ئەوە هیچ دەستلێکدان هێڵی سوورە، ئەوە خۆشەویستی نییە تۆ چەند ساڵێك لەگەڵ کەسێکدا بیت و دواتریش دڵی بشکێنی و جێی بهێڵیت، گەر سەیرێکی ئەورووپا بکەین، دەبینین هیچ سنوورێك نییە و هەردوو ڕەگەز بە ئارەزووی خۆیان لەگەڵ یەکتری ڕادەبوێرن و لەگەڵ یەکتری لە یەك شوێن دەمێننەوە و لەگەڵ یەکتری دەخەون و منداڵ دەخەنەوە و تەنانەت بە یاسا ئەمەیان ڕێگە پێ داوە بەوەی دوو کەس، کچ و کوڕ، دەتوانن پێش هاوسەرگیری بۆ چەند ساڵێك پێکەوە بژین و پێکەوە بخەون و منداڵ بخەنەوە، گەر زانییان پێکەوە دەگونجێن، ئەوا هاوسەرگیری دەکەن، گەر نا، لە یەکتری جیا دەبنەوە، ئەو کاتەش ئەوەی ئازار دەچێژێت زیاتر ژنەکەیە و کۆمەڵێك منداڵ بێبەش دەبن لە نازی دایك و باوك، نموونەشمان زۆرە کە دوو کەس لەگەڵ یەکتری دەژین و هاوسەرگیرییان

نەکردووە، بەڵام دەبینی کۆتایی پەیوەندییەکانیان شکست دێنێت. لێرەدا شتێك هەیە، ئەویش ڕێکخراوەکانی ژنان کە کار لەسەر ئەوە دەکەن و بانگەشە بۆ ئەوە دەکەن کە ژنیش دەتوانێت کێی بوێت لەگەڵی ڕاببوێرێت و چێژ وەر بگرێت لە ژیان، کاتێکیش لە ئەنجامی ئەو جووتبوونەی لەگەڵ پیاو گەر ژنەکە دووگیان بوو و سکی پەیدا بوو، ئەوا بە یاسا ڕێگەیان پێ داوە بەوەی بچێت و منداڵەکەی لەبار بەرێت و کۆرپەلەکەی بکوژێت بێ ئەوەی لە لایەنی یاساییشەوە تۆمەتبار بێت، یان هەندێکیان کاتێك منداڵەکە دێتە دونیاوە، لەنێو سندوقی ناو باخچەکان یان سەبەتەی خۆڵەکان فڕێی دەدەن، ئێستا تۆ پێم بڵێ ئەوە لەکوێی یاسا ئەخلاقییەکان و دینییەکان جێگای دەبێتەوە. کچێك هێشتا بیست ساڵی تەواو نەکردووە بۆتە بکوژی کورپەلەکەی ناو سکی. خوا لە قورئاندا پێمان دەفەرموێت: [وَإِذَا الْمَوْءُودَةُ سُئِلَتْ * بِأَيِّ ذَنْبٍ قُتِلَتْ] سورەتی التكوير ئایەتی: ٨. واتا: ((کاتێك کچی زیندەبەچاڵکراو پرسیاری لێ دەکرێت * بە چ گوناهێك، بە چ تۆمەتێك کوژرا)). یان کۆمەڵێکی زۆری منداڵ هەیە نازانن باوکیان کێیە، تەنانەت دایکیشیان نازانێت باوکیان کێیە؟ لە ئەمریکا بەرنامەیەکی بەناوبانگ هەیە کە چەندەها ساڵە بەردەوامە بە ناوی (تۆ باوك نیت). ئایە ئەوە چ شوێنێکی جوانە تاوەکوو من بمەوێت لەناو کۆمەڵگای منیشدا هەبێت، چ شوێنێکی جوانە تاوەکوو شانازیی پێوە بکەم و هەوڵ بدەم لەناو خەڵکیدا بڵاوی بکەمەوە. ئایینی ئێمە





ڕێگریی لەوە نەکردووە کچ و کوڕ یەکتری ببین و یەکتری بناسن و لەگەڵ یەکتری قسە بکەن، بەڵام بۆ ئەوەی شتەکە بە شێوەیەك بێت نە هەست و سۆزی کچ بریندار بێت، نە هەست و سۆزی کوڕەکە، ئەوا کۆمەڵێك یاسا و بنەمای بۆ داناوە، تۆ بۆت هەیە ئەو کوڕەی هاوسەرگیریی لەگەڵ دەکەیت ببیینی و قسەش بکەن، بەڵام بە مەرجی ئەوەی سنووره شەرعییەکان نەبەزێن و بەتەنهای نەبێت، بەڵام بە هەموو شێوەیەك ڕەتی کردۆتەوە تاوەکوو کەسەکە دەبێتە حەڵاڵی تۆ دەستی لێ بدەیت و لەگەڵی بخەویت، قسەیەك زۆر باوە، ئەویش ئەوەیە کە دەڵێت: هەر کوڕێك ئامادە بوو ئەو شتانەی کە دەبێت دوای هاوسەرگیری بکرێن پێش هاوسەرگیری لەگەڵی کردی، بزانە نایەوێت هاوسەرگیریت لەگەڵ بکات، گەر هاوسەرگیریشت لەگەڵ بکات، تەمەنی ئەو هاوسەرگیرییە زۆر نابێت، چوونکە بەلایانەوە شتێکی تازە نییە و ئەوەی کە دەبوو لە ژیانی هاوسەرگیری ببینن، پێش هاوسەرگیری بینراون و کۆتایی بە بابەتەکە هاتووە، هەر بۆیە دەبینین ئەمڕۆ ڕێژەی تەڵاق و جیابوونەوە چەند زۆر بووە. وتەیەك هەیە ئێمە زۆر ستەمان لێ کردووە، ئەویش وتەی (خۆشم دەوێیت)، بە بڕوای من خۆشم دەوێیت دوو واتای هەیە، یەکەمیان: ئەوەیە من خۆشیم لە تۆ دەوێت، واتا تۆ تەنها ئامرازێکی بۆ تێرکردنی حەزەکانی من و من تاوەکوو ئەو کاتە تۆم دەوێت کە خۆشیم پێ دەدەیت، چێژت لێ وەر دەگرم و حەزەکانم تێر دەبن. واتای دووەمیان: ئەوەیە کە









خۆشیم بۆت دەوێت، من ئامادەم هەرشتێك بكەم كە تۆ خۆشبەخت و خۆشحاڵ بكات. هەمووی ئەوەی بەلامەوە گرنگە ئەوەیە بتوانم تۆ خۆشحال بكەم و زەردەخەنە لەسەر ڕووت بنەخشێنم. بۆیە گەر كوڕێك كچێكی خۆش ویست، باشترین و شەرعیترین ڕێگا ئەوەیە بچێتە داوای و بەسەربەرزی داوای دەستی كچەكە بكات لە باوكی یا برای، تا ئێرە ئەو كچە لای ماڵی باوكی وەكوو شازادەیەك ژیاوە، باوك و براكانی باشترین مامەڵەیان لەگەڵ كردووە و جوانترین خۆشەویستییان پێ داوە، ئێستا ئەو كچە گەیشتۆتە تەمەنێك كە دەتوانێت لەگەڵ كەسێكی تر ژیانێكی نوێ دروست بكات. ئایینی ئێمەش جوانترین شتێك كە وەكوو مەرجی یەكەم دای نابێت بریتییە لە ئەخلاق و ڕەوشتی كچەكە، نەك جوانیی كچەكە، نەك سامانی باوكی كچەكە، نەك ناو و ناوبانگی بنەماڵەی كچەكە، هەر وەكوو پێغەمبەر لە فەرموودەیەكدا دەفەرمووێت: (عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ رَضيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ قَالَ : (تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَع : لِمَالِهَا ، وَلِحَسَبِهَا ، وَلِجَمَالِهَا ، وَلِدِينِهَا ، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ)) واتا: (لەبەر ئەو چوار هۆكارە خەڵكی هاوسەرگیری دەكەن لەگەڵ ژن. بۆ ماڵ و سامانەكەی، یان بۆ پلەوپایە و ناسراویی بنەماڵەكەی، یان بۆ جوانی و شۆخوشەنگییەكەی، یان لەبەر دین و ئەخلاقەكەی، ئێوە ئەوە بهێنن كە دیندارە یا دەستتان بچێت بە خاكدا). بێگومان دین و ڕەوشت مەرجی یەكەمە، نەك تاكە مەرج، ئەگینا جوانی مەرجێكی ترە و ئەو كەسەی كە هاوسەرگیریی





لەگەڵ دەکات دەبێت لە ڕووی شێوەی ڕوخسار و هەڵسوکەوت تۆ بەدڵت بێت. کاتێك کەسێك دێتە داوای کچێك، پێغەمبەرمان فێرمان دەکات ئەوەی زۆر بەلای ئێمەوە گرنگ بێت و چاوی لێ بکەین لە کوڕەکەدا ئەوەیە کە کوڕێکی پابەند بێت بە دینەوە و ئەخلاق و ڕەوشتی باش بێت، هەر بۆیە پێغەمبەرمان فەرموویەتی: (إذا جاءكم من ترضون دينه وخلقه فزوجوه إلا تفعلوه تكن فتنة في الأرض وفساد كبير) واتا: گەر کەسێك هاتە داوای کچەکەتان یا خوشکەکەتان و ئێوە لە دین و ڕەوشتی ڕازی بوون، ئەوە بیدەن پێی، خۆ ئەگەر وا نەکەن، دەبنە هۆی ئاشوب و خراپەکاریی گەورە لەسەر زەوی). بێگومان دەبێت کچە ڕازی بووبێت، هەرچەندە کوڕەکە کوڕی باش و ديندار بێت، مادام کچەکە نایەوێت، ئەوا نابێت بەزۆر بدرێت بە شوو.

جارێکیان پیاوێك هات بۆ لای ئیمامی حەسەنی بەسری (ڕەزای خوای لێ بێت) پێی گوت: کۆمەڵە کەسانێك هاتوونە داخوازیی کچەکەم. من کچەکەی خۆم بدەم بە کامیان؟ ئیمامی حەسەنیش وەڵامی دایەوە: ئەوەیان کە لەخواترسە، خۆ ئەگەر خۆشی ویست، ڕێزی لێ دەگرێت، بەڵام گەر ڕۆژێك هات شتێکی لەودا بەدڵ نەبوو، ستەمی لێ ناکات). بەڕاستی ئەوە جوانترین وەڵامێکە بۆ هەموو ئەو دایك و باوك و تەنانەت کچەکانیش دەبێت زۆر وریا بن لەوەی چ جۆرە کوڕێك دەکەن بە هاوبەشی ژیانیان، زۆر حاڵەت ڕووی داوە بەوەی کچێك شووی کردووە بە کوڕێکی مەشرووبخۆر







و شەوانە ئەو کوڕە کە دێتەوە لە ژنەکەی دەدات و تەنانەت ڕووی دا یەکێکیان بە چەقۆ لە خێزانەکەی دابوو و یەکێکی تریان ژنەکەی بە کۆمەڵێك منداڵەوە جێ هشێتبوو و یەکێکی تر ژنەکەی سووتاندبوو، من بەتەحەداوە پێت دەڵێم ژنێك لای پیاوێك بێت لە ئایەت و فەرموودەکانی ئەم دینە تێگەیشتبێت، ستەمی کردبێت لە ژن. جا بۆیە زۆر گرنگە کچەکە بزانێت چ جۆرە کوڕێك دەکاتە باوکی منداڵەکانی.

ئایینی ئیسلام واجبی کردووە لەسەر ئەو کوڕەی هاوسەرگیری لەگەڵ کچێك دەکات هەم مارەیی بدات و هەمیش خەرجیی دابین بکات و دابینکردنی خەرجیی ماڵەوە ئەرکی ژن نییە، خۆ ئەگەر ژنەکە ویستی یارمەتیی پیاوەکەی بدات و کاری کرد لە دەرەوە، ئەوا ئایینی ئێمە ڕێگریی لەوە نەکردووەی بە مەرجێك پۆشاکێکی شەرعی بپۆشێت و ئاگاداری سنووری خۆی بێت لەگەڵ ئەو پیاوانەی لە شوێنی کارەکەی کاریان لەگەڵ دەکات. لێرەوە شتێك دەست پێ دەکات، ئەویش بابەتی چوونەدەرەوە و کارکردن و پارەپەیداکردنی ژنە و باسکردنی پلەوپایەی پیاو و ژنە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت: [الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ ۚ فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللَّهُ ۚ وَاللَّاتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ ۖ





فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا]

سورەتی النیساء ئایەتی ٣٤. واتا: ((پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر هاوسەرەکانیانەوە، ئەمەش بە هۆی ئەوەی ڕێز و زیادە ئەرکێکەوە کە خوا داویەتی بە هەندێك بەسەر هەندێکی تردا (سەرەڕای ئەوەی کە) پیاوان لە ماڵ و سامانیان خەرج دەکەن (لە پێناو ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانیی ئافرەتاندا). لەولاشەوە ئافرەتانی ژیر و دیندار و گونجاو هەمیشە گوێڕایەڵی مێردەکانیانن، نهێنیی نێوان خۆیان و مێردەکانیان دەپارێزن (بەتایبەتی ئەو نهێنییانەی خوا دەیەوێت پارێزراو بن) بە هۆی ئەوەی کە خوا مافەکانی ئێوەی پاراستووە، ئەو ئافرەتانەش ئێوە دەترسن سەرکەشی و سەرپێچی بکەن، سەرەتا ئامۆژگارییان بکەن، (ئەگەر ئەوەش سوودی نەبوو) لەناو جێدا پشتیان تێ بکەن، (ئەگەر ئەوەش سوودی نەبوو) لێیان بدەن (بە مەرجێك لێدانەکە لە دەموچاو نەبێت و ئاسەوار جێ نەهێڵێت)، ئەگەر بەم هۆیانە لە لادان و یاخیبوون وازیان هێنا، ئەوە ئیتر ستەمیان لێ مەکەن و ڕێگەی تر مەگرنە بەر (بۆ ئازاردانیان)، بێگومان خوا بەرز و بڵند و گەورەیە (گەر ستەمیان لێ بکەن تۆڵەتان لێ دەسێنێت)). ڕێکخراوەکانی ژنان و ئەوانەی دەیانەوێت ژن لە ماڵ بچێتە دەرەوە، دەیانەوێت ئەو ژنەی وەکوو شاژن لە ماڵەوەیە خزمەتی مێردەکەی دەکات و ئاگای لە منداڵەکانیەتی بیهێننە دەرەوە و پێیان وایە کۆیلەیە و ئازادیی لێ سەندراوە و ڕێگریی چوونەدەری لێ کراوە، بەڵام هەموو ئەو بانگەشانەی

ئەوان دەیکەن تەنها بۆ ئەوەیە ژن لە ماڵ بچێتە دەر و ببێتە خزمەتکار و کۆیلەی بەڕێوەبەر و خاوەن کارەکەی، گرنگ نییە چەند لە دەرەوە بێت، گرنگ نییە چ کارێك دەکات، گرنگ نییە چ جلوبەرگێك لەبەر دەکات، تەنانەت گەر جلێکی تەنوورە کورتیش لەبەر بکات و پێڵاوی تەنگیش لە پێ بکات، هیچ کێشە نییە مادام بەڕێوەبەر و خاوەن کارەکەی ئەوەیان دەوێت و ئەویان بەو شێوەیە بەدڵە. ئەوە ستەمە و بەکۆیلەکردنی ژنە خواردن بۆ هاوسەرەکەی و منداڵەکانی ئامادە بکات، بەڵام ئازادییە بڕوات لە خواردنگەکان و شوێنە گشتییەکان خواردن ئامادە بکات و خزمەت بکات، بەکۆیلەکردنی ژنە و ئیشی ژن نییە ماڵی خۆی پاك ڕاگرێت، بەڵام ئازادییە گەر بڕوات بۆ خاوێنکردنەوەی ئاودەستی هۆتێلەکان و پاککردنەوەی نەخۆشخانەکان و شوێنە گشتییەکان. بوون بە کۆیلە بوونی پیاوە گەر قبوڵی بکات مێردەکەی سەرۆکی خێزان بێت، بەڵام زۆر ئاساییە و ئازادییە بێگانەکان بەڕێوەبەری بن و ئەوەیش وەکوو سکرتێرە ئیشیان لا بکات. لە ماڵەوە نابێت مێردەکەی دەنگی بەسەردا بەرز بکاتەوە یان بەزۆر داوای سەرجێیی لێ بکات، بەڵام زۆر ئاساییە بەڕێوەبەرەکەی هاواری بەسەردا بکات و چیی حەز لێ بێت و بە دەمیدا بێت پێی بڵێت، گەر بەڕێوەبەرەکەی یان کەسێك لە شوێنی ئیشەکەی گێچەڵی سێکسیی پێ کرد یان دەستدرێژیی کردە سەر، دەبێت بێدەنگ بێت، خۆ ئەگەر بڕوات سکاڵا تۆمار بکات، ئەوا لە کارەکەی دەری دەکەن، بۆیە بێدەنگ

بێت باشترە. زۆرێك لەوانەی بانگەشەی ئازادی بۆ ئافرەت دەكەن ئەو ئایەتەی پێشتر بۆم باس كردی دێنن و دەڵێن خوا زوڵمی لە ژن كردووە و بە پلەیەكی كەمتر تەماشای كردووە و پیاوی كردووە بە گەورە بەسەر ژنەوە، بەڵام با بێین سەیر بكەین بۆچی خوا پلەیەكی زیاتری داوە بە پیاو بەسەر ژندا، بۆ ئەوە نا كە ستەم لە ژن بكات یان بە چاوێكی كەمتر لێی بڕوانرێت، بەڵكوو ئەو پلەیە ئەركی پیاوی قورستر كردووە، ئەوە لە جیاتی گەورەیی پیاو بێت بەسەر ئافرەتدا، بریتییە لە ئاداگاربوونی پیاو لە ژن و بوون بە چەتر بۆ ئافرەت و ئاگاداریلێكردنی و پاراستنی، واتا ئەو ئایەتە پیاوی كردووە بە قەڵغانێك بۆ پاراستن و ئاگاداربوون لە ژن. ئەو قسەیەی ئێستا بۆت دەكەم هەوڵ بدە وەكوو دیمەنێك بیهێنیتە بەرچاوت، جارێكیان پێغەمبەر لەگەڵ یەكێك لە خێزانەكانی بوو، نەیتوانی سواری وڵاخەكەی بێت، لەبەر ئەوەی باڵای زۆر بەرز نەبوو و پێغەمبەریش چۆكێكی بۆ دانا و پێی فەرموو قاچت لەسەر ئەو چۆكەی من دابنێ بۆ ئەوەی سواری وڵاخەكەت بیت. یان جاری وا هەبووە خێزانێكی دەنگی بەسەردا بەرز كردۆتەوە، بەڵام ئەو زۆر ئارام بووە لەگەڵی، لێرەدا ئەو پلەبەرزییە دەر دەكەوێت كە پیاو ئارام بگرێت بەرامبەر ژنەكەی و خۆشی بوێت و پێداویستییەكانی دابین بكات.

ئینجا بابەتی ئەوەی پیاو دەتوانێت چوار ژن بێنێت، بەڵام بۆچی ژن ناتوانێت لەگەڵ چوار پیاودا بێت. دەمەوێت ئەوەت پێ بڵێم،

پێش ئەوەی ئاینی ئیسلام بێت ژمارەی ژنەکان دیارینەکراو بوو، پیاو هەبوو زیاتر لە پازدە ژن یا بیست ژنی هەبوو، بەڵام ئاینی ئیسلام ڕێژەی کۆتایی دانا کە پیاو تەنها دەتوانێت و بۆی هەیە تا چوار ژن بهێنێت و مەرجیشی بۆ داناون کە دەبێت لەگەڵیان دادپەروەر بێت. چوار ژن واجبکراو نییە لە دینی ئێمەدا، بەڵام سوننەتە، ئینجا پیاو چوار ژنی هەبێت و ئاگاداریان بێت زۆر باشترە لەوەی ژنێکی هەبێت و لەگەڵ حەوت کچ و ژنی تر لە پەیوەندیی ناشەرعیدا بێت، هەر وەکوو داتاکان باسی ئەوە دەکەن کە زۆرێك لە پیاوی ئەمریکی جگە لە ژنی خۆیان پەیوەندییان لەگەڵ چەند ژنێکی تریش هەیە، خاڵێکی تریش هەیە کە بە هۆی شەڕ و کێشەکانی دونیاوە ڕێژەی مردنی پیاو زیاترە وەکوو لە ژن، هەر بۆیەش باشترە لەوەی پەیوەندیی ناشەرعی دروست بێت بە ڕێگەی شەرعی، ئەو جۆرە بۆشاییانە پڕ بکرێنەوە. لەبەرامبەردا ژن بۆچی ناتوانێت لە یەك کاتدا لەگەڵ زیاتر لە پیاوێکدا بێت، جەستەی ژن لە ڕووی فیسۆلۆجییەوە بە شێوەیەك دروست کراوە کە ناتوانێت لە یەك کاتدا لەگەڵ پیاوێك زیاتردا بێت، وا دەشبینین کە ئەو ژنانەی لە پەیوەندیی ناشەرعیدان و لەگەڵ زیاتر لە پیاوێکدان تووشی چەندەها نەخۆشی بوون، بەڵێ لە ڕۆژئاوا ژن هەیە پەیوەندیی لەگەڵ زیاتر لە سێ پیاودا هەیە و سەرجێیان لەگەڵ دەکات، بەڵام دەبێت هەموو هەفتەیەك پشکنین بکات بۆ خۆپاراستن لەو نەخۆشییانەی کە دروست دەبن لە ئەنجامی کۆبوونەوەی تۆوی ئەو هەموو پیاوە

لەناو ڕەحمی ئەو ئافرەتە، بەڵام ژنێك كە تەنها پیاوێكی هەیە، بێخەمە لە هەموو ئەو نەخۆشییە گوازراوانە، چوونكە ڕەحمی ئافرەت تەنها دەتوانێت مامەڵە بكات لەگەڵ تۆوی یەك پیاو، نەك كۆمەڵە پیاوێك لە یەك كاتدا. ئەوەش گەر بێین تەماشا بكەین، دووبارە بۆ پاراستنی ئافرەتە و دووربوونی لە نەخۆشی و مانەوەی بە تەندروستییە.

ئینجا بابەتێكی تر هەبوو باست كرد، ئەویش شایەتیدانی پیاوێك و دوو ژن، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: [وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ ۖ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ أَن تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَىٰ] سوڕەتی البقره ئایەتی ٢٨٢. واتا: ((با دوو پیاو لە خۆتان شایەتی لەسەر (قەرز و مامەڵە) بگرن، ئەگەر دوو پیاو دەست نەكەوتن بۆ شایەتی، با پیاوێك و دوو ئافرەت شایەتییەكە بدەن لەو كەسانەی كە ڕازین بە شایەتیدانیان، نەوەكوو یەكێك لە (ئافرەتان) بیری بچێت، با ئەوی تریان بیری بهێنێتەوە...)). هێنانی دوو ژن بەرامبەر پیاوێك لێرەدا ستەمكردن نییە لە ئافرەت، بەڵكوو یارمەتیدان و ڕەچاوكردنی بارودۆخی ئافرەتە، ئافرەت دەكرێت بە هۆی دووگیانییەوە گۆڕانكاریی جەستەیی ڕوو بدات و تووشی لەبیرچوونەوە ببێت، بۆیە گەر یەكێكیان لەبیری چوو، ئەوەی تر بیری دەهێنێتەوە، یان دەكرێت یەكێكیان نەخۆش بكەوێت یان یەكێكیان دووگیان بێت بە هۆی ئەو شتانەی بەسەری دێت

شایەتیدانەکە لەبیر بکات، بەڵام گەر دوو بوون، هاوڕێکەی بیری دەخاتەوە.

بابەتێکی تر بریتی بوو لە میرات، بێباوەڕان هەمیشە دەگەڕێن بۆ ئەوەی لە شوێنێکەوە هەڵەیەك، ڕەخنەیەك بگرن لەو دینە، بۆیە بەشێکی زۆریان دێن و دەڵێن ئەوە نییە خوا لە میراتدا بەشی دوو کچی بەرامبەر یەك کوڕ داناوە. خوای گەورە دەفەرمووێت : [لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنْثَيَيْنِ] سورەتی النساء واتا: ((بەشی نێرینەکان ئەندازەی بەشی دوو مێینەیە)). گەر بێین بەوردی بەدواداچوون بۆ بابەتی میرات بکەین، تێدەگەین کە تەنها لە چوار جێ ئافرەت نیوەی پیاو میرات وەر دەگرێت، بەڵام لە سی جێگای تر باس لەوە کراوە ژن یا زیاتر لە پیاو یا هێندەی پیاو یان تەنها ژن دەیبات و پیاو میرات نابات. ئەو چوار شوێنەی پیاویش زیاتری دەبات لە ژن حیکمەت و دانایی خۆی تێدایە، بۆ نموونە: کوڕ دەبێت مارەیی کچ بدات، بەڵام کچ مارەیی لەسەر نییە، پیاو دەبێت خەرجی و مەسروفی ژن بکات، بەڵام ژن ئەوەشی لەسەر نییە. من دڵنیات دەکەمەوە لەوەی ئایینی ئێمە بە هەموو شێوەیەك ڕەحمەت و خێرە بۆ ژن، ئەو ژنەی لەناو ئایینی ئێمە هەست بە بەختەوەری نەکات، لە هیچ شوێنێك هەستی پێ ناکات و ئەو ڕێزەی لەناو دینی ئێمەدا بۆ ژن هەیە، لەناو هەرچیی دینی تردا بوونی نییە.

بۆ ئەوەی زیاتر دڵنیا بیتەوە لەو قسانەم، ڕێگە بدە هەندێك شتی ترت بۆ باس بکەم لەسەر پێگەی ژن لای ئێمە. ژنان لە

سەردەمی پێغەمبەر و هاوەڵانی دوای خۆشیدا لە مەیدان بوون و کاریگەرییەکی مەزنیان هەبووە لە ڕووی فێرکردن و زانست و پزیشکی و سیاسی و بازرگانی و جەنگییەوە، هتد... ئایینی ئێمە زۆر گرنگیی داوە بەوەی ژن هۆشیار بێت، چوونکە کاتێك ژن هۆشیار بوو، دەتوانێت ببێتە پایەیەکی بەهێز بۆ پاراستنی خێزان و کۆمەڵگا. پێغەمبەر لە فەرموودەیەکدا پێمان دەفەرمووێت: داواکردنی زانست فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێکی نێر و مێ. لە جێگایەکی تردا پێغەمبەر وەسفی ژنەکانی ئەنسارش دەکات بەوەی کە شەرم و حەیایان نەبۆتە هۆی ئەوەی داوای زانستی شەرعی نەکەن، گەر سەیریش بکەین دەبینین بەشێکی فەرموودەکانی پێغەمبەر ژنان گێڕاویانەتەوە، بەتایبەتی دایکی ئیماندارن عائیشەی کچی أبوبکر، کە زانایان بە یەکێك لە ژیرترین و تێگەیشتووترین ئافرەتان وەسفی دەکەن. عەروەی کوڕی زوبێر لە وەسفی دایکمان عائیشەدا دەڵێت: نەمبینیوە هیچکەسێك زاناتربێت لە فیقهـ و پزیشکی و شێعردا لە عائیشە. هەروەها کۆمەڵێکی زۆری تر لە ژنان کە ئیسلام و موسڵمانان شانازییان پێوە دەکەن، لەوانەش (نوسەیبەی کچی کەعب)، کە بە یەکێك لە ژنە ئازاو و ژیرەکان دادەنرێت و داکۆکیکارێك بووە بۆ مافی ژنان. هەروەها (فاتیمە فەهراوی)، نەك موسڵمانان، بەڵکوو دەبێت گشت مرۆڤایەتی شانازیی پێوە بکات، ئەو ئافرتە زانستخواز و ژیرە بە دامەزرێنەری یەکەمین زانکۆ دادەنرێت لە مێژوودا و لە ساڵی ٨٥٩ زایینی هەڵستا بە دروستکردنی زانکۆی قەرەوین

لە وڵاتی مەغریب. هەروەها لە ڕووی سیاسییەوە ژن لە ماڵ زینیدانی نەکراوە و بۆی نەبووبێت بێتە دەرەوە و بەشداری بکات لە بڵاوکردنەوەی دیینی ئیسلام. بەڵکوو یەکەمین کەس کە بۆتە پاڵپشت بۆ ئەو دیینە و سەرخەری ئەو دینە، خەدیجەی دایکی بڕواداران بووە، هەروەها یەکەمین کەس کە لە پێناو ئیسلامدا شەهید بوو ژن بوو، ئەویش سومەیەی کچی خەیات، کە بە دایکی عەمار ناسرابوو. هەروەها کچەکانی پێغەمبەر کە پاڵپشتی باوکیان بوون و لە ڕێگەی گەیاندنی ئەو دینەوە تووشی نارەحەتیی زۆر بوون. ئەسمای کچی أبوبکر، کە ئەو کاتەی پێغەمبەر لەگەڵ باوکی ڕۆیشتن بۆ ئەشکەوت، ئەو خواردنی بۆ دەبردن بەنهێنی. هەروەها لە کاتی جەنگەکاندا، ژن بەشداریی شەڕەکانی کردووە لەگەڵ پیاوان، بەڵام لە هێڵەکانی دواوە بوون و وەکوو دکتۆر و پەرستار ڕۆڵیان بینیوە، هەروەها ئاو و خۆراکیان بۆ سەربازەکان ئامادە کردووە و وورەی سەربازەکانیان بەرز کردۆتەوە. هەروەها لە بواری بازرگانیدا ژن کاریگەرییەکی مەزنی هەبووە، تەنانەت خێزانی پێغەمبەرمان خەدیجە ڕەزای خوای لێ بێت یەکێک بوو لە دیارترین ژنە بازرگانەکان. هەروەها لە سەردەمی ئیمامی عومەر، شیفای کچی عبدالله بەرپرسی کاروباری ژنان بوو لەناو بازاڕدا. هەروەها لە بواری کشتوکاڵ و بوارە جیاجیاکاندا.

پێغەمبەرمان زۆر باش لە ڕۆڵی ئافرەت تێگەیشتبوو. بۆیە بەردەوام هانی هاوەڵانی دەدا کە لەگەڵ ژنان باش بن، خۆشتان





بوێن، لێیان مەدەن، لە فەرموودەیەکدا پێغەمبەر(ﷺ) ئامۆژگاریی ئێمە دەکات و دەفەرمووێت: (خيركم خيركم لأهله، وأنا خيركم لأهلي) واتا: باشترینتان ئەوەیە بۆ ماڵ و خێزانی باش بێت، منیش لە هەمووتان باشترم بۆ خێزانم... هەروەها لە قورئاندا خوا پێمان دەڵێت: [وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ] واتا: ((بەباشی مامەڵە بکەن لەگەڵیان)).

ئێستاش با بێین هامان ئەو ژنەی لای پیاوەکەی بە خۆشەویستی ژیان دەکات، کاتێك دەبێت بە دایك پلەکەی گەورەتر دەبێت. هەر وەکوو گوتراوە ژن نیوەی کۆمەڵگایەوە و دایکی نیوەکەی تریشە. بەرپرسیارێتی و باشمامەڵکردن لەگەڵی دەکەوێتە ئەستۆی کوڕەکانی و کچەکانی. لە زۆر جێگەدا باسی گەورەیی دایك کراوە، خودای گەورە لە قورئاندا پێمان دەفەرمووێت: [وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا] واتا: ((لەگەڵ دایك و باوکتان باش مامەڵە بکەن، ڕەفتار و گوفتارتان با باش بێت لەگەڵیان)). جارێکیان پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر و پرسیاری لێ کرد، باشترین کەسێك هاوڕێیەتیی بکەم و لەگەڵی باش بم و گوفتارشیرین بم کێیە؟ پێغەمبەریش وەڵامی دایەوە: دایکت. پیاوەکە پرسی ئەی دوای ئەوە، پێغەمبەر دووبارە فەرمووی: دایکت. پیاوەکە گوتی ئەی دوای ئەوە، پێغەمبەر وەڵامی دایەوە: دایکت. تا ئەوە بوو بۆ چوارەم جار فەرمووی: باوکت. بەڵێ، دایك لە هەموو کەسێك شایانترە بەوەی لەگەڵی باش بیت و ڕێزی بگریت و خۆشت بوێت و دەنگی بەسەردا بەرز نەکەیتەوە و ئاگاداری بیت. چوونکە پێغەمبەر لە بارەیەوە فەرموویەتی:

بەهەشت لەژێر پێی دایکاندایە. یەکێك لە شاعیرەکانی عەرەب شتێکی جوانی گوتووە لەسەر دایك و دەڵێت:

(الأم مدرسة إذا أعددتها ... أعددت شعباً طيب الأعراق).

بەڵێ، دایك قوتابخانەیە، گەر دایك هۆشیار و ژیر بوو، بێگومان ئەو کاتە نەوەیەکی ژیر و تێگەیشتووش پەروەردە دەکات بۆ کۆمەڵگا. بەڵام ئەوەی جێگای داخە ئەوەیە ڕۆژئاوا باش درکیان پێ کردووە و کاریان لەسەر کردووە ئەوەیە کە ئەگەر هات و دایکیان لەو ئەرکەی کە هەیەتی جیا کردەوە، ئەو کات باشترین هەنگاویان ناوە بۆ تێکدانی شیرازەی خێزان. هیوادارم لەوەی ئێستا دەیڵێم بەهەڵە تێنەگەیت، بەڵام زۆرێك لەو ژنانەی ئەمڕۆ کە منداڵ دەخەنەوە بە بڕوای من وشەی (دایك) نایانگرێتەوە. ئاخر دەبێت ئەوە دایك بێت کۆرپەلەی خۆی بخاتە سکی ژنێکی ترەوە بۆ ئەوەی ئەو نۆ مانگە بۆی هەڵبگرێت، ئەویش پارێزگاری بکات لە جەستەی خۆی و ئامادەیی ئەوەی تێدا نییە ژانی منداڵبوونێك بیگرێت و لە ترسی ئەوە پەنا دەباتە بەرنەشتەرگەری. ئاخر تۆ بڵێیت ئەو ژنە وشەی دایك بیگرێتەوە کە تەنها لەبەر ئەوەی مەمکەکانی خراپ نەبن و شۆڕ نەبن ئامادە نییە شیری خۆی بدات بە منداڵەکەی. ژنێك ئامادەیی ئەوەی تێدا نەبێت خۆی منداڵەکەی خۆی پەروەردە بکات و بیداتە دەستی خزمەتکاری بیانی، دەبێت چ کۆرپەلەیەك دەر بچێت، سەیر کە، هیچ شتێك هێندەی ئامێزی دایك پیرۆز و ئارام نییە بۆ منداڵ، بەڵام وا دەبینم هەندێك ژن کاتێك دەڕۆن بۆ





مۆڵ و شوێنە گشتییەکان، منداڵەکانیان لای خزمەتکارەکانیانە و ئەوان هەڵیان دەگرن. ئێستا تۆ بێنە بەرچاوت منداڵێك ئا بەو شێوەیە گەورە بکرێت، دەبێت لە کۆتاییدا چۆن مامەڵە بکات لەگەڵ دایك و باوکی، بێگومان چۆن ئەوان ئەویان هەڵداوەتە ناو عەرەبانەی دەستی و ئامێزی خزمەتکاری بیانی، سبەی هەمان ئەو منداڵەش ئەوان هەڵدەداتە ناو خانەی بەساڵاچووان. چوونکە لە منداڵییەوە هیچ سۆز و خۆشەویستییەکی وا بەهێز دروست نەبووە لەنێوان کۆرپەلە و باواندا وا بکات لە منداڵ سبەی بەوەفا بێت و بە باشە مامەڵە بکات لەگەڵیان. ئەو کاتەی ئەوەش ڕوو دەدات، دەبینین ڕۆژئاوا ئاهەنگی سەرکەوتنی لێکهەڵوەشاندنی خێزان دەگێڕن، چوونکە سەرکەوتوو بوون لەو پلانەی کە دایان ڕشتبوو. بۆیە من دەمەوێت بڵێم لەلای ئێمە دایك زۆر پیرۆزە، دایك کۆڵەکە و پایەی ماڵە و گەرمکەرەوەی ماڵە. دەبێت ژنانیش باش ئەوە هەست پێ بکەن کە مانەوەیان لە ماڵ و پەروەردەکرنی منداڵ شتێکی کەم نییە، بەڵکوو گەورەترین ئیشێك و ئەرکێکە پێیان سپێردراوە. بێگومان ئایینی ئێمە ئەرکی دایکیشی دیاری کردووە و ئەرکی منداڵەکانیشی دیاری کردووە. گەر هەردوو لا بە ئەرکی خۆیان هەڵستان، دەبینین چ کۆمەڵگایەی ناوازەمان هەیە، وەسفی دایك تەواو نابێت، بەڵام حەزم لێیە ئەوەندەش بڵێم کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: شەرمەزاری و تیاچوون بۆ کەسێك تاوەکوو دایك و باوکی زیندوون ئەوەندە چاکەی نەبێت لەگەڵیان بە هۆی ئەو چاکانەوە خوا بیخاتە بەهەشتەوە.

خەریك بوو دەگەیشتمە کۆتایی قسەکانم، ویستم بەو قسانە کۆتایی پێ بهێنم، بۆیە گوتم:

– ئەوە بەشێکی بچووك بوو لەسەر گرنگیی ژن لە ئیسلام، ئەگەر شتێکیش هەبووبێت یان ڕەفتارێکی خراپیش کرابێت بە ناوی ئیسلامەوە بەرامبەر بە ژن، دڵنیا بە ئیسلام لێی دوورە، هەرچەندە بە ناوی ئیسلامیشەوە بکرێت یان موسڵمانانیش ئەنجامی بدەن. ئایینی ئێمە فەرمانی نەکردووە گەر کچێك حیجابەکەی فڕێ دا بکوژرێت، بەڵکوو پێویستە ئامۆژگاری بکرێت و پێی بگوترێت کارێکی نەشیاوی کردووە بە فڕێدانی حیجابەکەی، بەڵام گەر هەر سوور بوو لەسەر کارەکەی، ئەوا نابێت تۆ توندوتیژیی بەرامبەر بەکار بهێنی، یان بێیت ژن بکوژێت بە ناوی شەڕەفەوە، ئەوە ئیشی مرۆڤی موسڵمان نییە و ئیسلامیش فەرمانی بەوە نەکردووە، گەر کەسێکی موسڵمان ئازاری ژنێکی دا، بزانە لە ئیسلام و پەیامی ئیسلام تێنەگەیشتووە. ئەگەر ڕۆژێکیش بینیت کەسێك بە ناوی ئیسلامەوە بێڕێزی بەرامبەر ژن دەکات، بزانە ئەوە دینی ئیسلام دوورە لەو ڕفتارەی ئەو، دینی ئیسلام پڕیەتی لە ئامۆژگاری بۆ پیاوان کە مامەڵەیان جوان بێت لەگەڵ ژنان، دەمەوێت ئەوەت پێ بڵێم کە پێغەمبەر فەرموویەتی: بەسۆز بن لەگەڵ شووشەکان. پێغەمبەر باسی ئافرەتی کردووە بەوەی زۆر ناسکە و دەبێت بەناسکی مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت و توندوتیژی بەکارنەهێنین بەرامبەریان. ببورە گەر نەمتوانیبێت هەموو جوانییەکانی ئیسلامت بۆ باس بکەم. ئێستا پێم بڵێ، ئایە هەیە لە ئیسلام باشتر ڕێزی گرتبێت لەژن، ئایە ئیسلام



بێڕێزیی کردووە بەرامبەر بە ژن، ئایە ئیسلام نییە تاکە پارێزەری



ڕاستەقینەی ژن؟

میرا چاوەکانی پڕ بووبوون لە فرمێسک و بەگریانەوە گوتی: ئەگەر ئەوەی تۆ باسی دەکەیت و دینی ئێوە بەو شێوەیە بێت، بێگومان نییە دینێك باشتر لە ئیسلام ڕێزی ئافرەتی گرتبێت، بەڵکوو ئەوانەی دژی ئەو دینەن بێڕێزییان بەرامبەر ئافرەت کردووە و ئیسلام پارێزەری ڕاستەقینەی ژنە.

شەو درەنگی کردبوو، تەنها ئێمە مابووین و کارمەندەکانی خواردنگەکە خەریك بوون کورسی و مێزەکانیان خاوێن دەکردەوە و بەتەما بوون شوێنەکە دابخەن. بۆیە ڕووم کردە میرا و پێم گوت: هیوادارم وەڵامەکانم توانیبێتیان گەر کەمیش بێت ئەو تینووێتییەی دڵت بشکێن و بووبێتنە دەروازیەك بۆ ئەوەی لە ڕێگەیەوە بگەیتە کەناری ئارامی و دڵت ئارام بێتەوە. وا شەویش درەنگی کردووە، هەرکاتێك ویستت قسە بکەین یان شتێکی تر هەبوو باسی بکەین، من لە خزمەتتدا.

وا هەستم دەکرد میرا زۆر ئاگای لەو قسانەم نەبێت و خەریکە بیر دەکاتەوە، لەناکاو ڕووی کردە من و زەردەخەنەیەکی کرد، پاشان تەماشایەکی کاتژمێرەکەی کرد و بە بزەیەکەوە گوتی:

ـ کات چەند درەنگی کردووە، هیوادارم کاتی منیش ئاوا درەنگی نەکردبێت.

- پشتیوان بە خوا درەنگ نەبووە.

دوای ئەوەی ماڵئاواییمان کرد لە یەکتری، بەرەو کۆمپانیا هاتمەوە، لە ڕێگە هەستم بە ئارامییەك دەکرد کە پێشتر هەستم پێی نەکردبوو. دڵخۆش بووم بەوەی کە توانیم بە کەمێکیش بێت بتوانم باسی ئیسلام بۆ میرا بکەم، حەزم دەکرد لەو زەلکاوە ڕزگاری بکەم و بێتە ناو دینی ئیسلامەوە. کاتێك گەیشتمەوە کۆمپانیا، شەو تەواو درەنگی کردبوو. دەست نوێژم شۆرد و دەستم کرد بە شەونوێژ و لە دڵەوە دوعام بۆ میرا کرد، کە خوا هیدایەتی بدات و ڕێنموونیی بکات بۆ سەر ڕێگای ڕاست. پاش ئەوە ڕۆیشتم بۆ سەر جێگاکەم، بەئاسوودەیی لێی خەوتم. سبەی کاتژمێر نۆ بوو کاتێك لە خەو هەڵستام، ئیش و کارێکی وا نەمابوو لە پڕۆژەکەمان، چوونکە کۆتا ڕۆژ بوو، بۆیە ئەوەی پێویست بوو ئەنجامان دا. سەعات یازدە حاجی کەمال هات و نوریشی لەگەڵ بوو. حاجی کەمال زۆر دڵخۆش بوو کە دەیبینی ئەو پڕۆژەیەش بەباشی تەواو بووە، هەموو خەونیشی ئەوە بوو ئەو پڕۆژە نوێیەی ڕادەگەیەندرێت بۆ ئەو بێت، چوونکە پارەیەکی باشی بۆ تەرخان کرابوو. هات بۆ لای من و زۆر سوپاسی کردم کە لە کاتی ئەو پڕۆژەیەدا بەباشی کارم کردبوو و سوپاسی ماندووبوونی کردم. پاش ئەوە ڕۆیشتین بۆ ئەوەی نانی نیوەڕۆ پێکەوە بخۆین. کاتی نانخواردن بوو، مەحوی تەلەفۆنی کرد، دوای ئەوەی سڵاوی کرد گوتی:

- ئەرێ ئاگاداری چی ڕوو دەدات؟





ــ چی بووە؟

ــ بڕۆ ناو فەیسبووك و ئینستاگرام، هەمووی بۆتە وێنەی تۆ لەگەڵ ئەو کچەی شاجوانی ئاسیا میرا.

ــ ئەوە بەڕاستتە.

ــ بەڵێ، وا بڵاوکراوەتەوە و نووسراوە شاجوانی ئاسیا میرا لەگەڵ خۆشەویستەکەی. نووسیویانە ماوەیەکە لەگەڵ یەکتری لە خواردنگەیەك پێکەوە ژوانیان هەیە و شەوانە تاوەکوو درەنگ پێکەوەن.

نەمدەزانی چی بکەم، خێرا پەیوەندییەکەم داخستەوە، ڕۆیشتمە ناو فەیسبووك و ئینستاگرام، بینیم سەرتاپای پەیجەکان بوونەتە وێنەی من و میرا. هەریەکێکیشیان ناوونیشان و نووسینێکی جیاوازی داناوە.

حاجی کەمال کە لەتەنیشت من خەریکی نانخواردن بوو. گوتی: ئەندازیار شتێك بووە.

منیش مۆبایلەکەی خۆم پێ دا بۆ ئەوەی ببینێت و بزانێت چی بڵاوکراوەتەوە لەسەرم. دوای ئەوەی وێنەکانی بینی گوتی:

ــ ئەوە هەر ئەو کچە نییە ئەو جارە هاتبوو بۆ کۆمپانیا؟

ــ بەڵێ، خۆیەتی.

- من چیم بە تۆ گوت ئەندازیار، نەمگوت لەو جۆرە کچانە خۆت بەدوور بگرە!

- حاجی گیان، خوا ئاگادارە ئەوەی ئەوانە نووسیویانە هەمووی درۆیە، هیچ پەیوەندییەك نییە لەنێوانماندا، تەنها ئەوەندە نەبێت ئەو کچە هەندێك پرسیاری لەسەر ئیسلام هەبوو، منیش وەڵامم دایەوە و تەواو.

- خەڵکی نازانێت و ئاگادار نییە ئێوە باسی چیتان کردووە، چییان حەز لێ بێت بە دڵی خۆیان دەینووسن.

- حاجی گیان تاوانی من چییە؟ ئەو کچە هەژارە لە کێشە و ناڕەحەیدایە، دەستی یارمەتیی بۆ من درێژ کردووە، پرسیاری لەسەر ئیسلام هەبوو، بەدوای مانایەکدا دەگەڕێت، بەدوای ڕێگایەکەوەیە بۆ دۆزینەوەی ڕاستی، ڕێگایەك کە ئاسوودەی بکات.

نور دیار بوو بە مۆبایلەکەی خۆی سەیری ئەو پۆستانەی دەکرد کە لەسەر ئێمە بڵاو کراونەوە، بەنیگەرانییەوە خواردنەکەی خۆی هەڵگرت و لە ژوورەکە ڕۆیشتە دەرەوە. هیچمان نەمانزانی بۆچی ئەو کارەی کرد. دواتر حاجی کەمال بەردەوام بوو و گوتی:

- من گومانم لە پاکی و ڕاستگۆیی تۆ نییە، دەشزانم هەر کارێکت کردبێت لەبەر ڕەزامەندیی خوا کردووتە، بەڵام ئەو خەڵکە خۆ ویژدانی نییە. بێ ئەوەی بزانێت تۆ کێیت و بۆچی لەگەڵ ئەو





کچە دانیشتووی، هاتوون بۆ کۆکردنەوەی لایك و کۆمێنت چییان حەز لێ بێت بڵاوی دەکەنەوە.

حاجی کەمال لەو قسانەدا بوو کاتێك میرا تەلەفۆنی کرد، دوای ئەوەی سڵاوی کرد گوتی: زۆر داوای لێبوردن دەکەم ئەندازیار، بەڕاستی نازانم چۆن چۆنی و کێ ئەو وێنانەی گرتوون و بڵاوی کردوونەتەوە، من زۆر داوای لێبوردن دەکەم ئەگەر بە هۆی ئەو چەند ڕۆژە کەمەوە کەسایەتیی پاکی ئێوە بە هۆی کەسایەتیی پیسی من بەدناو ببێت.

منیش وەڵامم دایەوە: شتێکی وا نییە، خوا بەخێری بگێڕێت.

میرا گوتی: دەزانم ئەو داواکارییەی ئێستام قورسە، بەس حەز دەکەم ئەمڕۆ گەر کاتت هەیە یەکتری ببینین.

منیش ئەو کاتە لای حاجی کەمال بووم، نەمدەتوانی وەڵامی بدەمەوە و بڵێم باشە دێم، بۆیە پێم گوت: ئێستا تۆزێك ئیشم هەیە، دوایی پەیوەندیت پێوە دەکەمەوە.

حاجی کەمال بەنیگەرانییەوە پێی گوتم: ئەندازیار، واز لەو کچە بهێنە، ئەوەی لەسەر تۆ بوو کردووتە، تەواو با لەمەودوا خۆی بۆخۆی بڕیار بدات چی بکات.

منیش بەڕێزەوە وەڵامم دایەوە و گوتم: حاجی گیان، ناتوانم لە نیوەی ڕێگا واز لەو کچە بهێنم، ئەو دەستی یارمەتی و هاوکاریی

بۆمن درێژ کردووە، پیاو یا دەستی یارمەتی بۆ کەسێك درێژ نەکات، یا کە درێژی کرد تاوەکوو بەیەکجاری ڕزگاری نەکات ئەو دەستە بەر نادات.

پاش ئەوە حاجی کەمال ڕۆیشت، هاوڕێکانم و هەرکەسێك منی ناسیبایە پەیوەندیی پێوە دەکردم. دوای ئەوەی ماوەیەك پشووم دا، مۆبایلەکەم بە دەستەوە گرت و تەلەفۆنم کرد بۆ میرا، ڕاستەوخۆ وەڵامی دایەوە و گوتی:

ـ بەڵێ ئەندازیار.

ـ ببورە پێشتر خەڵکم لا بوو، بۆیە نەمتوانی وەڵامت بدەمەوە.

ـ من داوای لێبوردن دەکەم، بە هۆی منەوە تۆش تووشی کێشە بوویت و بوومە مایەی سەرئێشە بۆت.

ـ نا نا، بە هیچ جۆرێك.

ـ لە تەلەفۆنی پێشووتر پێم گوتی حەز دەکەم بتانبینم لە شوێنێك گەر ئێوە بەلاتانەوە ئاسایی بێت.

ـ من لە خزمەتتدام، بەڵام شوێنەکە؟

ـ خەمت نەبێت، شوێنەکە هیی هاوڕێیەکی نزیکمە و جێگای متمانەیە.

ـ زۆر باشە. شوێنەکەم بۆ بنێرە با منیش بێم بۆ ئەو شوێنە.





سەعات دوو بوو، مۆڵەتم لە حاجی کەماڵ وەرگرت و پێم گوت: دەڕۆم بۆ شوێنێك. وا هەستم کرد دەیزانی بۆ کوێ دەچم، بەڵام هیچی نەگوت. دوای ئەوەی ڕۆیشتم بۆ ئەو شوێنەی کە میرا بۆی ناردبووم. کاتێك گەیشتم، دوای ئەوەی سڵاومان لە یەکتری کرد، میرا گوتی:

ـ دەزانم ئێستا کاتی ئەو یەکتربینینە نییە، بەڵام ئەوەی ئێستا باسی دەکەم بۆ من زۆر لەوە گرنگترە کە خەڵکی باسی دەکەن و پۆستی لەسەر دەکەن. پێش ئەوەی دەست پێ بکەم، دەزانی ئەمڕۆ داوام لە یاران و بارانیش کرد کە بێن لەگەڵم، پێم گوتن ئێمە وا خەریکە تەنها خۆمان فریو دەدەین و فێڵ لە خۆمان دەکەین و قسەکانی تۆم بۆ باس کردن، پێم گوتن وەرن با بەیەکجاری تۆبە بکەین و پەشیمانیی خۆمان دەر ببڕین، بەڵکوو خوای گەورە لێمان خۆش بێت. دەزانی یاران چ وەڵامێکی منی دایەوە. پێی گوتم: ئەو خوایەی بۆ ئێمەیان باس کردووە لە تەمەنی هەشتاساڵیش تۆبە بکەیت لێت خۆش دەبێت، مادام وایە، جارێ گەنجین با چێژ لەو ژیانەمان ببینین.

سەیرێکم کرد و بە ئاهێکەوە گوتم: قسەکەی یاران تەواوە، خوا لە تەمەنی هەشتا ساڵیش بەندەکەی تۆبە بکات تۆبەکەی لێ قبوڵ دەکات، بەڵام چ گرنتییەك هەیە کە ئاخۆ ئەو هەشتا ساڵ دەژیت یان نا. ئایە مۆڵەتی ئەوەی دەبێت تۆبە بکات.

میرا: شەو کاتێك چوومەوە نەمدەتوانی بخەوم، هەر بیرم لای ئەو شتانە بوو کە تۆ پێت گوتم، بیرم دەکردەوە ئایە دەکرێت پاش ئەو هەموو گوناهـ و تاوانەی ئەنجامم داوە خوا لێم خۆش بێت. ئایە کچێك تاوان نەمابێت نەیکردبێت، ئێستا هەر بەڕاست تۆبە بکات خوا لێی خۆش دەبێت و پاکی دەکاتەوە؟

وڵامم دایەوە: بێگومان خوا لێخۆشبووە، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکوو کاتێك تۆبە دەکەیت خوا خراپەکانیشت دەگۆڕێت بۆ چاکە. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت: [إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا] سورەتی الفرقان ئایەتی ٧٠. کاتێك بەندەیە لە بەندەکانی خوا تاوانێك دەکات، هەڵەیەك دەکات، پاشان بەئاگا دێتەوە و دەزانێت لەناو خراپەکاریدا بووە و بۆ تۆڵەکردنەوە و قەرەبووکردنەوەی ئەو کاتەی کە خەریکی خراپەکردن بووە دەست دەکات بە ئەنجامدانی کاری باشە، ئەوە ئەو کات خوای گەورە بە بەخشندەیی و میهرەبانیی خۆی هەموو ئەو هەڵانەی کە ئەنجامیشی داوە پێشتر، دەگۆڕێت بۆ چاکە، چوونکە ئەو خوایە لێخۆشبوو و میهرەبانە.

ـ ئەوە بەڕاستتە؟ واتا خوا لە من خۆش دەبێت؟

ـ بێگومان خوا بۆخۆی لە قورئاندا دەفەرمووێت: [نَبِّئْ عِبَادِي أَنِّي أَنَا الْغَفُورُ الرَّحِيمُ] سورەتی الحجر ئایەتی ٤٩. واتا: ((خوا خۆی





فەرمانی کردووە بە نێردراوەکەی، کە پێغەمبەرە، کە بە بەندەکانم ڕابگەیەنە کە تەنها من لێبوردە و میهرەبانم)). پێغەمبەریش مژدەیەکمان پێ دەدات و دەفەرموویێت: لَوْ أَخْطَأْتُمْ حَتَّى تَبْلُغَ خَطَايَاكُمُ السَّمَاءَ ثُمَّ تُبْتُمْ لَتَابَ عَلَيْكُمْ. ئەگەر تاوانەکانی ئێوە بگاتە ئاسمان، واتا ئەوەندە تاوانتان زۆر بێت، بەڵام پاشان لە دڵەوە داوای لێخۆشبوون بکەن، ئەوا خوا لە تاوانەکانتان خۆش دەبێت.

ـ ئێستا من پێویستە چی بکەم بۆ ئەوەی منیش وەکوو تۆ ببمە موسڵمان؟

ـ هەموو ئەوەی سەرەتا پێویستتە، ئەوەیە بڵێیت: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

ـ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

میرا دەستی کرد بە گریان لە کاتی شەهادەهێناندا و پاشان بەگریانەوە گوتی:

ـ واتا تەواو، منیش ئێستا وەکوو تۆ موسڵمانم؟

ـ بەڵێ، ئێستا تۆش وەکوو من موسڵمانی.

میرا بەگریانەوە زەردەخەنەیەکی کرد، میرا زۆر خۆشحاڵ دیار بوو، ڕاستی من لەو گەلێك خۆشحاڵتر بووم کە بینیم ئەو چەند ڕۆژەی لەگەڵ ئەو بەڕێم کرد، ڕۆژانێك بوون بەرهەمیان هەبوو.

دوای پێنج خولەك میرا بەخەمبارییەوە گوتی:

ـ ئەندازیار ئێستا چی بکەم، خۆ (عیسا یاسین) بزانێت من موسڵمان بووم و واز دەهێنم لەو نیش و کارانەی ئەوان، وا بەئاسانی لێم ناگەڕێت.

بەسەرسامییەوە وەڵامم دایەوە و گوتم: بۆچی؟ ئەو چ پەیوەندییەکی بەوەوە هەیە تۆ موسڵمان بیت یان نا.

ـ چۆن نییەتی، مەگەر تا ئێستا من لای ئەوان کارم نەکردووە، ئاگاداری هەموو شتێکیانم، دڵنیام وا بەئاسانی دانانیشن، بۆی هەیە بشمکوژن. لە پێناو ئەوەی دەیزانم ئاشکرای نەکەم.

میرا بەگریانەوە گوتی: تکات لێ دەکەم ئەندازیار، بەتەنها جێم مەهێڵە، مەهێڵە جارێکی تر بکەومەوە دەستی ئەو گورگە پیسانە.

منیش وەڵامم دایەوە: دڵنیا بە بەتەنها جێت ناهێڵم.

دوو-سێ خولەکێك ڕۆیشت، هیچکامێکمان هیچمان نەگوت، پاش ئەوەی بەباشی بیرم لێ کردەوە، ڕووم کردە میرا و پێم گوت:

ـ هیوادارم بەهەڵە لێم تێنەگەیت، دڵنیا بە جگە لە نیەتی خێر، نیەتێکی ترم نییە.

لێرەدا شەرمم کرد و نەمدەزانی چۆن قسەکانی دواترم بکەم، بەڵام هەر جۆرێك بێت خۆم کۆ کردەوە و بە میرام گوت:





ـ هاوسەرگیری لەگەڵ من دەکەیت؟

میرا کاتێك گوێبیستی ئەو قسانە بوو، تووشی سەرسوورمان بوو و گوتی:

ـ ببورە، چیت گوت؟

وڵامم دایەوە و پێم گوت: هاوسەرگیری دەکەیت لەگەڵ من.

میرا گوتی: باوەڕ بە گوێچەکەکانی خۆم ناکەم، هەر بەڕاست تۆ دەتەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ من بکەیت؟ چۆن دەبێت کوڕێکی پاکی وەکوو تۆ لەگەڵ کچێکی پیسی وەکوو من هاوسەرگیری بکات؟ نا، نابێت، من نامەوێت تۆش بە هۆی منەوە تووشی گرفتی زیاتر بیت، هەر ئەوەی ئەمڕۆ لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان پێیان گوتی چەند ناخۆش بوو، هەرکەسێك بێ ئەوەی بزانێت چی دەڵێت قسەی پێ دەگوتن، ئەی سبەی دەبێت خەڵکی چیی ترت پێ بڵێن. نا من نامەوێت تۆش تووشی کێشەی زیاتر بکەم. نامەوێت بە هۆی منەوە ئەو کەسایەتی و ئیش و کارەی ئێستا هەتە لەدەستی بدەیت.

وەڵامی میرام دایەوە و پێم گوت: بەڵێ، دەمەوێت هاوسەرگیریت لەگەڵ بکەم گەر تۆ ڕازی بیت، ئینجا دڵنیات دەکەمەوە ئێستا ئێوە لە من پاکترن و ئێوە ئێستا کەسێکی ترن. دڵنیام خوا لەگەڵمانە و یارمەتیدەرمان دەبێت و هەر کێشەیەکیش بێتە ڕێمان، پێکەوە تێی دەپەڕێنین.

ـ دڵنیام ئێوە لە خەمخۆریتان بۆ من و بەزییهاتنەوە بە حاڵی من ئەو قسەیە دەکەن، من نامەوێت ئەمڕۆ تۆ بڕیارێك بدەیت سبەی لێی پەشیمان ببیتەوە. نامەوێت سبەی منداڵەکانت بزانن منێکی پیس دایکیانم و شەرم بکەن لەوەی بە ژنێکی خراپی وەکوو من بڵێن دایکە.

ـ دڵنیا بە لەوەی نە من پەشیمان دەبمەوە، نە منداڵکانیشمان شەرم لە هەبوونی دایکێکی وەکوو تۆ دەکەن، دڵنیا بە شانازییش بەوەوە دەکەن کە ژنێکی وەکوو تۆ دایکیانە.

میرا دەیویست شتێك بڵێت، بەڵام دیار بوو نەیدەتوانی بیڵێت، شەرمی دەکرد. منیش پێم گوت دەتەوێت شێك بڵێیت، میرا بەشەرمەوە وەڵامی دامەوە و گوتی:

ـ ئەندازیار، ئاگاداری کە من چیتر کچ نەماوم؟

بزەیەکم بۆ کرد و پێم گوت: ئێستا ئێوە کەسێکی ترن، حەزیش ناکەم چیتر بیر لەو کەسایەتییەی پێشترت بکەیتەوە، دڵنیا بە هەموو ئەوەی بەلای منەوە گرنگ بێت، ئەوەیە ئێستا ئێوە موسڵمانن و لەسەر ڕێگای ڕاستن.

ـ ئەی قسەی خەڵکی؟

ـ بۆ من گرنگ نییە خەڵکی چی دەڵێن و چی ناڵێن، هەموو ئەوەی ئێستا بەلامەوە گرنگە، ئێوە ببینم بە دڵخۆشی و ئاسوودەیی.





میرا زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: هەر بەڕاست دەتوانم هاوسەرگیری لەگەڵ تۆ بکەم و منیش وەکوو هەر ژنێکی تر ماڵێکی گەرم و مێردێکی باش و منداڵم هەبێت.

ـ بەڵێ، پشتیوان بە خوا.

ـ ئەی ئێستا چی بکەین.

ـ با هاوسەرگیری بکەین بۆ ئەوەی بەتەواوی و بەئارامی لەگەڵ یەکتری بین. بەڵام ڕاستی، نازانم چۆن چۆنی دەکرێت مارەبڕینەکە ئەنجام بدەین، چوونکە تۆ کەست لێرە نییە، نە باوك، نە برا و هیچکەسێك. بۆیە پەیوەندی دەکەم بە مامۆستایەکەوە بزانین چی بکەین، تۆش بڕۆ خۆت بشۆ و جلێکی داپۆشراو لەبەر بکە. دواتر خۆم پەیوەندیت پێوە دەکەم بزانین چی بکەین.

ـ زۆر باشە.

دوای ئەوە ویستم بڕۆم، تۆزێك لێی دوور کەوتمەوە، بانگی کردم: ئەندازیار.

منیش ئاوڕێکم دایەوە و گوتم: بەڵێ!

زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: ئاگات لە خۆت بێت.

منیش بزەیەکم بۆ کرد و گوتم: بەسەر چاوان.

لە ڕێگادا مۆبایلەکەم دەرهێنا و بۆ ئەوەی پەیوەندی بکەم بە دکتۆر ئیبراهیم سەنگەسەری. لە ڕێگەی یەکێك لە مامۆستاکانمەوە

ئاشنای دکتۆر ئیبراهیم بووم، ئەو کەسایەتییەکی بەهێزی هەبوو، ڕێزی لە هەمووان دەگرت و بە باشە لەگەڵ هەمووان ڕفتاری دەکرد، خاوەنی زانستێکی زۆر بوو، کەسێکی خاکی بوو، هەر ئەوەش وای کردبوو لە دڵی گەورە و بچووك جێگای تایبەتی بۆ خۆی دروست کردبوو، مامۆستاکەم هەمیشە دەیگوت بنەماڵەی دکتۆر ئیبراهیم، کە مەبەستی لە مامۆستا مەلا سلێمانی باپیر و مامۆستا مەلا أحمدی باوکی و مامۆستا ملا علاء الدین، کە دەیکردە مامی دکتۆر ئیبراهیم بوون، دەستێکی باڵایان هەبوو لە هۆشیارکردنەوەی خەڵکی لە ڕووی دیندارییەوە لە ناوچەی پشدەر و پشدەرە ڕەقە و بەتایبەتی خەڵکی گوندی (دووگۆمان). دوای ئەوەی پەیوەندیم پێوە کرد، بەوپەڕی ڕێزەوە وەڵامی دایەوە، بە هۆی ئەوەی پێشتر یەکتریمان دەناسی، ژمارە مۆبایلەکەی منی لا بوو، بۆیە دوای ئەوەی سڵاومان لە یەکتری کرد و لە تەندروستیم پرسی، ئەوەیش ئاگاداری ئەو وێنانە بوو کە بڵاو کرابوونەوە، بۆیە بەکورتی بابەتەکەم بۆ باس کرد و دواتر پێم گوت: دکتۆر گیان، الحمدالله کچەکە موسڵمان بووە و نیەتمان وایە هاوسەرگیری بکەین، بەڵام ئەو هیچکەسێکی لێرە نییە، ئێستا ئێمە چۆن چۆنی مارەبڕینەکە ئەنجام بدەین بەبێ ئامادەبوونی باوکی یا کەسێکی نزیکی. دوای ئەوەی پرسیارەکەم لێ کرد، وەڵامی دامەوە و گوتی: سەرەتا داواکارم لە خوای گەورە ئەو کارەتان بۆ بکاتە توێشووی قیامەت و ببێتە پەردەیەك و پارێزەرێك بۆتان لە ئاگری دۆزەخ و خوا خێر بخاتە هاوسەرگیرییەکەتانەوە، بۆ وەڵامی پرسیارەکەشت،





زانایان کۆدەنگن ناموسڵمان نابێتە وەلیی ئافرەتی موسڵمان، گەر جگە لە باوکی یا برای یان مام یان باپیری موسڵمان بوون، ئەوان مارەی دەکەن. ئەگەر هیچ خزمێکی نەبوو، ئەوا قازیی موسڵمان یان زانایەك مارەی دەکات.

دوای ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەمی دایەوە، زۆر سوپاسم کرد و ئەویش دوعای خێری بۆ کردم و گوتی: خوا سەرکەوتووتان بکات.

لەسەر ڕێگای سەد و بیستی بووم، هێشتا هەندێکم مابوو بگەمە سەر ڕێگای کەرکوك، لەناکاو سەیارەیەك بەخێرایی هاتە پێشم و پێنج کەس بەخێرایی بەرەو ڕووی من هاتن، خێرا منیان لە سەیارەکە دابەزاند و بە لێدان و بەخێرایی سەریان بە شتێك داپۆشیم و منیان خستە ناو سەیارەکەی خۆیان. نازانم بۆ چ شوێنێك منیان برد، بەڵام زۆریان لێدام، بێ ئەوەی بزانم کێن و لەکوێم، هاوارم کرد و گوتم: زۆرم تینووە، تکایە پەرداخێك ئاوم بدەنێ. چاوەکانی منیان بەستبوو، بەڵام هەستم دەکرد کەسێك بەرەو ڕووم دێت، نازانم چی بوو، بەڵام شتێك توند بەر سەرم کەوت و لە هۆش خۆم چووم، کاتێك بەئاگا هاتمەوە، لەبرسان سکم قورەقوڕی بوو و زمانم وشك بوو و نەمدەتوانی هیچ بڵێم، لەناکاو کەسێك هات و چاوەکانی کردمەوە و نەمدەتوانی چاوەکانم بەباشی بکەمەوە بە هۆی ئەو لێدانانەی لە ڕوخساریان دابووم، کاتێك تەماشام کرد، عیسا یاسین لەبەرامبەرم وەستابوو و گوتی: سەیرکە کوڕە، ئەوەی ئێستا پێت دەڵێم دەیکەیتە ئەڵقە و لە گوێتی دەکەیت، واز لەو

ئێوە بهێنە و دەمیشت بەداخراوی دەهێڵێتەوە. گەر وا نەکەیت، دڵنیا بە جارێکی تر لەجیاتیی ئەوەی دەمت دابخەم، سەرت دەبڕم و لە شوێنێکی وا فڕێت دەدەم، هەزار ساڵی تریش لێت بگەڕێن نەتبیننەوە.

دوای ئەوە چاوەکانیان بەستمەوە و منیان خستە ناو سەیارەیەك، لە سەد و بیستی، نزیك فڕۆکەخانە منیان فڕێ دا، شەو بوو، ڕاستی نەمدەزانی سەعات چەندە. جلەکانم هەمووی دڕابوو. هەرچەندە هەوڵم دا سەیارەیەك ڕابگرم، بەڵام کەس ڕای نەدەگرت، تا ئەوە بوو لە کۆتاییدا سەیارەیەك هات و سێ گەنجی تێدا بوون، دوای ئەوەی ڕایان گرت گوتیان: فەرموو کاکە، شتێکت پێویست بوو.

منیش وەڵامم دانەوە: ڕاستی پێویستم بە مۆبایلە گەر یەکێکتان مۆبایلم پێ بدات تەلەفۆنی پێ دەکەم بۆ هاوڕێیەکم.

مۆبایلم پێ نەبوو، هەر لەناو سەیارەکەمدا بوو، ژمارەی مەحویم لەبەر بوو، دوای ئەوەی پەیوەندیم پێوە کرد، چوونکە ژمارەکە لای ئەو نەناسراو بوو، سەرەتا وەڵامی نەدایەوە، دوای ئەوەی دووبارە هەوڵم دایەوە، ئەم جارەیان وەڵامی دایەوە و گوتی: بەڵێ!

کاتێك گوێبیستی دەنگی بووم، زۆر دڵخۆش بووم و گوتم: باشی مەحوی؟ منم موحسین.

مەحوی کاتێك زانیی منم قسەی لەگەڵ دەکەم، گوتی: ئەوە لەکوێیت؟ دەزانی سێ ڕۆژە ئێمە چەند بۆت نیگەران بووین.





کاتێک مەحوی گوتی سێ ڕۆژ، تووشی سەرسووڕمان بووم، بۆیە بەو گەنجانەم گوت: ئەمڕۆ چەند شەممەیە؟

یەکێکیان وەڵامی دایەوە: ئەمڕۆ شەممە بوو.

دوای ئەوە شوێنەکەم بە مەحوی گوت و مۆبایلەکەم بە گەنجەکان دایەوە و سوپاسم کردن، یەکێك لە گەنجەکان گوتی: خۆ پێویستیت بە هیچ نییە، گەر پێویستیت بە شتێکە، من لە خزمەتتدا.

دوای ئەوەی سوپاسم کردن. ئەوان ڕۆیشتن، منیش بە هۆی ئازاری زۆری جەستەم ڕۆیشتم لە کەناری جادەکە دانیشتم، نازانم چەند چاوەڕێم کرد، بەڵام دیار بوو ماوەیەکی باشی ویست، دوای ئەوە سەیارەیەك هات بەرەو ڕووم و گڵۆپەکانی ڕوویان لە من بوو، دوای ئەوەی نزیك بووەوە لێم، گڵۆپەکانی نزم کردەوە، دوای ئەوەی ڕاوەستا بینینم وا هاوڕێکانمن، سەرەتا دکتۆر ئارام دابەزی، پاشان مەحوی و هۆشەنگ و بەڵێنیش بەڕاکردن هاتن بۆ لام، کاتێك بەو شێوەیە منیان بینی، هیچیان پێ نەدەگوترا، بەگریانەوە منیان لەئامێز گرت. منیش پێم گوتن: مەگرین، من باشم.

هۆشەنگ گوتی: ئەوە چیت بەسەر هاتووە؟ کێ وای لێ کردوویت؟

بەڵێنیش گوتی: پەیوەندیی هەیە بەو کچەوە، میرا، وا نییە؟

دکتۆر ئارامیش گوتی: برایان ئێستا وەختی ئەو پرسیار و وەڵامانە نییە، سەرەتا با بڕۆین بۆ ماڵێ ئێمە و تەماشایەکی جەستەی بکەین، بزانم هیچ جێگایەکی نەشکاوە.

مەحوی گوتی: دکتۆر ئارام ڕاست دەکات، با سەرەتا بڕۆینەوە ماڵێ، لەوێ قسە دەکەین.

هاوڕێکانم زۆر بۆ من پەرۆش و خەمبار بوون، ڕاستی نەمدەزانی چۆن سوپاسیان بکەم. لەناو سەیارەدا مەحوی گوتی: حاجی کەمال زۆر بۆت نیگەران بوو، هەموو ڕۆژ تەلەفۆنی دەکرد و پێی دەگوتین هەواڵێکی نوێ نییە لە ئەندازیارەوە، بەڵام کەسێک لەو زیاتر کە وا هەستم دەکرد خەمی تۆی بوو، ئەویش کچەکەی حاجی کەمال بوو، خاتوو نور، ئەمڕۆ پاش بانگی مەغریب دووبارە تەلەفۆنی کردەوە و گوتی: هیچ شتێکی نوێ نازانن لەسەر ئەندازیار موحسین. ئەگەر شتێکی نوێ هەبوو، تکایە خێرا ئاگادارمان بکەنەوە.

دوای ئەوەی گەیشتینەوە ماڵی دکتۆر ئارام، جلەکانم هەمووی دڕابوون و خوێناوی بوون، بۆیە دکتۆر ئارام هەندێك جلوبەرگی خۆی بۆ هێنام بۆ ئەوەی لەبەریان بکەم، پاشان ڕووم کردە دکتۆر ئارام و پێم گوت: دکتۆر زۆرم برسییە، سێ ڕۆژە هیچم نەخواردووە. دوای ئەوەی خێزانی دکتۆر ئارام خواردنی هێنا، من دەستم کرد بە خواردن، بە هاوڕێکانم گوت: ئێوەش وەرن پاروویەك بخۆن.



مەحـــوی و هۆشەنگگوتیان: نۆشـــی گیانت بێت. ئێمە نانمان



خواردووە.

بەڵێن گوتی: مادام هێندە زۆرم لێ دەکەیت، ئەوە من هاتمە پێشەوە.

هەموومان دەستمان کرد بە پێکەنین. دوای ئەوە من و بەڵێن دەستمان کرد بە نانخواردن کە هۆشەنگ گوتی:

پێنجشەممە زۆرم بیر کردبوویت، منیش لە دڵی خۆمدا گوتم با تەلەفۆنێکی بۆ بکەم، بەڵام وەڵامت نەدایەوە، لە دڵی خۆمدا گوتم ڕەنگە سەرقاڵ بێت. پاش سەعاتێك لە مەسێنجەر تەماشام کرد لە خەت بوویت، دووبارە پەیوەندیم پێوە کردیت، بەڵام وەڵامت نەبوو. سەیرم کرد لۆکەیشنت کرابوویەوە، بینیم لە سەد و بیستیت، بە خۆم گوت بە هۆی لێخوڕینی سەیارەوە ڕەنگە مەجالی نەبێت. پاش پازدە خولەك تەماشام کرد لە هەمان شوێن بوویت، زۆر لام سەیر بوو. دوای ئەوە هاتم بۆ هەمان ئەو شوێنە، بینیم سەیارەکەت لەتەنیشت جادەکە وەستاوە، بەڵام تۆی لەناو نەبوو، دەستم برد بۆ دەرگاکە، بینیم دەرگاکە کراوەتەوە و وا مۆبایلەکەش لەناو سەیارەیە. خێرا تەلەفۆنم بۆ بەڵێن کرد و پێم گوت: بە تەکسییەك وەرە بۆ ئەو شوێنەی پێت دەڵێم، بەڵێن گوتی: چی بووە؟ گوتم: تۆ وەرە. دوای ئەوە خێرا تەلەفۆنم کرد بۆ مەحوی و دکتۆر ئارامیش و پێم گوتن: وا سەیارەکەی موحسین لەسەر جادەی سەد و بیستییە و کەچی

ئەندازیار دیار نییە. دوای ئەوەی بەڵێن هات، سەیارەکەی بردەوە بۆ ماڵی خۆیان و ئەوە مۆبایلەکەتە لە بێ شەحنیان کوژاوەتەوە.

ئەو کاتەی هۆشەنگ قسەی دەکرد، من بەردەوام بووم لە نانخواردن، لەپڕێ هەستم کرد دڵم پڕ بووە، خۆم پێ ڕانەگیرا و دەستم کرد بە گریان، خێزانی دکتۆر ئارام کە لەتەنیش دکتۆر ئارام بووم، وا هەستم دەکرد کە منی بەو شێوەیە بینی بەزەیی پێمدا هاتەوە و ئەویش دەستی کرد بە گریان. دکتۆر ئارام هەڵستا تاوەکوو مۆبایلەکە بخاتە ژێر شەحنەوە. دوای ئەوەی فرمێسکەکانم سڕی، ڕووم کردە هاوڕێکانم و پێم گوتن:

ـ بەڕاستی نازانم چۆن سوپاستان بکەم، تەنها ئەوەندە دەڵێم خوا بۆ منتان بهێڵێت.

دوای ماوەیەك مەحوی گوتی: ئەندازیار، بۆمان باس ناکەیت چی ڕووی داوە و بۆچی وایان لێ کردوویت؟

پاش ئەوەی لە نانخواردنەکە بوومەوە، زۆر سوپاسی خێزانی دکتۆر ئارامم کرد بۆ ئەو خواردنە خۆشەی ئامادەی کردبوو. پاشان دەستم کرد بە باسکردنی ئەوەی لەنێوان من و میرا ڕووی داوە و دواتریش کێ بوو ئەو کەسانەی منیان ڕفاند.

هۆشەنگ گوتی: ئەو کچە ئەو ڕۆژەی تۆیان ڕفاندبوو، ئێوارەکەی بە حیجابەوە وێنەیەکی خۆی بڵاو کردەوە و نووسیبووی بوومەتە موسڵمان و ئێستا زۆر خۆشحاڵم بەو حیجابەی پۆشیومە.

بەڵێن گوتی: واتا تۆ لەگەڵ ئەو کچە هاوسەرگیری دەکەیت.

وڵامم دایەوە: بەڵێ، پشتوان بە خوا.

دوای ئەوە بیرم کەوتەوە دەبێت ئەو سێ ڕۆژە میرا چیی کردبێت، بۆیە داوام لە دکتۆر ئارام کرد مۆبایلەکەم بۆ بهێنێت. کاتێك تەماشام کرد، بینیم میرا نۆ جار تەلەفۆنی کردبوو. ڕووم کردە هۆشەنگ، پێم گوت: بۆ وەڵامی ئەو تەلەفۆنانەت نەداوەتەوە؟

هۆشەنگیش گوتی: ڕاستی، هەر ئەو کاتەی گەیشتمە لای سەیارەکە و مۆبایلەکەتم کوژاندەوە.

شەو درەنگی کردبوو، مەحوی و هۆشەنگ و بەڵێن ڕۆیشتن و منیش ویستم بڕۆم، بەڵام دکتۆر ئارام گوتی: ئەمشەو لێرە دەمێنیتەوە، منیش ڕازی بووم. دوای ئەوەی هەرچەندە شەو درەنگی کردبوو، بەڵام بیرم کردەوە باشترە تەلەفۆنێك بکەم بۆ حاجی کەمال و ئاگاداری بکەمەوە کە من باشم. کاتێك تەلەفۆنەکەی هەڵگرت، پاش ئەوەی سڵاوم لێ کرد و لە تەندروستیی حاجی سەبیعە و نورم پرسی، پێم گوت: ئێستا من باشم و لە ماڵی هاوڕێیەکەم.

دیار بوو بە بیستنی دەنگی من و ئەوەی کە من سەلامەتم زۆر خۆشحاڵ بوو. دوای ئەوە گوتی: سبەی چاوەڕێتم لە کۆمپانیا، بۆ ئەوەی قسەی زیاتر بکەین لەسەر ڕووداوەکە.

پاش ئەوەی ماڵئاوایی کرد، خێرا تەلەفۆنێکم کرد بۆ میرا، میرا

ڕاستەوخۆ وەڵامی دامەوە و گوتی: بەڵێ، خۆتیت ئەندازیار؟

منیش وەڵامم دایەوە: بەڵێ خۆمم، ئێوە باشن، تەندروستیان چۆنە؟

میرا دەستی کرد بە گریان و گوتی: توو خوا ببمبورە، بە هۆی منەوە تووشی چ ناخۆشی و ناڕەحەتییەك بوویت.

_ نا، ئەو قسانە مەکە، ڕازین بەوەی خوا بۆی داناوین. پێم بڵێ ئێوە چۆنن؟ دەنگوباستان چۆنە؟ ئەو سێ ڕۆژە چیتان کرد؟

میرا دەستی کرد بە گێڕانەوەی ئەوەی لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژە بەسەری هاتبوو و گوتی: دوای ئەوەی تۆ گوتت بڕۆ خۆت بشۆ و حیجاب بکەم، ڕۆیشتمە بۆ بازاڕ بۆ کڕینی هەندێك سەرپۆش بۆ ئەوەی لەمەودوا بیانپۆشم، دواتر ڕۆیشتمەوە بۆ شوقەکەم، خۆم شۆرد و جلە نوێکانم پۆشی، بەڕاستی هەستێکم هەبوو کە هەرگیز ئەو هەستەم پێشتر هەست پێ نەکردبوو، بەو شێوە جوانەی خۆم پێ دەبینی لە ئاوێنەدا، هەرگیز بە هیچ جلوبەرگێك پێشتر خۆم نەدیتبوو. دواتر دانیشتم و چاوەڕێی تۆ بووم، بەڵام هیچ هەواڵێك نەبوو، پاش ماوەیەك تەلەفۆنم بۆت کرد، وەڵامت نەبوو، زۆر هەوڵم دا، بەڵام هەموو جارەکان هەمان شت بوو، دڵم دەیگوت شتێکی خراپ ڕووی داوە، زۆر نیگەران بووم و دوعام دەکرد هیچت لێ نەهاتبێت. ڕاستی زۆر زۆر خەمبار بووم، نەمدەزانی چی بکەم. پاش ئەوەی ماوەیەك تێپەڕی، وێنەیەکی خۆم گرت بە حیجابەوە و

موسڵمانبوونی خۆم ڕاگەیاند. پازدە خولەکی نەخایەند عیسا یاسین تەلەفۆنی کرد و گوتی: سەیر کە کچێ، زۆر هەڵەیەکی گەورەت کرد، چۆن بێ ئەوەی پرسێك بە ئێمە بکەیت ئەو کارە دەکەیت. دەبێت باجی ئەو کارەت بدەیت. ئێستاش دیارییەکی بچووکم بۆت ئامادە کردووە، سەیری بکە بزانە چییە.

دوای ئەوە تەلەفۆنەکەی داخستەوە، منیش تەماشای ڤیدیۆکەم کرد، کاتێك بینیم تۆی، کە بەو شێوەیە تۆم بینی لەهۆش خۆت چوویبوویت و ڕوخسارت هەمووی خوێن بوو، خۆم ڕانەگرت و دەستم کرد بە قیژاندن و گریان. خێرا پەیوەندیم کردەوە بە عیسا یاسین و پێم گوت: تورو خوا واز لەو کوڕە بهێنە، ئەو کوڕە تاوانی چیی کردووە واتان لێ کردووە، هەموو ئەوەی ئەو کوڕە کردوویەتی تەنها یارمەتیدانی من بووە.

عیسا یاسین بە پێکەنینێکی بەرزەوە گوتی: سەیر کە چۆن بۆی دەپاڕێیتەوە، تاوانی ئەو کوڕە ئەوەیە هاتووە خۆی هەڵدەقورتێنێت لە کاری گەوران، دەبێت باجەکەشی بدات، دەبێت لەناوی ببەم.

منیش بەگریانەوە لێی دەپاڕامەوە: تورو خوا وازی لێ بێنە، ئەو داماوە هیچی نەکردووە، گەر کەسێکیش هەبێت هەڵەی کردبێت، ئەوە منم، دەبێت هەر منیش سزاکەی وەر بگرم.

عیسا یاسین گوتی: گەر تۆ هێندە خەمی ئەو کوڕەتە، ئەوە ڕێگایەك هەیە بۆ ئەوەی ڕزگاری بکەیت.

Scanned with AnyScanner








منیش وەڵامم دایەوە: خێرا پێم بڵێ چییە ئەو ڕێگایە.

عیسا یاسینیش گوتی: شەوێکی تر هەیینییە، لەگەڵ هەندێك لە هاوڕێ بەرپرسەکانم کۆ دەبینەوە بۆخۆمان، دەبێت تۆش بێیت بۆ لامان.

منیش بەگریانەوە گوتم: توو خوا داوای شتێکی تر بکە، من تازە بوومەتە موسڵمان، نامەوێت ئەو کارانە بکەمەوە، خۆ تۆ خۆت موسڵمانی، توو خوا وام لێ مەکە جارێکی تر بگەڕێمەوە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە پیسانە.

بەتووڕەییەوە وەڵامی دامەوە و گوتی: ڕازی دەبیت باشە، دەنا دوایی ناوی ئەو شوێنەت بۆ دەنێرم کە لاشەی ئەو کوڕەمان لێ فڕێ داوە.

منیش بەگریانەوە پێم گوت: تۆ چی بڵێیت ئەوە دەکەم، بەس واز لەو کوڕە بهێنن. بۆیەش ڕازی بووم، چوونکە زۆر باش دڵنیام لەوەی ئەوەی بیلێیت ئەنجامی دەدات، فەرمانکردن بە کوشتنی کەسێك زۆر لای ئاسانترە لەوەی فەرمان بکات بە خزمەتکارەکەی پەرداخێك ئاوی بۆ بهێنێت.

بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: ئەوەش دوای هاتنی تۆ بڕیاری لەسەر دەدەم.

پاش ئەوە تەلەفۆنەکەی داخستەوە، من هەر دڵم لای تۆ بوو. ڕاستی ئێستاش نازانم شەوەکەی چۆن خەوتم. سبەی کاتژمێر دە و

نیو لە خەو هەڵستام، نەمدەزانی چی بکەم، زۆر دڵتەنگ بووم، زانیم ئەمڕۆ هەینییە، بۆیە لە شوقەکەم هاتمە دەرەوە و لەسەر جادەکە لە گەنجێکم پرسی چ مزگەوتێك هەیە لەو نزیکانە شوێنی ژنانیان هەبێت و مامۆستاکەی مامۆستای باش بێت. گەنجەکە وەڵامی دایەوە، لە گەڕەکی بەختیاری مزگەوتی بەختیاری هەیە، شوێنی ژنانیشیان هەیە و مامۆستاکەشی زۆر باشە. دوای ئەوە ڕۆیشتم و مزگەوتەکەم دۆزییەوە، لە نزیکی مزگەوتەکە سەیارەکەم ڕاگرت و لە مامە حاجییەك پرسیم شوێنی ژنان لەکوێیە مامە گیان. ئەویش گوتی: کچی خۆم، بە دەستەچەپدا بڕۆ دەرگایەکی تایبەت هەیە بە ژنان. کاتێك چوومە ژوورەوە، گریام و دڵم چەند خۆش بوو کاتێك بینیم زۆرێکیان پۆشاکێکی سپییان لەبەر بوو و هەموو جەستەیانی داپۆشیبوو. لە کچێکی سێ-چوار ساڵانەوە تاوەکوو ژنی بەتەمەن، گشتیان بەڕیز لەتەنیشت یەکتری دانیشتبوون، ڕاستی من هیچم لە نوێژ و ئادابەکانی مزگەوت نەدەزانی، بۆیە چاوەڕێ بووم کەسێکی تازە بێت و ئەو چیی کرد منیش وەکوو ئەو بکەم، دوای ئەوەی کچێك هات، منیش ڕۆیشتمە تەنیشتی و هەمان ئەوشتانەم کرد کە ئەو ئەنجامی دان، دواتر دانیشتین چاوەڕێمان کرد تاوەکوو مامۆستاکە دەستی کرد بە وتارخوێندنەوە، ڕاستی وتەکانی وەکوو بارانێك بوون بۆ بیابانێکی تینوو، دڵم بە قسەکانی ئارام بوویەوە، هەستم بە تام و چێژی ئیمان دەکرد، مامۆستایەکی زۆر گوفتارشیرین بوو، تۆ ناوەکەی نازانی ئەندازیار؟

منیش وەڵامم دایەوە: بەڵێ، هەم ناوەکەی دەزانم، هەمیش دەیناسم، ئەوە دکتۆر عوسمان هەڵەبجەیییە ، یەکێکە لە باشترین و دیارترین کەسایەتییە ئیسلامییەکانی کوردستان. منیش هەرکاتێك مەجال هەبوویێت بۆ نوێژی هەینی یان شەوانی قەدر لەگەڵ هاورێکانم دەچین بۆ مزگەوتەکەی ئەو.

میرا بەردەوام بوو و گوتی: هەموو ئەو کاتانەی ژنەکان دەستیان بەرز دەکردنەوە بۆ دوعاکردن، من تەنها یەك دوعام دەکرد، ئەویش سەلامەتیی تۆ بوو، دوای ئەوەی دکتۆر عوسمان لە وتارەکەی تەواو بوو، گەڕامەوە بۆ شوقەکەم، هەستێکی زۆر جیاوازم هەبوو لەناو ئەو جلوبەرگە، بەڵام کە بیرم دەکردەوە ئەمشەو دەبێت بگەڕێمەوە بۆ دۆزەخەکەی پێشتر، نیگەرانی ڕووی تێ دەکردم. دوای ئەوەی شەو داهات ڕۆیشتم بۆ ئەو ڤێلایەی عیسا یاسین کە خۆی و پێنج هاوڕێی تری لەوێ بوون. کاتێك منیان بینی، دەستیان کرد بە گاڵتەپێکردنم و یەکێکیان گوتی: سەیر کەن کچە سۆزانییەکەمان تۆبەی کردووە، بەڵام بیری ئامێزی ئێمەی کردووە.

هەموویان دەستیان کرد بە پێکەنین، هەموویان سەرخۆش بوون. ئەو شەوە بە هەرشەشیان چییان حەز لێ بوو لەگەڵیان کردم، دوای ئەوە ڕووم کردە عیسا یاسین و پێم گوت: ئەوە تۆ چیت لە من ویست ئەنجامم دا، تۆش ئێستا ئەو کوڕە ئازاد بکە و هیچی لێ مەکە.







عیسا یاسین بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: جارێ نیوەگیانە، لە هۆش خۆی چووە، سبەی بەئاگا هاتەوە بە پیاوەکانم دەڵێم ئازادی بکەن.

شەو کاتێک گەیشتمەوە شوقەکەم زۆر گریام، شەویش لەسەر جێگا هەر بیرم لە تۆ دەکردەوە تاوەکوو خەو بردمیەوە، سبەی کە هەڵسام، هەر چاوەڕێی تەلەفۆنی تۆ بووم تاوەکوو ئێستا.

کاتێک میرا ئەو قسانەی دەکرد، خۆم پێ نەگیرا و دەستم کرد بە گریان، بەڕاستی زۆر ناڕەحەت بووم بەوەی تەنها بۆ ئازادکردنی من ناچار کراوە بگەڕێتەوە سەر ئەو کارە قێزەونانە. نەمدەزانی چیی پێ بڵێم، بەگریانەوە پێم گوت: میرا، خۆت ئامادە بکە سبەی زوو دێم بەدواتا بۆ ئەوەی بچین بۆ لای مامۆستا و مارەبڕینەکە ئەنجام بدەین.

دوای ئەوەی ماڵئاواییم کرد لە میرا، ڕۆیشتمەوە بۆ لای دکتۆر ئارام و پێم گوت: دکتۆر، دەبێت سبەی ئێوە بێن لەگەڵم بۆ ئەوەی بچین مارەبڕینەکە ئەنجام بدەین.

دکتۆر ئارامیش وەڵامی دایەوە: زۆر باشە، هەواڵ دەنێرم بۆ مەحوی و هۆشەنگ و بەڵێنیش بۆ ئەوەی بێن.

پێش ئەوەی بڕۆین بخەوین، دکتۆر ئارام گوتی: وەرە با سەیرێکی جەستەت بکەم بزانم هیچ شوێنێکت شین و مۆر نەبۆتەوە.

دوای ئەوەی تەماشای پشت و سینگی کردم، گوتی: إن شاء الله هیچ شتێکی وا نییە جێگای مەترسی بێت. ئەو ئاسەواری لێدانەش ماوەیەکی تر نامێنێت.

سبەی زوو تەلەفۆنم بۆ میرا کرد، پاش ئەوەی سڵاوم لێ کرد، پێم گوت: خۆت ئامادە کردووە؟

میراش وەڵامی دایەوە: وا خەریکم، تۆزێکی تر ئامادە دەبم.

پاش ئەوەی لەگەڵ میرا تەواو بووم، دکتۆر ئارام گوتی: تەلەفۆنێکم کردووە بۆ بەڵێن بۆ ئەوەی سەیارەکەت بۆ بهێنێتەوە.

دوای بیست خولەك بەڵێن هات و سەیارەکەی هێنایەوە و گوتی: ئەوەش سویچی سەیارەکەت برا گیان.

منیش وەڵامم دایەوە: زۆر سوپاس برا گیان.

پاش ئەوە من ڕۆیشتم بۆ لای میرا، کاتێك گەیشتمە بەردەرکی شوقەکە، تەلەفۆنم بۆ میرا کرد، دوای سێ-چوار خولەکێك میرا بە جلێکی قاوەیی کاڵەوە هاتە خوارەوە، باوەڕم بە چاوەکانم نەبوو ئەو میرایە میرای پێشتر بێت، ئەو جلانە ئەویان زۆر جوانتر کردبوو.

پێش ئەوەی بگاتە لای من، من لە سەیارەکەم دابەزیم، ڕۆیشتم دەرگای سەیارەکەم بۆ کردەوە و پێم گوت: فەرموو خانمی خانمان.

میرا زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: زۆر سوپاس.





دوای ئەوە بەڕێ کەوتین بۆ لای ئەو مامۆستایەی بڕیار بوو لە یەکتریمان مارە بکات. پاش ئەوەی گەیشتینە لای مزگەوتی ئەو مامۆستایە، بینیم وا مەحوی و هۆشەنگ و بەڵێن و دکتۆر ئارام و خێزانی لە بەردەمی دەرگای مزگەوتەکە چاوەڕێ دەکەن. پاش ئەوەی سڵاومان لە یەکتری کرد، ڕۆیشتینە ژوورەوە و لە ژوورەوە دوای ئەوەی مامۆستا وەکوو وەبیرهێنانەوەیەك باسی گرنگیی هاوسەرگیریی کرد، کاتێك مامۆستا لە قسەکانی تەواو بوو، ڕووی کردە من و گوتی: بووکە خان لەسەر چەند مارە ببڕین؟

منیش ڕووم کردە میرا و پێم گوت: ئەوە مافێکی شەرعیی خۆتە، چەند داوا دەکەیت داوا بکە.

میرا ڕووی کردە مامۆستاکە و گوتی: تێچووی عەمرەیەك. با عەمرەیەك مارەییەکەم بێت.

پاش ئەوەی من و میرا بووین بە هاوبەشی شەرعیی یەکتری، دەستم خستە ناو دەستی میراوە و توند گوشیم، پاشان ڕۆیشتین بۆ دادگا بۆ ئەوەی کاروبارە یاساییەکانیش تەواو بکەین. لەناو سەیارەکەدا میرا ڕووی کردە من و گوتی:

ـ وا هەست ناکەم ئێستا کەس هەبێت لە من خۆشحاڵتر بێت.

منیش وەڵامم دایەوە: با، هەیە.

میرا بەسەرسامییەوە گوتی: کێیە؟

منیش گوتم: من.

هەردووکمان دەستمان کرد بە پێکەنین.

پاش ئەوەی گەیشتینە بەردەمی دادگا، پێش ئەوەی لە سەیارەکەم دابەزین، مۆبایلەکەم زەنگی لێدا، کاتێك تەماشام کرد ژمارەیەکی نەناسراو بوو. وەڵامم دایەوە و گوتم: بەڵێ.

دەنگێك هات کە وا هەستم دەکرد پێشتر ئەو دەنگەم گوێ لێ بووە. گوتی: زۆر لەوە زیاتر ڕۆیشتی کە ئێمە چاوەڕێمان دەکرد، سەیر کە کوڕە، ئەوەی ئێستا پێت دەڵێم ئەنجامی نەدەیت. نیوکاتژمێری تر نابات هەرچیی وێنە و ڤیدیۆی نەشیاوی میرایە بڵاوی دەکەمەوە. ئەویش دوو شتە، یەکەم بە حاجی کەمال دەڵێیت لەو پڕۆژەیەی بەنیاز بوو وەری بگرێت پاشەکشە بکات و دووەمیشیان هەرچیی زووە لەو وڵاتە نەمێنی.

نەیهێشت من هیچ بڵێم، تەلەفۆنەکەی داخستەوە، دوای ئەوەی تەلەفۆنەکە تەواو بوو، میرا گوتی: شتێك ڕووی داوە.

وەڵامم دایەوە: نا، شتێکی وا نییە، تۆ برۆ ژوورەوە، ئێستا منیش دێم.

ویستم تەلەفۆن بکەم بۆ حاجی کەمال، بەڵام بیرم کەوتەوە حاجی کەمال چەند حەزی لێ بوو ئەو پڕۆژەیە بۆ ئەو بایە، بیرم دەکردەوە بۆچی دەبێت حاجی کەمال واز لەو شتە بهێنێت کە خەونی





لەمێژینەیەتی. ئایە ئامادەیە واز بهێنێت لەو پرۆژەیە تەنها لەبەر ئێمە و ئەو هەموو پارەیە لەدەست خۆی بدات. دڵنیا نەبووم، بەڵام ناچار بووم تەلەفۆنی بۆ بکەم. دوای ئەوەی تەلەفۆنم بۆ کرد: زۆر خۆشحاڵ بوو بە بیستنی دەنگی من و گوتی: کوڕم، ئەوە چیت لێ هات، دەزانی هەموومان چەند بۆت پەرۆش بووین. ئەی ئێستا لەکوێیت؟ چی دەکەیت؟

وڵامم دایەوە و گوتم: زۆر سوپاس حاجی گیان بۆ بەخەمەوەبوونتان بە منەوە، ئێستا وا لە بەردەم دادگادام، خەریکین لەگەڵ میرا کاروباری یاسایی مارەبڕینەکەمان تەواو دەکەین، ببورە کە بەبێ ئاگاداریی تۆ ئەو کارەمان ئەنجام دا.

حاجی کەمال گوتی: ئەوەی بۆ من گرنگە، ئەوەیە تۆ ساغ و سەلامەت بیت.

نەمدەزانی چۆنی پێ بڵێم، بۆ من زۆر قورس بوو، ماوەی سی چرکە ڕۆیشتبوو و من هیچ قسەیەکم نەدەکرد.

حاجی کەمال گوتی: شتێك بووە یان پارەت پێویستە و شەرم دەکەیت داوای بکەیت.

وەڵامم دایەوە: زۆر سوپاس حاجی گیان، ئەوەی پێویستیم پێی نییە پارەیە، بەڵام کێشەیەك هاتۆتە پێش.

حاجی کەمال بە دەنگێکی بەرز گوتی: چ کێشەیەك؟









پێم گوت: عیسا یاسین هەیە بەرپرسە و خەریکی پڕۆژە و شتە.

حاجی کەمال گوتی: بەڵێ دەیناسم، بۆ چی بووە؟

وەڵامم دایەوە و گوتم: ڤیدیۆ و وێنەی نەشیاوی میرای لایە، هەڕەشەی ئەوەی کردووە لێم ئەگەر تۆ لەو پڕۆژەیە پاشەکشە نەکەیت و ئێمەش بە زووترین کات وڵات جێ نەهێڵین، ئەوا ئەو وێنە و ڤیدیۆیانە بڵاو دەکاتەوە.

حاجی کەمال ماوەیەك هیچی نەگوت، پاشان گوتی: مەرجی یەکەم زۆر ئاسانە، ئەوەی زۆر قورسە مەرجی دووەمە، ئەویش جێهێشتنی وڵاتە و دەربەدەربوون. کوڕم سەیر کە، ڕاستە زۆر حەزم دەکرد ئەو پڕۆژەیە بۆ من بایە، بەڵام باوەڕ بکە هەموو ئەو پارەیەی هەمە و لەو پڕۆژەیە دەستم دەکەوێت دەیکەمە قوربانیی تۆ و هاوسەرت، لای من پاراستنی شەڕەف و ناموسی خەڵکی لە هەموو پارەی دونیا گەورەترە.

وەڵامم دایەوە: بەڕاستی نازانم چۆن سوپاست بکە حاجی گیان، ئەوەی تۆ بۆ منت کردووە، باوك بۆ کوڕی خۆی نایکات.

حاجی کەمال وەڵامی دایەوە و گوتی: تۆش وەکوو کوڕی من وایت و بەو ناپیاوانەش بڵێ حاجی کەمال ئامادەیە پاشەکشە بکات لەو پڕۆژەیە و إن شاء الله خەمێکیش لەوەی دووەم دەخۆین.

دوای ئەوەی تەلەفۆنەکەم تەواو بوو لەگەڵ حاجی کەمال، خێرا پەیوەندیم کرد بە هەمان ژمارەوە و دوای ئەوەی وەڵامی دایەوە.





پێم گوت: ئێمە ڕازین بە دوو مەرجەکە، بەڵام داواکاریم ئەوەیە پازدە-بیست ڕۆژێك مۆڵەتم بدەیت تاوەکوو وڵاتێك دەبینینەوە بۆ ئەوەی بۆی بچین.

ئەویش گوتی: بیست ڕۆژ زۆرە، بەڵام ئەوە پازدە ڕۆژ، دوای ئەوە دەڕۆن و ئێرە جێ دەهێڵن و جارێکی تر نایەنەوە بۆ ئێرە.

منیش وەڵامم دایەوە: زۆر باشە.

میرا دیار بوو زۆر لە ژوورەوە چاوەڕێی کردبوو، بۆیە هاتە دەرەوە و گوتی: شتێك بووە؟ بۆچی نایەیتە ژوورەوە.

وەڵامم دایەوە: ئەوە هاتم، یەڵا با پێکەوە بڕۆینە ژوورەوە.

پاش ئەوەی کاروباری یاساییشمان تەواو کرد، لە دەرەوە لەگەڵ هاوڕێکانم کۆبووینەوە و مۆڵەتمان لێ وەرگرتن بۆ ئەوەی ڕێگە بدەن من و میرا بڕۆین. پاشان ئێمە ڕۆیشتین لەگەڵ میرا، لەناو سەیارەدا میرا گوتی: ئەندازیار وێنەیەك بگرین و بڵاوی بکەمەوە بۆ ئەوەی خەڵکیش بزانێت لەمەودوا ئێمە هاوسەری یەکترین.

بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامم دایەوە: بۆ نا با بیگرین، بەس لەمەودوا بە موحسین بانگم بکە.

میراش زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: زۆر باشە.

دوای ئەوەی وێنەکەمان گرت و میرا پۆستی کرد، بە میرام گوت: شتێك هەیە دەمەوێت پێتی بڵێم.

میرا بە نیگایەکی خەمگینەوە گوتی: چ شتێک.

وەڵامم دایەوە: عیسا یاسین تەلەفۆنی کرد و هەڕەشەی ئەوەی کرد ئەگەر حاجی کەمال لەو پڕۆژەیەی بەنیازە وەری بگرێت نەکشێتەوە و ئێمەش کوردستان جێ نەهێڵین، ئەوا وێنە و ڤیدیۆی تۆی لایە بڵاوی دەکاتەوە، خۆشبەختانە حاجی کەمال ڕازی بوو واز لەو پڕۆژەیە بهێنێت و بکشێتەوە، ئێستا ماوە بیرێك لەوە بکەینەوە بچین بۆ کوێ.

میرا دەستی خۆی نا بە دەمیەوە و گوتی: چی؟ من ئەو ناپیاوە دەناسم، دەزانم چ ئاژەڵێکە، هەرشتێك بڵێت ئەنجامیشی دەدات.

میرا دەستی کرد بە گریان، منیش ڕۆیشتم بۆ لای و لەئامێزم گرت و ماچێکم لە سەری کرد و پێم گوت: ئارام بەوە، هەموو شتێك باش دەبێت. ئێستاش حەز دەکەم بڕۆین بۆ ماڵی حاجی کەمال و سوپاسی بکەین لەسەر هەموو ئەو شتانەی بۆ ئێمەی کردووە، بەڵام پێش ئەوە با بچین بۆ مزگەوت و نوێژی نیوەڕۆ بکەین.

میرا گوتی: من نوێژ نازانم.

پێم گوت: هێواش-هێواش فێر دەبیت.

پاشان ڕۆیشتین بۆ مزگەوت و نوێژمان کرد، میرا گوتی: برسیمە.

ڕۆیشتین لە خواردنگەیەك نانمان خوارد و پاشان ڕۆیشتین بۆ ماڵی حاجی کەمال. دوای ئەوەی گەیشتینە بەردەرکی ماڵی حاجی





کەماڵ، من زەنگەکەم لێدا، پاش ماوەیەك نور هات دەرگای لێمان کردەوە و بە زەردەخەنەیەکەوە بەخێرهاتنی کردین بۆ ژوورەوە و ئێمەش ڕۆیشتینە ژوورەوە، دوای ئەوەی گەیشتینە هۆڵە گەورەکەی ماڵەکەیان، حاجی کەمال لەگەڵ حاجی سەبیعە هاتن بۆ پێشوازیمان و حاجی کەمال منی لەباوەش گرت و پێی گوتم: دەزانی ئەو چەند ڕۆژە چەند خەمی تۆمان بوو. ماشاء الله پیرۆزی یەکتریش بن و بەبەختەوەری ژیان بکەن. دوای ئەوەی بۆ ماوەیەك پێکەوە لە هۆڵەکە دانیشتین، حاجی کەمال گوتی: ئەندازیار بڕۆین لەناو باخچەکە پیاسەیەك بکەین. منیش وەڵامم دایەوە: فەرموو لە خزمەتتدام.

دوای ئەوەی ڕۆیشتین بۆ ناو باخچەکە، حاجی کەمال گوتی: ئەندازیار، بیرت نەکردۆتەوە بۆ چ شوێنێك بڕۆن؟

وەڵامم دایەوە: ئەوەی ڕاستی بێت حاجی گیان نازانم چی بکەم، نازانم ئێستاش کاتەکەی گونجاوە یان نا، بەڵام دەمەوێت لەگەڵ میرا عومرەیەك ئەنجام بدەم بۆ ئەوەی میرا دڵی ئارام بێتەوە. بۆ بابەتی جێهێشتنی وڵاتیش، هەرگیز بۆ ساتێکیش بیرم لەوە نەکردبوویەوە ڕۆژێك دابێت دەبێت ئەو کوردستانە ئازیزە جێ بهێڵم، بەڵام وا ئێستا ناچارم و دەبێت بڕیار بدەم و شوێنێك هەڵبژێرم. تاکە شوێنێکیش بە خەیاڵمدا بێت بەریتانیایە، بڕۆم بۆ لای ئامۆزای باوکم کە ساڵانێکی زۆرە کوردستانی جێ هێشتووە. ڕەنگە ئەو بتوانێت یارمەتییەکمان بدات.

حاجی کەمال پرسیی: ئەو ئامۆزایەی باوکت چ کارێك دەکات لە بەریتانیا؟

وەڵامم دایەوە: ڕاستی زۆر ئاگادار نیم چ کارێك دەکات. بەڵام پوورم بۆی باس کردم جارێك، کە باوکم ئامۆزایەکی هەبووە و حەزی لە ژیانی گوندی و شوانی نەبووە، بۆیە بڕیار دەدات بڕوات بۆ دەرەوەی وڵات و لە کۆتاییدا گەیشتبوو بە بەریتانیا.

حاجی کەمال دووبارە پرسییەوە: ئەی ناوونیشان، شتێکی دەزانی، یا شتێکی ئەوت لایە بتوانی پەیوەندیی پێوە بکەیت.

وەڵامم دایەوە: ئەوەی ڕاستی بێت هیچ شتێکی دەربارەی نازانم، ڕەنگە مێردی پوورم حاجی صالح بتوانێت ناوونیشانێك یا ژمارە تەلەفۆنێك پەیدا بکات بۆم.

حاجی کەمال گوتی: گەر مێردی پوورت بتوانێت ژمارە تەلەفۆنێکی ئەوت بۆ پەیدا بکات، زۆر باش دەبێت، منیش ئەوەی لە توانامدا بێت دڵنیا بە درێخی ناکەم.

بە شەرمێکەوە ڕووم کردە حاجی کەمال و پێم گوت: بەڕاستی نازانم چۆن سوپاست بکەم، ئێوە لە پێناو من وازتان لە یەکێك لە گەورەترین پڕۆژەکانی خۆتان هێنا.

حاجی کەمال دەستێکی خستە سەر شانم و گوتی: کوڕم هەموو شتێك پارە نییە، ئینجا بشزانە دینی ئێمە دینی هەڵوێستە.





پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەموریێت: [گەر هەریەکێك لە ئێوە خراپەیەکی بینی، با هەوڵ بدات بە دەست بیگۆڕێت، گەر هەر نەیتوانی، با بەقسەکردن بێت، گەر نەیتوانی قسەش بکات، با لە دڵەوە بەو کارە خراپە نیگەران بێت کە ئەوەشیان لاوازترین جۆری ئیمانە]. ئەمڕۆ خوا چاکەیەکی لەگەڵ ئێمە کرد بەوەی دەست هەڵبگرین لە شتێکی دونیایی لە پێناو ڕێگریکردن لە خراپەیەك و لەوانەی دەیانەوێت خراپەکاری بڵاو بکەنەوە. دڵنیاشم لەوەی هەرکەسێك لەبەر خوا واز لە شتێك بهێنێت، ئەوا لەبەرامبەردا خوا باشتر لەوەی پێ دەداتەوە.

دوای ئەوە مۆڵەتم لە حاجی کەمال وەرگرت و پێم گوت: ئێمە دەبێت بڕۆین حاجی کەمال. سوپاس بۆ هەموو ئەو شتانەی بۆ ئێمەت ئەنجام دا، ئومێدەوارم خوا مۆڵەتی ئەوەم پێ بدات ڕۆژێك لە ڕۆژان بتوانم وەڵامی ئەو چاکەیەتان بدەمەوە.

حاجی کەمال گوتی: من لە خزمەتی تۆدام ئەندازیار، هەرکاتێك پێویستیت بە یارمەتی هەبوو، ئێمە لە خزمەتتداین، تەلەفۆنێکیش بکە بۆ مێردی پوورت بزانین دەتوانێت ژمارە تەلەفۆنێك، شتێکی ئەو ئامۆزایەی باوکت پەیدا بکات بۆمان، بۆ ئەوەی ئێمەش بتوانین شتێکتان بۆ بکەین.

دوای ئەوەی یەکتریان لەباوەش گرت و ماڵئاواییمان لە یەکتری کرد، دواتر ڕۆیشتینەوە بۆ ژوورەوە و ماڵئاواییمان کرد لە حاجی

سەبیعە و نور و لە ماڵی ئەوان هاتینە دەرەوە، سواری سەیارەکەمان بووین، لەناو سەیارەکەدا میرا زۆر دڵخۆش بوو و زۆری وەسفی حاجی سەبیعە و نور کرد و گوتی: بەڕاستی ماڵێکی زۆر باشن، دایک و کچ یەک لە یەکتری ژیرترن، بەڕاستی نور کچێکی زۆر جوان و ژیرە، دڵنیام ئەو کەسەی نور دەبێت بە هاوسەری زۆر پیاوێکی بەبەختە.

پاشان میرا پرسیی: ئەی ئێستا چی بکەین؟ لەگەڵ حاجی کەمال باسی چیتان کرد.

وەڵامم دایەوە: هەر باسی ئەوەمان کرد کە دەبێت چی بکەین. ئێستا دەبێت تەلەفۆنێک بکەم بۆ مێردی پوورم بۆ ئەوەی زانیارییەك، شتێکمان پێ بدات لەسەر ئەو ئامۆزایەی باوکم.

میرا بەسەرسامییەوە گوتی: ئامۆزای باوکت؟

وەڵامم دایەوە: بەڵێ.

میرا دووبارە پرسییەوە: بۆچی؟

پێم گوت: تا زیاتر لێرە دوور بکەوینە بۆ ئێمە باشترە، دڵنیام عیسا یاسین وازمان لێ ناهێنێت. بۆیە بیرم کردۆتەوە بڕۆین بۆ بەریتانیا، لەوێ ئامۆزایەکی باوکم هەیە، ڕەنگە بتوانێت یارمەتیدەرمان بێت.

میرا گوتی: تۆ بڵێیت مێردی پوورت بتوانێت هیچی دەست بکەوێت.

وەڵامم دایەوە: نازانم، بەڵام جگە لە هەوڵدان، چارەیەکی ترمان نییە.



دوای ئەوە تەلەفۆنم کرد بۆ مێردی پوورم، ماوەیەك چاوەڕێم کرد تاوەکوو وەڵامی دایەوە. گوتی: بەڵێ. منیش گوتم: السلام علیکم باشیت حاجی گیان، ئەحواڵت چۆنە، پوورە زەینەب چۆنە؟

وەڵامی داوە: وعلیکم السلام ئەوە چۆن چۆنی ئێمەت بیر کەوتەوە جەنابی ئەندازیار. الحمدالله هەردووکمان باشین. ئەی تۆ چۆنی. بووکەکەمان چۆنە. ئەوە دەبێت ئێمە لە خەڵکی بزانین کە تۆ هاوسەرگیریت کردووە؟ نیوسەعات پێش ئێستا کوڕی یەکێك لەو دراوسێیانەمان هات بۆ لام و وێنەی ئێوەی پێ نیشان دام، نیازم وا بوو تەلەفۆنت بۆ بکەم، کەچی تۆ کردت.

وەڵامم دایەوە: بەڕاستی حەق بە ئێوەیە و دەبووایە ئێوەم ئاگادار کردبایەوە. بەڵام شتەکە خێرا ڕووی دا.

بەکورتی باسی هەموو ئەو شتانەم بۆ کرد کە لەو ماوە کورتەدا بەسەرمدا هاتبوون و پێم گوت: ئێستاش وا ناچار کراوم کە خۆم و خێزانم وڵات جێ بهێڵم. ئێستاش چاکەیەکم لە ئێوە دەوێت حاجی گیان.

وەڵامی دامەوە: هەرچیی بەئێمە بکرێت، کوڕی خۆم، دڵنیا بە درێخی ناکەم.

پێم گوت: حاجی گیان، ئێوە ئەو ئامۆزایەی باوکی من دەناسن کە ڕۆیشت بۆ بەریتانیا.

ماوەیەک بێدەنگ بوو، دیار بوو باش بیری نەمابوو، بەڵام دواتر گوتی: ئیبراهیمی دەڵێیت؟

وەڵامم دایەوە: ڕاستی ناوەکەی نازانم. بەڵام پوورم جارێکیان بۆی باس کردم کە باوکم ئامۆزایەکی لە بەریتانیایە.

وەڵامی دامەوە و گوتی: ڕاستە، ئامۆزایەکی باوکت هەر زوو ڕۆیشت بۆ دەرەوەی وڵات، پێم وابێت ناوی ئیبراهیمە. بەڵام ئەمن هیچی دەربارەی نازانم.

پێم گوت: حاجی گیان، ئەگەر لەو خزمانەی گوندی پرسیارێکم بۆ بکەیت زۆرت مەمنون دەبم.

وەڵامی دامەوە: کوڕی خۆم، مەمنونیی ناوێت. تۆزێک سەبرێکم لێبگرە با تەلەفۆنێکی بکەم بۆ گوندی. دواتر وەڵامت لێ دەگێڕمەوە.

دواتر تەلەفۆنەکەم داخستەوە و بە میرام گوت: دەبێت ئێستا نووسینگەکانی حەج و عەمرە کراوە بن.

میرا وەڵامی دایەوە: نووسینگەی حەج و عەمرە بۆچی؟

پێم گوت: بۆ ئەوەی بچین بۆ عەمرە.

میرا بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: بەڕاست؟ دەچین بۆ عەمرە.

پێم گوت: إن شاء الله.

بەڕێ کەوتین بۆ لای یەکێك لە نووسینگەکانی حەج و عەمرە، خۆشبەختانە کراوە بوو. دوای ئەوەی چووینە ژوور و سڵاوەمان کرد، پێم گوتن: دەمانەوێت عەمرە ئەنجام بدەین، بەڵام تا سەعاتێك زووتر بێت باشترە. بیستوومە ئێوە کاتێك گەشتی عەمرە دەکەن، سەرەتا چەند ڕۆژێك دەڕۆن بۆ شاری مەدینە، پاشن بۆ ئەنجامدانی عەمرە دەڕۆن بۆ مەککە، بەڵام گەر بکرێت ئێمە دەمانەوێت ڕاستەخۆ بڕۆین بۆ مەککە و دواتر لە مەککە وە بڕۆین بۆ مەدینە.

خاوەنی نووسینگەکە حاجییەکی بەتەمەنی ڕیشسپی بوو، وەڵامی داینەوە و گوتی: ئەگەر پاسپۆرت و ئەو شتانەی من دەڵێم هێنابێتتان، زۆر باش دەبێت بۆ ئەوەی کاروباری ڤیزا و گەشتەکەتان بۆ تەواو بکەم، چوونکە سبەی شەو گەشتمان هەیە و بەڕێ دەکەوین بۆ بەجێگەیاندنی عەمرە و بۆ ئەو قسەیەی بەڕێزیشتان، دەتوانن دوای ئەوەی گەیشتنە جەددە، لەوێوە بڕۆن بۆ مەککە، بەڵام ئێمە بەرپرسیارێتیی هەرشتێکی نەخوازراو هەڵناگرین، بەڵام گەر گەیشتیتە مەککە، دەتوانی پەیوەندی بکەیت بە برایانمان کە ئێستا لە مەککەن.

وەڵامم دایەوە: زۆر سوپاستان دەکەم و خوا پاداشتتان بداتەوە و أنشاءالله هیچ شتێکی نەخوازراو ڕوو نادات.

حاجییە بەڕێزەکە بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دامەوە و گوتی: أن شاء الله هیچ شتێك ڕوو نادات، بەڵام ئاگادارکردنەوەش خراپ نییە.

من پاسپۆرتم لەناو سەیارەکەمدا بوو، بەڵام میرا گوتی: پاسپۆڕتی من لە شوقەکەمە. خێرا ڕۆیشتین بۆ ئەوەی پاسپۆڕتەکەی بهێنین. دوای ئەوەی ڕۆیشتین و لە کاتی گەڕانەوەمان حاجی صالح تەلەفۆنی کردەوە و گوتی: ئەندازیار باشیت. ئەوە ژمارە تەلەفۆنی ئەو ئامۆزایەی باوکت کە داوات کردبوو، ناوی حاجی ئیبراهیمە.

زۆر سوپاسی حاجی صالحم کرد لەسەر ئەو یارمەتییەی کە پێشکەشی کردم. دوای ئەوە خواحافیزم لێی کرد. دوای ئەوەی گەیشتینە نووسینگەکە، پاسپۆڕتەکانمان پێ دان و پێیان گوتین چاوەڕوانی تەلەفۆنی ئەوان بین.

دوای ئەوە لە نووسینگەکە دەرچووین و لەو نزیکانە مزگەوتێکی لێ بوو، ڕۆیشتین بۆ ناو مزگەوتەکە بۆ نوێژکردن، بە میرام گوت بەو شێوەیە دەستنوێژ دەشۆین و بەو شێوەیە نوێژ دەکەین و لە ڕاوەستانی یەکەم چی دەڵێین و دواتر لە ڕکوع و سوجدەدا چی دەڵێین و لە تەحیات چی دەڵێین، هەموو شتێکم پێ گوت. میرا کچێکی زۆر زیرەك بوو، هەر ئەوەش وای لێ دەکرد زوو فێری شتەکان بێت و ماوەیەکی زۆر کەمی پێویست بوو بۆ ئەوەی فێری نوێژکردن بێت. پاش ئەوەی نوێژمان کرد، ڕۆیشتین بۆ پارکی سامی

عبدالرحمان. لەناو پارکەکە دەستمان کرد بە پیاسەکرد و دەستمان لەناو دەستی یەکتردا بوو، میرا گوتی: موحسین باوەڕ ناکەم هیچ شتێك هێندەی ئەو هەستە ئارامبەخش بێت کە دەبینیت دەستت لەناو دەستی کەسێکدایە کە دڵنیایت هەرگیز دەستت بەرنادات. لەوەش ئازاربەخشتر نییە ئازیزترین کەس دەستت بەربدات.

منیش پێم گوت: کەسێك تۆی بەڕاستی خۆش بوێت، دەستت بەرنادات و ئەو کەسەی دەستیشت بەردەدات، هەر لە سەرەتاوە تۆی خۆش نەویستووە.

ـ باشە چۆن بزانم کەسێك بەڕاستی منی خۆش دەوێت؟

ـ مرۆڤ کاتێك بەڕاستی کەسێکی خۆش دەوێت، هەموو کارێك دەکات بۆ ئەوەی خۆشەویستەکەی خۆشحاڵ و ئاسوودە بێت لەلای، خۆی دەپارێزێت لە بچووکترین شتانێك کە دەزانێت دەبنە هۆی دڵگرانیی خۆشەویستەکەی. خۆشەویستیی ڕاستەقینە سەیرە. کە دەبینێت خۆشەویستەکەی نەخۆشە، ئەو زیاتر ئازار دەچێژێت. جەنجاڵترین شوێنی دونیا ئەوی لێ نەبێت، چۆڵەوانییە. کەچی بەس خۆشەویستەکەی لەلای بێت، بەلایەوە گرنگ نییە گەر ژیان بکات لە چۆڵەوانیترین و دوورترین شوێنی ئەم دونیایە.

ئێوارە بوو، خۆر لەپشتی پەڵە هەورەکانەوە هێواش-هێواش ون دەبوو، ئاسمان ڕەنگاڵەیەکی جوانی وەرگرتبوو، دیمەنێك بوو لە تەماشاکردنی تێر نەدەبوویت. لەگەڵ میرا لەسەر یەکێك

لەو شوێنانەی بۆ دانیشتن کرابوون دانیشتبووین، میرا سەری خستبوویە سەر شانی من و دەستی لەناو دەستمدا بوو. پێم گوت: بڕۆین بۆ چ شوێنێک بۆ نانخواردن؟

میرا وەڵامی دامەوە: زۆر ماندووم، حەز دەکەم بڕۆینەوە بۆ شوقەکەمان، خواردنیش لەگەڵ خۆمان ببەین لە شوقەکە نان دەخۆین.

دوای ئەوە ڕۆیشتین لە خواردنگەیەک داوای خواردنمان کرد و بەرەو ئەو شوقەیە ڕۆیشتین کە میرا لێی دەمایەوە. لە باڵەخانەکە شوێنی مانەوەی لە نهۆمی پازدە بوو، ڕۆیشتین بۆ ناو بەرزکەرەوەکە، دوای ئەوەی گەیشتینە نهۆمی پازدە، ڕۆیشتین بۆ شوێنی مانەوەی میرا. کاتێک ڕۆیشتینە ژوورەوە، میرا گڵۆپەکانی هەڵکرد،ماڵێکی خنجیلانەی جوان بوو. خواردنەکانم دانا و بە میرام گوت: شوێنی دەستنوێژشتن لەکوێیە؟ دوای ئەوەی دەستنوێژمان هەڵگرت، لەگەڵ میرا پێکەوە نوێژمان کرد. کاتێک تەواو بووین، دەستەکانم بەرز کردەوە، میراش دەستەکانی بەرز کردەوە. دوعامان دەکرد، هەستێکی زۆر خۆش بوو. لە دڵی خۆمدا دەمگوت. دەبێت ئەو دوعایە ڕەتکردنەوەی هەبێت کە پیاوێک دەیکات و ژنەکەشی لە پشتیەوە ئامین دەکات بۆ دوعاکانی. دوای ئەوە دەستمان کرد بە نانخواردن. ئەو شەوە زۆرترین قسەمان کرد. کاتێک خەوتین، کاتژمێر لای دابوو لە دوازدە. سبەی لەسەر جێگای نوستنەکە وا هەستم دەکرد دەستێک لەسەر ڕوومەتەکەم دێت و دەچێت، کاتێک





چاوەکانم کردەوە، بینیم میرایە و زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: بەیانیت باش. منیش وەڵامم دایەوە: بەیانی تۆش باش، ئەو بۆنە خۆشە هیی چییە؟ چیت دروست کردووە. میرا وەڵامی دایەوە، نانی بەیانی ئامادەیە. ڕۆیشتم ئاوێکم کرد بە خۆمدا و هاتمەوە، کاتێك تەماشام کرد، هێلکەوڕۆن و زەیت و زەعتەر و زەیتوون و تەماتەی قاژکراو لەسەر سفرەکە دانرابوون لەگەڵ قۆرییەك چا. میرا دانیشتبوو. ڕۆیشتم و ماچێکم کرد لە سەری و لەبەرامبەر ئەو دانیشتم. پێم گوت: بەهـ بەهـ چ سفرەیەکی ڕازاوەیە، سوپاس خانمی خانمان بۆ ئەو هەموو شتە، بەڕاستی ماندوومان کردن.

میرا وەڵامی دامەوە و گوتی: ئەوە من دەبێت سوپاسی تۆ بکەم، بە هۆی تۆوە بۆ یەکەم جارە لە ژیانم شەوێك بەو هەستەوە بخەوم کە بۆ کەسێك گرنگ بم و کەسێك هەیە خۆشی دەوێم و گرنگیم پێ دەدات.

زەردەخەنەیەکم بۆی کرد و پێم گوت: جاریێ ئەوە سەرەتایە، بەڵێنت پێ دەدەم ڕۆژ لە ڕۆژ زیاتر خۆشم بوێیت و هەر ڕۆژێك کە دێت، لە ڕۆژی پێشتر تایبەتتر بێت.

دوای ئەوەی نانی بەیانیمان خوارد، لەسەر قەنەفەکە دانیشتین و چاوەڕێی تەلەفۆنی نووسینگەکەمان دەکرد. سەعات دە و نیو زیاتر بوو کاتێك تەلەفۆنیان کرد و گوتیان: ئەم شەو سەعات سێ و نیو گەشتەکەمان دەست پێ دەکات. دوای تەلەفۆنەکە دەستمان کرد

بە ئامادەکردنی شتەکانمان و دوای ئەوەی تەواو بووین، بە میرام گوت: ئێستا کاتی ئەوەیە پەیوەندی بکەم بەو ئامۆزایەی باوکمەوە.

دوای ئەوەی ئەو ژمارەیەم لێدا کە حاجی صاڵحی مێردی پوورم بۆی ناردبووم، ماوەیەك چاوەڕێم کرد تاوەکوو کەسێك وەڵامی دایەوە و گوتی: بەڵێ.

منیش گوتم: بەڕێزتان حاجی ئیبراهیمن.

ـ بەڵێ، بەڕێزتان کێن؟ ببورن خۆتان بناسێنن.

ـ سڵاوی خواتان لێ بێت حاجی گیان. من موحسینم، کوڕی ئەمینی ئامۆزات.

ـ کێ؟

ـ موحسین، کوڕی ئەمینی ئامۆزات.

ـ چۆنی کوڕم؟ باشیت. ئەمین باشترین هاوڕێی من بوو، بەڵام ئەو کاتەی مامم کوژرا، واتا باپیرت، من کوردستانم جێ هێشت، ئەو کاتەی هەواڵی مردنی دایکت و باوکتم پێ گەیشت زۆر خەمبار و نیگەران بووم و زۆر گریام. ئێ کوڕم چۆنە پاش ئەو هەموو ساڵە منت بیر کەوتۆتەوە؟

هەموو شتێکم بۆ باس کرد و ئەو هۆکارەشم پێ گوت کە ناچارم لە پێناوی کوردستان جێ بهێڵم. دوای ئەوەی گوێی بۆ هەموو شتێك گرت. وەڵامی دامەوە:





ـ بەڕاستی بەداخەوەم بۆ ئەوەی بەسەرتان هاتووە، بەڵام زۆر خۆشحاڵم کە گوێبیستی دەنگی تۆ بووم. کوڕم هیچ خەمێکت نەبێت، من هەموو شتێکت بۆ دەکەم. من لە بیرمنگهام دادەنیشم. تۆ گوتت ئەندازیارم، ئەوەیان هەر زۆر باشە، من لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێ پاکستانییەکانم بە ناوی ئەکبەر خان بەهاوبەشی کۆمپانیایەکی نۆژەنکردنەوەی بینا و باڵەخانەکانمان هەیە، ڕاستەوخۆ بە گەیشتنت بۆ ئێرە وا دەکەم دەست بە کارکردن بکەیت لەگەڵ ئێمە. تۆ کاروباری پاسپۆرتتان تەواو بکەن، دوای ئەوەی گەیشتن بە ئێرە، ئەوەی تر بۆ خۆم لێبگەڕێن.

دوای ئەوە زۆر سوپاسم کرد و پەیوەندییەکەم داخستەوە و ڕاستەوخۆ پەیوەندیم کرد بە حاجی کەمال و پێم گوت لەگەڵ ئەو ئامۆزایەی باوکم قسەم کرد و ئەویش ئامادەیی خۆی بۆ هەموو شتێك دەربڕی. حاجی کەمال گوتی: ئەوەیان هەر زۆر باشە، ئەوە منیش پێت دەڵێم خەمی کاروباری ئێرەت نەبێت، من هەموو شتێك جێبەجێ دەکەم. ئەی چیت کرد بۆ عەمرەکە.

وەڵامم دایەوە: بەنیازین ئەمشەو دوای سەعات سێ بڕۆین.

پێی گوتم: ئەوەیان هەر زۆر باشە، بڕۆن بە دڵێکی ئارام و بیر لە هیچ مەکەنەوە و هەموو شتێك لەبیر بکەن، بەڵام لەبیری نەکەن دوعای خێر بۆ من و ماڵ و منداڵم بکەن.

وەڵامم دایەوە و گوتم: دڵنیا بەوە لەوەی لە هەموو دوعاکانم لەبیرم دەبن و دوعای خێرتان بۆ دەکەم.

پاش ئەوەی ماڵئاواییمان لە یەکتری کرد و دواتر بیرم کردەوە تەلەفۆنێکیش بکەم بۆ هاوڕێکانم، بۆیە یەکبەیەك تەلەفۆنم بۆیان کرد و پێم ڕاگەیاندن ئەمشەو دەڕۆین بۆ عەمرە. ئەوانیش هەموویان گوتیان ئێمەش تاوەکوو فڕۆکەخانە لەگەڵتان دێین، بەڵام پێم گوتن کاتەکەی درەنگە، پێویست بەو ماندووبوونە ناکات و خۆمان بەتەنها دەڕۆین.

دوای ئەوەی هەموو تەلەفۆنەکانم تەواو کرد. میرا گوتی: دەزانی چییە موحسین، تاوەکوو ئێستا زۆر گەشت و سەفەرم کردووە، بەڵام وەڵاهی یەکەم جارە دڵم ئەوها بەخێرایی لێدەدات، حەز دەکەم زوو شەو دابێت بۆ ئەوەی بڕۆین بۆ ئەو شوێنەی کە تا ئێستا بەس لە وەسف و باسەکانی تۆ بیستوومە، حەز دەکەم ئەو شوێنە ببینم کە خەڵك لێیەوە فێری ڕێزگرتن بوون لە ئافرەت و بڕۆم بۆ سەر گۆڕی ئەو پێغەمبەرەی هەموو ژیانی باسی پیرۆزیی ئافرەت بوو و لە خەمی ئافرەتاندا بوو. دەمەوێت تۆزی سەر گۆڕەکەی ماچ بکەم. هەزاران صەڵاوات بنێرم بۆی.

منیش بە زەردەخەنەیەکەوە پێم گوت: ئەم گەشتەمان زۆر تایبەتە، دەزانی بۆچی؟ چوونکە باسی دوو ژنی زۆر گرنگت بۆ دەکەم کە پێغەمبەر زۆری خۆش ویستوون و ئەوانیش پێغەمبەریان زۆر خۆش ویستووە.





میرا بەسەرسوورِمانیەوە گوتی: ئەوە بەڕاستتە.

وەڵامم دایەوە، بەڵێ.

میرا تۆزێك لێم دوور بوو و بەڕاکردن هات و خۆی هەڵدایە ناو باوەشم و گوتی: چەندم خۆش دەوێیت.

وەڵامم دایەوە: بێگومان هەرچەند خۆشت بوێم، ناگات بەو خۆشەویستییەی من بۆ تۆم هەیە.

میرا زەردەخەنەیەکی کرد و توندتوند دەستەکانی لەدەوری کەمەرم توندتر دەکرد.

شەو هەر پاش نوێژی عیشا، تەلەفۆنمان کرد بۆ تەکسییەك بۆ ئەوەی شەو بمانگەیەنێتە فڕۆکەخانە و دوای ئەوە نوستین بۆ ئەوەی خەومان نەیەت کاتێك دەگەین بە سعودیە.

شەو دوای ئەوەی تەکسییەکە هات و ئێمەی گەیاند بە فڕۆکەخانە لەگەڵ ئەو عەمرەکارانەی تر کە بڕیار بوو گەشت بکەین و کۆبووینەوە و سەرقافڵەکەمان هەندێك ڕوونکردنەوە و شتی باس کرد لەسەر ئەنجامدانی عەمرە و پێی گوتین: لێرەوە ئێمە بەرەو شاری جەددە دەڕۆین و پێش ئەوەی بڕۆین بۆ مەککە بۆ بەجێگەیاندنی سوننەتی عەمرەکەمان، چەند ڕۆژێك دەڕۆین بۆ مەدینەی منەوەرە و پاشان لەوێشەوە دەڕۆین بۆ مەککەی پیرۆز. پاشان گوتی ئێستاش کاتی نوێژی بەیانییە، نوێژەکەمان بەکۆمەڵ

دەکەین و دواتر سەر دەکەوینە ناو فڕۆکەکە. لە کاتی هەڵستانی فڕۆکەکە هەمووان بە دەنگی تەکبیر و صەلاواتلێدان خۆشحاڵیی خۆیان دەردەبڕی. دوای ماوەیەك بێدەنگی باڵی کێشا بەسەر ناو فڕۆکەکەدا، زۆربەی هەرە زۆریان خەویان لێ کەوتەوە. میرا کە لەتەنیش من لەلای پەنجەرەکە دانیشتبوو، هەر زوو خەو بردیەوە و منیش دوای ئەوە خەو بردمیەوە، کاتێك چاوەکانم کردەوە بینینم دونیا وا ڕووناك داهاتووە، دیمەنێکی گەلەك جوان بوو. پاش ماوەیەکی باش مانەوە لەناو فڕۆکە، دواجار گەیشتینە فڕۆکەخانەی جەددە. لەوێ پاس ئامادە کرابوو بۆ ڕۆیشتن بەرەو مەدینەی منەوەرە. پاش ئەوەی هەمووان سواری پاسەکانیان بوون و ڕۆیشتن. دواتر ئێمەش ڕۆیشتین بۆ لای ئەو شەمەندەفەرەی هاتوچۆی دەکرد لەنێوان جەددە و مەککە و دوای ئەوەی بلیتەکانمان بڕی، سواری شەمەندەفەرەکە بووین و نیوکاتژمێری نەبرد گەیشتین بە پیرۆزترین خاکی سەرزەمین، ئەویش مەککەی پیرۆز بوو. کاتێك گەیشتینە ئەوێ، یەکێك لەو مامۆستایانەی ئەو کۆمپانیایەی گەشتمان لەگەڵ کردبوو چاوەڕوانی ئێمە بوو و ئێمەی ڕێنموونی کرد و ئێمەی برد بەرەو ئەو هۆتێلەی بۆ مانەوەمان ئامادە کرابوو. پاشان فێری چۆنیەتیی بەستنی ئیحرام و ئەو شتانەی پێویستە ئەنجامیان بدەین، وەکوو خۆپاککردنەوە دوای ئەو شتانەی پێ گوتین کە بۆ ئەنجامدانی عومرە پێویستن بیانزانین و ئەنجامیان بدەین، ڕۆیشتین بەرەو کەعبە.

چ دیمەنێکە، چ جوانییەکە، مرۆڤ تێر نابێت لە ڕوانینی، شوێنێکە تەنانەت بە تەماشاکردن و تێڕوانینی بە عیبادەت بۆت ئەژمار دەکرێت. دوای ئەوەی گەیشتینە ڕاستی بەردە ڕەشەکە، دەستمان کرد بە تەواوفکردن و شانی چەپمان ڕووی لە کەعبە بوو تا ئەوەی حەوت جار بەدەوریدا تەوافمان کرد و پاشان ڕۆیشتین بۆ لای مەقامی ئیبراهیم و دوو ڕکعات نوێژی سوننەتمان ئەنجام دا، پاشان بەڕێ کەوتین بەرەو سەفا و لەوێشەوە بۆ مەڕوا، ئەوەشیان حەوت جار ئەنجاممان دا و پاش ئەوەی لەوەشیان تەواو بووین، من قژی خۆم کورت کردەوە و میراش بەشێکی کەمی لە کۆتایی قژی بڕی و بەو شێوەیە عومرەکەمان ئەنجام دا. تا ئێرە ئەو مامۆستا بەڕێزە ڕێنموونیی ئێمەی کرد و پێی گوتین ئەوە عومرەی ئێوە تەواو بوو و ئێستا بۆخۆتان دەتوانن عومرەی تر ئەنجام بدەن و هەرشتێکی حەزتان لێ بوو لە نوێژ و دوعا ئەنجامی بدەن هەرشتێکیشتان پێویست بوو، من ئاگادار بکەنەوە. دوای ئەوەی سوپاسی ئەومان کرد، ڕۆیشت و من و میرا پێکەوە ماینەوە.

من و میرا دوای ئەوەی گەڕاینەوە بۆ ناو کەعبە و دەستمان کرد بە ئەنجامدانی نوێژی سوننەت و دوعاکردن، میرا چووبوویە دونیایەکی تر و کەم قسەی دەکرد. یان خەریکی نوێژکردن بوو، یان دەستەکانی بەرز کردبوونەوە و دوعای دەکرد و دەگریا، گریانیش چ گریانێك. بەڕاستی من شەرمم لە خۆم دەکرد و غیرەم لە میرا دەکرد کە دەمبینی بەو شێوەیە و بەو تامەزرۆییەوە خەریکی

ئێستا فەرموو گوێم بۆت ڕاگرتووە. منیش زەردەخەنەیەکم کرد بۆی و دەستم کرد بە باسکردنی ئەوەی بڕیار بوو بۆی باس بکەم.

پێغەمبەرمان هێشتا نەبووبوو بە پێغەمبەر، گەنجێك بوو لەناو شاردا بە ڕاستگۆ و دەستپاك ناوی ڕۆیشتبوو. ژنە بازرگانێك هەبوو، لە جوانترین و ژیرترین و دەوڵەمەندترین ژنانی مەککە بوو. ناوی خەدیجەی کچی خوەیلد بوو. پێویستی بە گەنجێك بوو بۆ ئەوەی کاروبارە بازرگانییەکانی بۆ ئەنجام بدات و لەگەڵ کاروانەکان سەفەر بکات. خزمەتکارێکی هەبوو ناوی (مەیسەرە) بوو، داوای لێ کرد بگەڕێت گەنجێکی دەستپاك و جێگای متمانەی بۆ بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی ئیش و کارە بازرگانییەکانی بۆ ئەنجام بدات. ئەوەیش دوای ئەوەی دەڕوات لەناو مەککە دەگەڕێت و دەپرسێت، دەگەڕێتەوە بۆ لای خەدیجە و پێی دەڵێت کوڕێك هەیە ناوی محمدە، هەمووان باسی دەستپاکی و ڕاستگۆییەکەی دەکەن و لای خەڵکی خۆشەویست و ڕێزلێگیراوە. پاش ئەوەی پێغەمبەرمان دەڕوات بۆ لای خەدیجە و دەست دەکات بە کارکردن و سەرپەرشتیی کاروانە بازرگانییەکانی خاتوو خەدیجە دەکات و چەند جارێك دەڕوات بۆ یەمەن و شام، لە سەفەرەکەی شام پێغەمبەرمان بە قازانجێکی زۆرەوە دەگەڕێتەوە بۆ لای خاتوو خەدیجە. مەیسەرەی خزمەتکاری خاتوو خەدیجە زۆر وەسفی باشەی پێغەمبەرمان دەکات و باسی ئەوەی بۆ دەکات کە چەند کەسێکی لێزان و خەمخۆرە و لەپاڵ ئەوەشدا دەستپاك و ڕاستگۆیە

لە کارەکەی، لەو کاتەوە پێغەمبەرمان دەچێتە دڵی خاتوو خەدیجەوە و ڕۆژێکیان خاتوو خەدیجە دەڕوات بۆ لای هاوڕێیەکی زۆر نازیزی ناوی (نەفیسە)یە، لەوێ خاتوو خەدیجە هەر باس و ستایشی پێغەمبەرمان دەکات بۆ نەفیسە، نەفیسەش دەڵێت: حەز دەکەیت هاوسەرگیریی لەگەڵ بکەیت؟ خاتوو خەدیجەش وەڵام دەداتەوە: بەڵێ. دوای ئەوە نەفیسە دێت بۆ لای پێغەمبەرمان و پرسیاری لێ دەکات: بۆچی تا ئێستا هاوسەرگیریت نەکردووە؟ پێغەمبەریشمان وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: لەبەر هەژاریم. نەفیسە دەڵێت: ئایە گەر ژنێك هەبێت دەوڵەمەند بێت و جوان بێت و لەناو خەڵکیدا ڕێزلێگیراو بێت، ئامادەی هاوسەرگیریی لەگەڵ بکەیت. پێغەمبەریشمان وەڵامی دەداتەوە: بەڵێ. بەڵام ئەو کەسە کێیە؟ نەفیسەش دەڵێت: خەدیجەی کچی خوەیلد. دوای ئەوەی خەدیجە لەگەڵ مامی، کە ناوی عەمری کوڕی ئەسدە، قسە دەکات، چوونکە باوکی نەمابوو و پێغەمبەریش لەگەڵ مامەکانی بوو، ڕۆژێك دادەنێن بۆ ئەنجامدانی هاوسەرگیرییەکە. کاتێك ڕۆژی دیاری کراو دێت، خزم و کەسوکاری هەردوو لا لە یەك شوێن کۆ دەبنەوە و لەوێ مامی پێغەمبەرمان أبوتالیب کۆمەڵێك قسەی زێڕین دەکات و دەڵێت: ڕاستە ئەو برازایەی من دەستکورتە و هەژارە، بەڵام باشترین گەنجی هەموو مەککەیە و کەسیش لەوەدا گومانی نییە. پاش ئەوەی مارەبڕینەکە ئەنجام درا، هەرچەندە لەنێوان مێژوونووسان و زانایان ڕای جیاواز هەیە لەسەر تەمەنی ئەو کاتی

خاتوو خەدیجە و چەند ساڵ گەورەتر بووە لە پێغەمبەری ئازیزمان. بەڵام ئەوەی هەموو زانایان و مێژوونووسان لەسەری یەکدەنگن ئەوەیە پێغەمبەرمان خاتوو خەدیجەی زۆر خۆش ویستووە و ڕێزێکی ئێجگار زۆر لەنێوانیاندا هەبووە و پێغەمبەرمان تەنها لەو بووە بە خاوەنی منداڵ، کوڕەکانی ناویان: قاسم و عبدالله و کچەکانیشی ناویان زەینەب و ڕوقیە و أم کەلسوم و فاتیمە بوون. خاتوو خەدیجە گەورەترین پاڵشتی و سەرخەری پێغەمبەرمان بووە بە ماددی و بە مەعنەوی. هەر لەو شەوەی پێغەمبەرمان لە ئەشکەوتی حراء وەحیی بۆ دێت، زۆر دەترسێت و بەڕاکردن دەگەڕێتەوە ماڵەوە و دەفەرمووێت: دام پۆشن، دام پۆشن. خاتوو خەدیجەش کە پێغەمبەرمان بەو شێوەیە دەبینێت، بە کۆمەڵێك قسەی گەوهەرئاسا دڵی پێغەمبەرمان دەداتەوە و پێی دەڵێت: وەڵاهی بێخەم بە، خوا هەرگیز پشت لە تۆ ناکات، چوونکە تۆ پەیوەندیی خزمایەتی ئەنجام دەدەیت و لە قسەکردندا ڕاستگۆی و یارمەتیی هەژاران دەدەیت، بەرگری لە حەق دەکەیت. پاش ئەو قسانە خاتوو خەدیجە پێغەمبەرمان دەبات بۆ لای کوڕە مامەکەی (وەرەقەی کوڕی نەوفڵ)، کە کەسێك بوو دەیتوانی و شارەزایی هەبوو لە خوێندنەوەی دەقە کۆنەکاندا. ئەوەیش پێی دەڵێت: ئەوەی بۆ تۆ هاتووە وەحییە و تۆش وەکوو موسا هەڵبژێردراوی و تۆ دەبیت بە پێغەمبەر و خەڵکی لە شاری خۆت بە دەرکردنت دەدەن. خاتوو خەدیجە یەکەم کەس دەبێت باوەڕ بە پێغەمبەر

دەهێنێت. لە پێناو سەرخستنی ئەو پەیامەش تووشی نارەحەتیی زۆر دەبێت. هەر بۆیەش ئەو ساڵەی خاتوو خەدیجە و أبوتالیبی مامی پێغەمبەری تێدا دەمرێن، پێغەمبەر ناوی دەنێت ساڵی ماتەم و غەمگینی. ئاخر چۆن غەمگین نەبێت کە باشترین کەسانێکی لەدەست داوە کە بووبوونە پاڵپشتی و سەرخەری. پێغەمبەر تاوەکوو خەدیجە لە ژیاندا بوو، ژنی تری نەهێنا، چوونکە خاتوو خەدیجە لە گشت ڕوویەکەوە کامڵ بوو و جارێکیان جوبرەئیل دێت بۆ لای پێغەمبەر و بە پێغەمبەر دەڵێت: ئێستا خەدیجە دێت بۆ لات و گەر هات سڵاوی خوا و منی پێ بگەیەنە و مژدەی ماڵێکی پێ بدە لە بەهەشت.

ماوەیەك بەبێدەنگی مامەوە، میرا گوتی: تەواو بوویت؟ وتم نەخێر، بەس بەشەکەی تری لە مەدینە بۆت باس دەکەم. دوای ئەوە بانگی بەیانیی دا، پاش ئەوەی نوێژی بەیانیمان کرد، ڕۆیشتینەوە بەرەو شوێنی مانەوەمان لە هۆتێلەکە. دوای ئەوەی سێ ڕۆژ لە مەککە ماینەوە، بەڕێ کەوتین بۆ مەدینەی منەوەرە، پاش نزیکەی پێنج سەعات و نیو ئینجا گەیشتین. مەدینە ئەو شارە بوو کە پێغەمبەرمان دوای ئەوەی لە مەککە دەریان کرد پێغەمبەر لەگەڵ هاوەڵانی ڕوویان لەوێ کرد. پاش ئەوەی گەیشتینە مەدینە، سەرەتا ڕۆیشتین کەلوپەلەکانمان دانا، پاشان ڕۆیشتین بۆ ناو مزگەوتی پێغەمبەر، دوای ئەوەی نوێژمان کرد لەناو مزگەوت و ماوەیەکی باش ماینەوە، دواتر گەڕاینەوە بۆ شوێنی مانەوەمان. میرا گوتی:





بیرتە بڕیار بوو باسی چیم بۆ بکەیت؟ وەڵامم دایەوە: بەڵێ، بیرمە. پاش ئەوە دەستم کردەوە بە باسکردنی بابەتەکەمان.

ماوەیەکی باش ڕۆیشت بەسەر کۆچی دوایی دایکمان خەدیجە و هێشتا پێغەمبەر هەر بیریشی لەوە نەدەکردەوە بێت و ژنێکی تر بهێنێت، بەڵام فەرمانی خوا وا بوو دەبێت هاوسەرگیری بکاتەوە. یەکێك لەو هاوسەرانەشی عائیشەی کچی ئەبوبەکری صدیق بوو. لەنێوان هەموو خێزانەکانی پێغەمبەر تەنها عائیشە کچ بوو. عائیشە کچی باشترین و نزیکترین هاوڕێی پێغەمبەر بوو. زانایان بیروبۆچوونیان جیاوازە لەسەر تەمەنی خاتوو عائیشە ئەو کاتەی بۆتە هاوسەری پێغەمبەرمان، بەڵام دووبارە زانایان و مێژوونووسان هاودەنگن لەسەر خۆشەویستی و سۆزی پێغەمبەرمان بۆ عائیشە و ژیری و تێگەیشتوویی عائیشە، لەبەرامبەردا خۆشەویستیی زۆری عائیشە بۆ پێغەمبەرمان. جارێکیان یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر پرسیار دەکات لە پێغەمبەر ئەو کەسە کێیە لە هەموو خەڵکی سەر زەوی زیاتر خۆشت دەوێت؟ پێغەمبەریش بێ دوودڵی دەڵێت: عائیشە. ئەو هاوەڵە بەڕێزە دەپرسێت ئەی لە پیاوان. پێغەمبەریش وەڵامی دەداتەوە: باوکی (واتا ئەبوبەکری صدیق). سەیر کە پێغەمبەر شەرمی لەوە نەکردووە خۆشەویستیی خۆی بۆ خێزانی خۆی دەر ببڕێت لەبەرامبەر خەڵکی و شەرم بکات لە ناوهێنانی، بەڵکوو لەنێو هەموو هاوەڵانی ئەو قسەیەی کردووە. دایکمان عائیشە بە زاناترین و ژیرترین ئافرەتی مێژووی ئیسلامی

دادەنرێت و یەکێکە لەو کەسانەی زۆرترین فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، ژمارەی فەرموودەکانیش زیاتر بوون لە دوو هەزار فەرموودە. تەنانەت یەکێك لە هاوەڵان دەفەرمووێت گەر لەسەر بابەتێك ڕای جیاوازمان هەبایە، ئەوا دەڕۆیشتینە لای دایکمان عائیشە و ئەوەیش بۆی چارەسەر دەکردین. پێغەمبەر عائیشەی زۆر خۆش ویستووە و جارێکیان پێغەمبەر بە دایکمان عائیشە دەڵێت: وەڵاهی ئەمن دەزانم تۆ چ کاتێك لێم توورەی. عائیشەش پێی دەڵێت: چۆن دەزانی؟ پێغەمبەریش دەڵێت: ئەو کاتانەی لێم توورەی دەڵێیت سوێند بە خوای ئیبراهیم، بەڵام کاتەکانی تر دەڵێیت سوێند بە خوای محمد. عائیشەش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: وەڵاهی ڕاست دەکەیت، هەموو ئەوەی وازی لێ دێنم تەنها ناوەکەتە. سەیر کە زۆر گرنگە پیاو بزانێت چ کاتێك ژنەکەی لێی ڕازییە و چ کاتێکیش لێی ڕازی نییە. پێغەمبەر زۆر بە سۆز و میهرەبانییەوە مامەڵەی کردووە لەگەڵ عائیشە، جارێکیان عائیشە دەنگ بەسەر پێغەمبەردا بەرز دەکاتەوە و لەو کاتەشدا ئەبوبەکری باوکی عائیشە بە بەردەمی ماڵی ئەواندا ڕەت دەبێت و گوێی لە دەنگی کچەکەی دەبێت، بۆیە دێتە ژوورەوە و دەست بەرز دەکاتەوە لە عائیشە و دەیەوێت لێی بدات، بەڵام عائیشە دەڕوات خۆی لەپشتی پێغەمبەر دەشارێتەوە. دوای ئەوەی ئەبوبەکر دەڕوات، پێغەمبەر ڕوو دەکاتە عائیشە و پێی دەڵێت: چاوت لێ بوو چۆن ڕزگارم کردیت لەو پیاوە (مەبەستی ئەبوبەکری

باوکی بوو). سەیری ئەو میهرەبانی و ئارامگرییە، کێ هەیە ئەمڕۆ لە پیاوان ڕێگە بدات ژنەکەی دەنگی بەسەردا بەرز بکاتەوە و ئەویش هیچ نەڵێت. کاتێکیش لە عائیشە دەپرسن دەربارەی ڕەوشتی پێغەمبەر، وەڵامیان دەداتەوە و دەڵێت: ڕەوشتی ئەو قورئان بوو، ئەو قورئانێکی زیندوو بوو بەسەر زەویدا ڕێی دەکرد. پێغەمبەر سەرەڕای ئەوەی گەورەترین ئەرکی لەئەستۆ بوو کە پێغەمبەرایەتی بوو و کێشە و گرفتی زۆری لەلا بوو و شەڕ و ناخۆشیی زۆر بوو، بەڵام هەمیشە کاتی هەبوو بۆ ئەوەی لەگەڵ خێزانەکانی بەشی بکات. دایکمان عائیشە دەڵێت: جارێك لە شوێنێك دەگەڕاینەوە لەگەڵ هاوەڵان، پێغەمبەر بە هاوەڵانی فەرموو: ئێوە بڕۆن. من و پێغەمبەر ماینەوە، پاش ئەوەی کاروانەکە لە بەرچاومان ون بوو، پێغەمبەر فەرمووی: دێیت پێشبڕکێ بکەین. عائیشە دەڵێت: منیش ڕازی بووم و پێشبڕکێکەم بردەوە لە پێغەمبەر. دایکمان عائیشە دەڵێت: ڕۆژەکان ڕۆیشتن و هاتن تا ئەوە بوو جارێکی تر لەگەڵ هاوەڵان دەر چووین، پاش ماوەیەك پێغەمبەر بە هاوەڵانی فەرموو: ئێوە بڕۆن. پاش ئەوەی ئەوان ڕۆیشتن، پێغەمبەر پێی فەرمووم: دێیت پێشبڕکێ بکەین. دایکمان عائیشە دەڵێت: پێشبڕ کێمان ئەنجام دا و ئەم جارەیان پێغەمبەر پێش من کەوتەوە، چوونکە من کێشم زیادی کردبوو. دواتر هات بۆ لام و گوتی: ئەوەش لەبەرامبەر ئەوەی تریان، واتە یەك بە یەك. یان جارێکی تر عائیشە دەڵێت: هاوەڵان لەناو مزگەوت خەریکی یاریکردن بوون، پێغەمبەریش

فەرمووی حەز دەکەیت تەماشایان بکەیت؟ منیش وەڵامم دایەوە: بەڵێ. دواتر من چوومە سەر شتێك و چەناگەم خستە سەرشانی پێغەمبەر و ڕوومەتم نا بە ڕوومەتی پێغەمبەرەوە. پاش ئەوەی ماوەیەك ڕۆیشت، پێغەمبەر پێی فەرمووم: تەواو نەبوویت. منیش گوتم: نا. دواتر پاش ماوەیەك پێغەمبەر فەرمووی: تەواو نەبوویت. منیش دووبارە گوتم: نا. پاشان بۆ جاری سێیەم فەرمووی: تەواو نەبوویت، ئینجا من گوتم: تەواو. دایکمان عائیشە دەڵێت: هەموو ئەوەی من دەمویست ئەوە بوو لە پێغەمبەرەوە نزیك بم. گەر بێین تەماشای پیاوی ئەمڕۆ بکەین کامەیان کاتی تەرخان کردووە بۆ خێزان و منداڵەکانی، لە کاتێکدا ئەوەی زۆر گرنگە ئەوەیە پیاو لە خزمەتی ماڵ و منداڵی خۆیدا بێت. جارێکیان هەندێك کەس دێن و پرسیار لە دایکمان عائیشە دەکەن دەربارەی کاروباری پێغەمبەر و ڕۆژانەی پێغەمبەر. ئەویش وەڵامیان دەداتەوە و دەڵێت: بۆخۆی پێڵاوەکانی پینە دەکات، مەڕێکی هەبوو بۆخۆی دەیدۆشی و جلەکانی خۆی بۆخۆی دەدوورییەوە. یەکێك لە گەورەییەکانی عائیشە ئەوەیە دوای ئەوەی دووڕووەکان بوختانی بۆ دەکەن و بە تاوانی ئەوەی زینای ئەنجام داوە تاوانباریان کرد، خوا لە ئاسمانەوە بە ئایەت پاکێتیی ئەوی بۆ موسڵمانان سەلماند. دایکمان عائیشە پێغەمبەری زۆر خۆش ویستووە، هەر بۆیە غیرەیەکی ئێجگار زۆری هەبوو بەرامبەر بە پێغەمبەر و وەکوو خۆی دەفەرموویێت: غیرەم لە هیچکەسێك نەکردووە بەرامبەر بە پێغەمبەر، جگە لە





خەدیجە نەبێت. سەیر کە دایکمان خەدیجە چەندەها ساڵە مردووە، بەڵام هێشتاش پێغەمبەر لەبیری نەکردووە. عائیشە دەفەرموێت: گەر مەڕێك یان شتێکمان کردبایە بە خێر، ئەوا پێغەمبەر پێی دەگوتین: هاوڕێکانی خەدیجە لەبیر مەکەن و بۆ ئەوانیشی بنێرن. دایکمان عائیشە دەڵێت: پاش ئەوەی مەککەمان ڕزگار کرد، بینیم وا پێغەمبەر عەباکەی بەر خۆی لەبەر دەکات و لەسەر زەوییەکە ڕای خست. پاشان لەگەڵ پیرەژنەیەك دانیشتن لەسەری. هەندێك جار پێدەکەنین و هەندێك جار دەگریان. دوای ئەوەی پیرەژنەکە ڕۆیشت، لە پێغەمبەرم پرسی: ئەو پیرەژنە کێ بوو؟ پێغەمبەریش وەڵامی دامەوە، ئەوە هاوڕێیەکی خەدیجە بوو، باسی ئەو کاتانەمان دەکرد کە خەدیجە زیندوو بوو. هەروەها کۆتا ڕۆژەکانی پێغەمبەریشمان لەناو ماڵی عائیشەدا بووە، تەنانەت ئەو کاتەی مردیش لەناو ئامێزی عائیشەدا بوو و هەر لەناو ماڵەکەی ئەویش نێژراوە.

ئاگامان لە خۆمان نەمابوو کە کات چەند خێرا ڕۆیشتووە، تا ئەوە بوو بانگی عەسری دا، ڕۆیشتین بۆ مزگەوت و پاش ئەوەی نوێژمان کرد، ڕۆیشتین بۆ لای گۆڕستانی بەقیع و گۆڕی پێغەمبەر. دوای ئەوەی ماوەیەکی باش ماینەوە لەوێ، دواتر ڕۆیشتینەوە بۆ مزگەوت بۆ ئەنجامدانی نوێژی مەغریب و تا نوێژی عیشاشمان کرد هەر لەناو مزگەوتەکە ماینەوە. پاش مانەوەی سێ ڕۆژ، لە کۆتاییدا بڕیارمان دا بگەڕێینەوە بۆ کوردستان.

جێهێشتنی مەدینە بۆ ئێمە ئاسان نەبوو، بەتایبەتی بۆ میرا، بەڵام ناچار بووین، دوای ئەوەی بەڕێ کەوتین بۆ فڕۆکەخانەی محمد بن عبدالعزیز، لەوێشەوە بۆ فڕۆکەخانەی هەولێر. پێشتر هاوڕێکانم ئاگادار کردبوویەوە لە کاتی گەڕانەوەم. کاتێك گەیشتینە فڕۆکەخانەی هەولێر، هۆشەنگ و مەحوی چاوەڕێمان بوون و پاش ئەوەی یەکتریمان لەئامێز گرت، بەڕێ کەوتین بەرەو ماڵی دکتۆر ئارام، چوونکە پێشتر دکتۆر ئارام پێی گوتبووین بۆ ئێوارە دەبێت بێن بۆ ماڵی ئێمە، کاتێ گەیشتین، بەخێرهاتنێکی گەرمیان کردین و بەڵێن و دەستگیرانەکەشی هاتبوون، ئەو ئێوارەیە یەکێك بوو لە خۆشترین ئێوارەکانی ژیانم. پاش ئەوەی نانمان خوارد و بەباشی پشوومان دا، هۆشەنگ پرسیی: ئەندازیار، ئەی ئێستا نیازت وایە چی بکەیت. وەڵامم دایەوە و گوتم: دەبێت سەرێك بدەم لە حاجی کەمال، بزانم چیی کردووە، پاش ئەوە بیرێك بکەمەوە بزانم چی بکەم.

شەو تا درەنگ لای ماڵی دکتۆر ئارامماینەوە و پاشان گەڕاینەوە بۆ شوقەکەی خۆمان. کاتێك گەیشتینەوە، میرا گوتی: دەمەوێت شتێکی گرنگت لەگەڵ باس بکەم. وەڵامم دایەوە: فەرموو. میرا گوتی: دەمەوێت هەموو ئەو شتانە بفرۆشم کە هەمە، حەز ناکەم هیچیەکێك لەو شتانەم بمێنێت و ئەو ڕابردووە پیسەم بیر بهێننەوە. وەڵامم دایەوە: چۆن و بە چ کارێك ئاسوودەی، ئەوە بکە. سبەی کاتژمێر یازدە لەگەڵ میرا ڕۆیشتین بۆ ماڵی حاجی کەمال و

هەندێك دیاریمان بۆ هێنابوون پێمان دان و ویستمان بڕۆین، كە زۆر پێداگرییان كرد نانی نیوەڕۆ لەگەڵ ئەوان بخۆین. دوای ئەوەی نانی نیوەڕۆمان خوارد، حاجی كەمال گوتی: پێنج ڕۆژێك دەخایەنێت كاروباری ڤیزا و پاسپۆرتەكان تا ئەو كات بزانن چی دەكەن لەو شتانەی هەتانە و چ شتێكتان پێویستە لەگەڵ خۆتانی ببەن. پاش ئەوەی لە ماڵی حاجی كەمال هاتینە دەرەوە، میرا گوتی: دەتوانی ڕێكخراوێكی خێرخوازی بدۆزیتەوە جێگای متمانە بێت بۆ ئەوەی ئەو پارەیەی لە فرۆشتنی سەیارە و شتەكانم دەستم دەكەوێت بیدەم پێیان. وەڵامم دایەوە بەڵێ، ڕێكخراوێكی جێگای متمانە هەیە و بەرپرسەكەشی زۆر جێگای متمانەیە، ئەوان بوونەتە لانە بۆ بێلانان و چەتر بۆ لێقەوماوان و هەڵگری نازی بێباوكان و پاراستنی ناموس و شەرەفی بێوەژنان. میرا پرسیاری كرد ئەوە چ ڕێكخراوێكە و خاوەنەكەی كێیە. وەڵامم دایەوە، ڕێكخراوی بەختەوەرییە، بەرپرسەكەی كەسایەتییەكی خاكی و دڵسۆزە بۆ هەژاران و لێقەوماوان، كەسێكە بۆتە باوك بۆ هەژاران شەو و ڕۆژی لەسەر یەك دانەوە بۆ بەدەمەوەچوونی ئەو كەسانەی پێویستیان بە یارمەتییە. میرا گوتی: زۆر باشە، مادام كەسەكە هەندە جێگای متمانەیە و ڕێكخراوەكەشی گەورەیە، با شتەكانم بفرۆشین و پارەكەی بدەین بە ئەو بۆ ئەوەی بیداتە بێباوكان. دوای ئەوەی هەموو شتەكانی میرامان فرۆشت بە سەیارە و كەلوپەلەكانی تریەوە، بڕی پارەكە گەیشتە سیوشەش ملیۆن. میرا گوتی: حەز

دەکەم بیدەین بە سەد منداڵی بێباوک. واتا بۆ هەر منداڵێك سێ سەد و شێست هەزار دینار. دوای ئەوە پەیوەندیم کرد بە حاجی کاروان و پێم گوت: بڕی ئەوەندە پارەمان هەیە، خێزانم حەز دەکات بیداتە منداڵانی بێباوك. دوای ئەوەی حاجی کاروان زۆر بەڕێزەوە وەڵامی داینەوە، گوتی: خوا پاداشتی بەخێرتان بداتەوە و أن شاء الله دەبێتە مایەی ڕزگاریتان لە ئاگری دۆزەخ. حاجی کاروان بەردەوام بوو و گوتی: ئەمڕۆ سێشەممەیە، أن شاء الله بۆ ڕۆژی پێنجشەممە پاش عەسرەکەی ئێمە لە بینای ڕێکخراو بانگی سەد منداڵی بێباوك دەکەین و ئەو بڕە پارەیەیان بەسەردا دابەش دەکەین بەو شێوەیەی ئێوە دەتانەوێت، بەڵام حەز دەکەم ئێوەش بۆخۆتان ئامادەبوونتان هەبێت. میرا بەو قسەیە زۆر دڵخۆش بوو و پاش ئەوەی ڕۆژی پێنجشەممە هات و ئێمە پارەکەمان برد، کاتی دابەشکردنی پارەکە هات میرا گوتی: حەز دەکەم لەپشتی پەردەکەوە تەماشا بکەم، نامەوێت ئەو منداڵە پاکانە بزانن کەسێکی خراپ و پیسی وەکوو من چاکەی لەگەڵ کردوون. من و میرا لەپشتی پەردەکەوە تەماشای حاجی کاروان و ستافەکەمان دەکرد کە چەند بەڕێزەوە مامەڵەیان لەگەڵ ئەو منداڵانە و دایکەکانیان دەکرد و پارەکانیان پێ دەدان. دایکی هەریەکێك لەو منداڵانەش لە دڵەوە سەیری ئاسمانیان دەکرد و بە دەستبەرزکردنەوە دوعایان دەکرد بۆ ئەو کەسەی خێرەکەی کردووە و بۆ ڕێکخراوەکەی حاجی کاروان... میرا کە ئەو دیمەنانەی دەبینی، کە فرمێسکی دایکی ئەو منداڵانەی دەبینی وا خەریکە لە

دڵەوە دوعای بۆ دەکەن، خۆی بۆ نەگیرا و دەستی کرد بە گریان. پاش ئەوەی تەواو بوون لە دابەشکردنی هەموو پارەکە و دایکان و منداڵەکانیان ڕۆیشتن، من و میرا ڕۆیشتین بۆ لای حاجی کاروان و ستافەکەی بۆ ئەوەی سوپاسیان بکەین لە پای ئەو ماندووبوون و هەوڵانەی دەیدەن لە پێناو کارێك کە تەنها ئەوەی مەبەستیانە یەکەم ڕەزامەندیی خوای گەورەیە و ئینجا خزمەتکردنێك بەو خەڵکە بێ ناز و نەوایە. پاشان من و میرا ڕۆیشتین بەرەو شوقەکەمان و دوای ئەوە تەلەفۆنێکم کرد بۆ مەحوی، پێم گوت: دەمەوێت سبەی لەگەڵم بێیت بڕۆین سەیارەکەم بفرۆشم. ڕۆژی هەینی پاش ئەوەی نانمان خوارد لەگەڵ مەحوی ڕۆیشتم و سەیارەکەم فرۆشت و پاشان بە سەیارەکەی مەحوی گەڕاینەوە و منی گەیاندە بەردەمی شوقەکە و پاشان ڕۆیشت. منیش ڕۆیشتمە سەرەوە و لە زەنگەکەم دا، میرا خێرا هات و دەرگاکەی کردەوە و گوتی: بەخێر بێیتەوە، چیت کرد؟ منیش وەڵامم دایەوە زۆر سوپاس، دەستی مەحوی خۆش بێت بە هۆی ئەوەوە باش بوو بە پارەیەکی باش فرۆشتم. پاش ئەوە میرا گوتی: وەرە خواردن ئامادەیە، با نان بخۆین. لەسەر مێزی نانخواردن بووین، حاجی کەمال تەلەفۆنی کرد و گوتی: هەموو کاروباری فیزا و شتەکان تەواو بووە و پێیان گوتم گەشتەکەتان بەیانیی ڕۆژی یەکشەممەیە سەعات نۆ و چلوپێنج خولەکە. لە فڕۆکەخانەی هەولێرەوە دەڕۆن بەرەو فڕۆکەخانەی دوبەی، لەوێشەوە بۆ فڕۆکەخانەی برمنگهام... پاش تەلەفۆنەکەی حاجی

کەمال منیش خێرا تەلەفۆنێکم کرد بۆ حاجی ئیبراهیمی ئامۆزای باوکم و پێم گوت ڕۆژی یەکشەممە لە کوردستانەوە بەڕێ دەکەوین و نازانم چ کاتێك دەگەینە برمنگهام. ئەوەیش وەڵامی دایەوە، هەرکاتێك بێت من چاوەڕێی تەلەفۆنی ئێوەم. پاشان لەگەڵ میرا کەلوپەلەکانی خۆمان خستە ناو جانتاکانەوە و خۆمان ئامادە کرد بۆ ڕۆژی یەکشەممە. شەو مەحوی تەلەفۆنی کرد و گوتی: سبەی نیوەڕۆ هەمووومان بڕیارمان داوە لە ماڵی ئێمە کۆ ببینەوە بۆ مەبەستی ماڵئاواییکردن لە ئێوە.

سبەی دوای ئەوەی هەموو شتێکمان بەتەواوی ئامادە کرد، مەحوی بە سەیارەکەی خۆی هات بەدواماندا و ئێمەی برد بۆ ماڵی خۆیان. دکتۆر ئارام و بەڵێن پێش ئێمە هاتبوون، بەڵام هۆشەنگ تاوەکوو کاتی نانخواردن نەهات. وا هەستم دەکرد هیچمان نانمان پێ نەدەخورا، تەنها وا خۆمان نیشان دەدا کە وا خەریکین نان دەخۆین، چوونکە خواردنەکانی پێشمان هیچی وای لێ کەم نەبووبووەوە. هەموومان دڵمان پڕ بووبوو و چاومان پڕی ئاو بووبوو، بەڵام حەزیان نەدەکرد ببنە فرمێسك و جۆگەلە ببەستن. بەڵام لە کۆتاییدا ئەوەی بەنیاز بێت بشکێت، دەشکێت و ئەوەی بەنیاز بێت بڕژێت دەڕژێت، مەحوی یەکەم کەس بوو دەستی کرد بە گریان، دواتر ئێمەش خۆمان ڕانەگرت و دەستمان کرد بە گریان، ئاخر بۆ ڕۆژێکیش بیرمان لەوە نەکردبوویەوە لە یەکتری جیا ببینەوە، ئێمە کە بووبووین بە برای یەکتری، ئەستەم بوو هیچمان بەرگەی

ئەوە بگرێت و ببینێت وا لەیەکتری جیا دەبینەوە. میرا کە لەنێوان خێزانی مەحوی و دکتۆر ئارام دانیشتبوو، بەگریانەوە گوتی: من داوای لێبوردنم هەیە کە بوومەتە هۆی لەیەکتری جوداکردنەوەتان. دوای ئەوە هەردوو خێزانی مەحوی و دکتۆر ئارام خۆیان لێ نزیك خستەوە و لەباوشیان گرت و دکتۆر ئارام گوتی: خوشکەکەم ئەو قسانە چییە، ئێوە بوون بە مایەی خێر بۆ ئێمە، دڵنیا بە هاوڕێیەتیی ئێمە هاوڕێیەتیی گیانییە و وا بەئاسانی لەناو ناچێت.

تاوەکوو عەسر لای ماڵی مەحوی بووین، پاشان بەگریانەوە کۆتا ماڵئاواییم کرد لە دکتۆر ئارام و بەڵێن و هۆشەنگ. ئەوان ڕۆیشتن، داوام لە مەحوی کرد سەیارەکەم پێ بدات تاوەکوو بڕۆم ماڵئاواییش لە ماڵی حاجی کەمال بکەم. دوای ئەوەی ڕۆیشتین بۆ ماڵی حاجی کەمال، ئەو کاتەی گەیشتین دیار بوو نوریش لە دەرەوە دەگەڕایەوە، هەر ئێمەی بینی و لە سەیارەکەی دابەزی و بەخێرهاتنی منی کرد و لەگەڵ میرا یەکتریان لەباوەش گرت. دواتر فەرمووی کردە ئێمە بۆ ژوورەوە. تاوەکوو پێش مەغریب لە ماڵی حاجی کەمال ماینەوە و پاشان کاتێك ویستمان ماڵئاوایی بکەین، هەرسێکیان بەکوڵ دەگریان، نور بەگریانەوە بێ ئەوەی ماڵئاوایی لە ئێمە بکات ڕۆیشتەوە سەرەوە و لەگەڵ حاجی کەمال بەگریانەوە یەکتریمان لەباوەش گرت و ماڵئاواییشمان کرد لە حاجی سەبیعە و بەگریانەوە ماڵی ئەوانیشمان جێ هێشت. پاشان ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵی مەحوی و لە بەردەم ماڵەکەیان ویستمان بە تەکسی بڕۆین،

کەچی مەحوی سوور بوو لەسەر ئەوەی بە سەیارەکەی خۆی بمانگەیەنێتەوە شوقە. پاش ئەوەی بۆ ماوەیەکی زۆر بەگریانەوە یەکتریمان لەباوەش گرت، مەحوییش ڕۆیشت. ئێمەش دووقۆڵی بەرەو سەرەوە ڕۆیشتین. هەردووکمان زۆر نیگەران بووین، لەناکاو میرا گوتی: موحسین تۆچیت لەگەڵ ئەو خەڵکە کردووە کە ئاوا بۆ ڕۆیشتننت بەکوڵ دەگرین. وەڵامم دایەوە و گوتم: ڕاستی نازانم چیم کردووە، ڕەنگە بە هۆی ئەوە بێت کە بەبێ هیچ بەرژەوەندییەك خۆشم ویستوون.

پاش ئەوەی نوێژی عیشامان کرد، تەلەفۆنم کرد بۆ هەمان ئەو تەکسییەی جاری پێشووتر ئێمەی برد بۆ فڕۆکەخانە و پێم گوت: سبەی کاتژمێر نۆ بێت بەدواماندا. پاش ئەوە ڕۆیشتین بۆ سەر جێگاکەمان، ڕووم کردە میرا و پێم گوت: میرا بۆچی یاران و باران هەواڵێکیان نییە، بۆچی جارێك نەهاتن بۆ لات؟ میرا دیار بوو نیگەران بوو بەو پرسیارە، بەڵام هەر وەڵامی دایەوە و گوتی: ئەو کاتەی بەیەکجاری مسوڵمانبوونی خۆم ڕاگەیاند، یاران و باران هاتن بۆ لام و پێیان گوتم: کچێ ئەوە تۆ شێت بوویت واز لەو هەموو خۆشی و چێژ و ڕابواردنە دەهێنی، دەزانی سبەی ناتوانی بە حەزی خۆت دوو هاوڕێت ببینی و گەشت بکەیت بۆ دوو وڵات. منیش وەڵامم دانەوە: من لەو شتانە تێرم خواردووە، ئێستا ئەو شتانەی ئێوە باسی دەکەن چیتر نرخ و چێژیان نییە لەلای من. پاش ئەوەی زانییان قسەکردن بێسوودە لەگەڵ من، ڕۆیشتن و





لەو کاتەوە بۆ جارێکیش هەواڵیان نەپرسیوم. هەر ئەوەشیان لێ چاوەڕێ دەکرێت، هاوڕێیەتییەك لەسەر بەرژەوەندی دروست بووبێت، بە نەمانی بەرژەوەندی ئەو هاوڕێیەتییەش نامێنێت.

پاشان میرا دەستی کرد بە گریان و بەردەوام بوو لە قسەکردن و گوتی: دایکم منی بەتەنها جێ هێشت و ڕۆیشت، باوکیشم لەبەر خاتری ژنێکی تر وازی لێ هێنام و ئێستاش هەواڵی نازانم، هاوڕێی ڕاستەقینەم نییە، هەموو ئەوەی بۆم ماوەتەوە لەو دونیایە تۆی، توو خوا تۆش تەنهام مەکە و بەتەنهایی جێم مەهێڵە.

هەردوو دەستەکەم توند ئاڵاند لە کەمەری میرا و لە خۆم نزیك خستەوە و پێم گوت: بەڵێنت پێ دەدەم بۆت ببمە باشترین هاوڕێ و هاوسەر و نازی باوکایەتی و سۆزی دایکایەتیشت پێ بدەم. مەگەر منیش کێم هەیە جگە لە تۆ.

پاشان خەوتین، بۆ نوێژی بەیانی هەڵستاین نەمانتوانی بخەوینەوە، چاوەڕێی هەڵهاتنی خۆر بووین، لە بەلەکۆنەکەوە لەگەڵ میرا پێکەوە بەبێدەنگی دانیشتبوون و چامان دەخواردەوە. بەبێدەنگی لەتەنیشت ئەو کەسە دانیشتبیت کە خۆشت دەوێت و لێت تێدەگات زۆر باشترە لەوەی لەگەڵ کەسێك قسە بکەیت و لێت تێنەگات.

پاش ئەوەی بوو بە سەعات نۆ، شۆفێری تەکسییەکە تەلەفۆنی بۆمان کرد و گوتی: من وا لە بەردەمی باڵەخانەکە چاوەڕێتانم.

ئێمەش خێرا شتەکانمان هەڵگرت و ڕۆیشتینە خوارەوە و بەڕێ کەوتین بەرەو فڕۆکەخانە، لە فڕۆکەخانە ماوەیەك چاوەڕێمان کرد، پاش ئەوەی کاتی سواربوونی فڕۆکەکەمان هات، ئێمەش ڕۆیشتینە ناو فڕۆکەکە و بەڕێ کەوتین بەرەو دوبەی، لە کاتی هەڵستانی فڕۆکەکە و بەرزبوونەوەی هەولێر بەتەواوی دیار بوو، نەمتوانی ڕێگری لە فرمێسکەکانم بکەم، ئەو قسەیەم کرد کە پێغەمبەر ئەو کاتەی لە مەککە دەریان کرد کردی، ئەوەیش ئەوە بوو: وەڵاهی گەر منیان دەر نەکردبایە، هەرگیز جێم نەدەهێشتی. سەعات دوانزە گەیشتینە فڕۆکەخانەی دوبەی، پاش ئەوەی هەردووکمان نوێژەکەمان کرد و پاش ئەوەی کاتژمێر بوو بە سەعات سێ، خەریك بوو بڕۆمە ناو فڕۆکەکە، تەلەفۆنێکم کرد بۆ حاجی ئیبراهیم و پێم گوت وا لە دوبەین و خەریکە دەچینە ناو فڕۆکەکە. ئەویش گوتی: زۆر باشە، گەشتەکەتان نزیکەی هەشت سەعاتی دەوێت. منیش ئەو کات دێم بۆ فڕۆکەخانە بەدواتاندا. دوای ئەوە بەڕێ کەوتین بۆ برمنگهام و کاتێك گەیشتینە ئەوێ، کات بووبوو بە شەشی بەیانی بە کاتی ئەوێ. لە فڕۆکەکە کاتێك دابەزین، ئێمە حاجی أیبراهیمان نەدەناسی. بەڵام تابلۆیەکی بە دەستەوە بوو و ناوی منی لەسەر نووسیبوو، دوای ئەوەی گەیشتینە لای یەکتری، توندتوند یەکتریان لەباوەش گرت و بەقووڵی تەماشایەکی کردم و گوتی: وا هەست دەکەم ئەمینم لەپێش ڕاوەستاوە، ئەوەندە لە ئەو دەچیت، دواتر سڵاومان کرد لە خێزانەکەی. خێزانەکەی ناوی








سوپاس مامە گیان، ئێوە چی بڵێن ئەوە دەکەم.

پاش ئەوە لە ماڵی حاجی ئیبراهیم هاتینەوە و لەگەڵ میرا دەستمان کرد بە ڕێکخستنی ناو ماڵەکەمان، هەرچەند هەمووشتێك تەواو و لە جێگای خۆی بوو، جانتاکانم هێنان و گشت شتەکانی ناومان بەتاڵ کرد و هەموویانمان خستە ناو دۆڵابەکانەوە. میرا گوتی: ئازیزم، خۆت ئامادە بکە با بچین هەندێك شت بکڕین.

منیش خێرا ڕۆیشتم بۆ لای میرا و میرام لەئامێز کرد و پێم گوت: ئازیزم، با تۆزێك پشوو بدەین، ئینجا دەڕۆین هەرشتێك تۆ بتەوێت دەیکڕین.

میرا گوتی: موحسین، ئەوە چی دەکەیت، دام بگرە سەر زەوییەکە.

بەپێکەنینەوە وەڵامم دایەوە: تاوەکوو پێم نەڵێیت خۆشم دەوێیت، دات نانێم.

میراش هەر وەکوو منداڵێکی بەنازومەکر گوتی: ئەوە نەمگوت، ئێستا تۆ دەبێت من هەڵبگریت تاوەکوو دەستەکانت شل دەبێت و بۆخۆت دام دەنێیت.

میرام برد بۆ ژووری نوستنەکەمان و لەسەر جێگای نوستن دامنا.

میرا گوتی: ئەوە چی بوو، خۆ من پێم نەگوتی خۆشم دەوێیت. وا زوو ماندوو بوویت.





وەڵامم دایەوە: من هەرگیز لە هەڵگرتنی تۆ ماندوو نابم، تەنها ویستم گاڵتەیەکت لەگەڵ بکەم. ئێستاش بێ ئەوەی تۆ بیڵێیت، ئەوا من پێت دەڵێم خۆشم دەوێیت ئەی باشترین هاوسەر و هاوهەناسەی دونیا.

میراش ماچێکی کردم و گوتی: منیش عاشقی تۆم ئەی باشترین هاوڕێ و هاودەمی من.

دوای ئەوەی هەردووکمان خەومان لێ کەوت. کاتێک هەڵستاین، خۆمان ئامادە کرد بڕۆینە دەرەوە، تۆزێك ڕۆیشتین گەیشتینە مزگەوتێك بە ناوی مزگەوتی (ئەمانە). بە میرام گوت: بڕۆ با بچینە ناو ئەو مزگەوتە، کاتێك ڕۆیشتین، دیاربوو زۆربەی خەڵکەکەی عەرەب بوون، مزگەوتێکی تا بڵێیت جوان بوو، مرۆڤ دڵی پێی دەکرایەوە، پاش ئەوەی میرا لە بەشی ژنان و منیش لە بەشی پیاوان نوێژمان کرد، هاتینە دەرەوە، دەستمان لەناو دەستی یەکتر نا و بەرەو نزیکترین مارکێت ڕۆیشتین، ئەوەی پێداویستیی ماڵ بوو کڕیمان و پاشان گەڕاینەوە بۆ ماڵ. پاش ئەوەی سێ ڕۆژ لەگەڵ میرا گەشتمان کرد و ڕۆیشتین بۆ زۆرێك لە مۆڵ و شوێنە گشتییەکانی بێرمنگهام، شەوەکەی بە میرام گوت: دەمەوێت لە سبەییەوە بچم بۆ سەر کار و لەگەڵ حاجی ئیبراهیم دەست بکەم بە کارکردن. میرا گوتی: زۆر باشە، بەڵام دەبێت بەڵێنێکم پێ بدەیت، ئەوەیش ئەوەیە یارمەتیم بدەیت بۆ ئەوەی فێری قورئانخوێندنەوەم بکەیت.

منیش وەڵامم دایەوە: بەسەر چاو ئازیزەکەم، تۆ کاتێک دیاری بکە و پشتیوان بە خوا هەموو ڕۆژ لەو کاتەدا خەریکی قورئانخوێندن دەبین.

پاشان تەلەفۆنم کرد بۆ حاجی ئیبراهیم و پێم گوت: مامە گیان باشی، دەمەوێت لە سبەییەوە بێمە سەر کار.

حاجی ئیبراهیمیش وەڵامی دامەوە: موحسین سبەی دەبێت بچین لەگەڵ پارێزەرەکەم قسە بکەین بۆ مەبەستی مانەوەتان و وەرگرتنی ئیقامە بۆ ئەوەی هیچ کێشەیەکتان نەبێت لە کاتی کارکردندا.

سبەی ڕۆیشتین بۆ لای پارێزەرەکەی حاجی ئیبراهیم. پارێزەرەکە گوتی: خۆشبەختانە ئێوە خاوەنی کەسێکی بەهێزن بە هۆی میرا خاتوونی خێزانتانەوە، ئەو پێشووتر ئەوەندەی من ئاگادار بم وەکوو شاجوانی ئاسیا هەڵبژێردراوە. من قسەکانم پێی بڕی و پێم گوت: ببورە قسەکانم پێ بڕیت، هاوەڵی دووەمی شاجوان، نەك شاجوان. پارێزەرەکە وەڵامی دایەوە: هەر ئەوەی ئێوە فەرمووتان، بۆیە دەبێتە خاڵێکی بەهێز بۆ ئەوەی بتوانن بە زووترین کات ئیقامە وەر بگرن. من خەریکی کاروبارە ئاساییەکان دەبم و هەرکاتێك کاتی چاوپێکەوتن هات، ئاگادارتان دەکەمەوە. پاشان لەگەڵ حاجی ڕۆیشتین بۆ کۆمپانیا و ئەو کاتەی ئێمە گەیشتین، ئەکبەرخان، کە هاوبەش و هاوڕێی حاجی ئیبراهیم بوو، لە بەردەم دەرگای کۆمپانیا وەستابوو و خەریك بوو بە تەلەفۆن لەگەڵ کەسێك قسەی دەکرد.

پاش ئەوەی ئێمەی بینی، پەیوەندییەکەی داخستەوە و بەرەو ڕووی ئێمە هات و پاش ئەوەی لەگەڵ هەردووکمان تەوقەی کرد، حاجی ئیبڕاهیم ئێمەی بە یەکتری ناساند. ئەکبەر خان پیاوێکی باڵابەرزی دەموچاوسپیی قژزەرد بوو، دەمبەخەندە و کراوە بوو، لە تەمەنیشدا هاوشێوەی حاجی ئیبڕاهیم بوو. پاش ئەوەی حاجی ئیبڕاهیم هەردووکمانی بە یەکتری ناساند، ئێمە چووینە ژوورەوە و باسی ئیش و کارمان دەکرد. حاجی ئیبڕاهیم گوتی: کاری تۆ تەنها ئەوەیە لەگەڵ ئەو ستافانە دەربچیت کە بۆ شوێنان دەیاننێرین بۆ نۆژەنکردنەوە و پاك و خاوێنکردنەوەی ماڵ و شوێنەکان. حاجی ئیبڕاهیم لەو قسانەدا بوو مۆبایلەکەم زەنگی لێدا، منیش مۆبایلەکەم لە گیرفانم دەرهێنا، تەماشام کرد میرا بوو، دوای ئەوەی وەڵامم دایەوە، میرا گوتی: وا خەریکە خواردن ئامادە دەکەم، حەز دەکەم بۆ ئێوارە بانگی ماڵی حاجی ئیبڕاهیم بکەین. منیش وەڵامم دایەوە: ئەوە کارێکی هەر زۆر باشە، دەستەکانت خۆش بێت ئازیزکەم، من حەزم لێیە بانگێشتی ماڵی بەڕێز ئەکبەڕ خانیش بکەین. میرا گوتی: زۆر باشە، هەموو شتێکم بە زیادەوە هێناوە. پاش ئەوە ڕووم کردە حاجی ئیبڕاهیم و ئەکبەڕ خان، پێم گوتن بۆ ئێوارە بە خێزانی بۆ ماڵی ئێمە بانگێشت کراون. ئەوانیش وەڵامیان دایەوە: مادام بەو جۆرەیە، با تەلەفۆنێك بکەین بۆ خێزانەکانمان بۆ ئەوەی ئاگادار بن و خۆیان ئامادە بکەن. پاشان من مۆڵەتم لێیان وەرگرت و بەرەو ماڵەوە ڕۆیشتمە، لە ڕێگا تەلەفۆنم کرد بۆ میرا

پێم گوت: هیچمان ناوێت لەگەڵ خۆم بیهێنم. میرا گوتی: هەموو شتێکم کڕیوە، پێویست ناکات هیچ بهێنی. دوای ئەوە منیش خێرا ڕۆیشتمەوە بۆ ئەوەی یارمەتیی میرا بدەم. کاتێك گەیشتمەوە، دوای ئەوەی سڵاوم لێ کرد، پێم گوت: من چی بکەم. میرا پاش ئەوەی کەمێك بیری کردەوە، گوتی: تۆ ئەو سەوزەیە پاك بکەوە و پاشان بیبە سەر مێزەکە دای بنێ، پاشان بڕۆ قاپ و شتەکان ببە لەسەر مێزەکە دایان بنێ و دواتریش وەرە میوەکان بشۆوە، بیانبە بۆ سەر مێزی ناوەڕاستی هۆڵەکە. دوای ئەوە پێکەوە هەموو شتێکمان تەواو کرد، چاوەڕێ بووین میوانەکان بێن. من و میرا دانیشتبووین و خۆمان گۆڕیبوو. تا ئەوە بوو زەنگەکە لێدرا، پاش ئەوەی من ڕۆیشتم دەرگاکە بکەمەوە، بینینم وا حاجی ئیبراهیم لەگەڵ خێزانی و کچەکەی و ئەکبەر خانیش لەگەڵ دوو کوڕ و کچێکی هاتوون. بەخێرهاتنم کردن بۆ ژوورەوە، ئەکبەر خان گوتی: با نوێژەکانمان بکەین پیاوینە، تاوەکوو خانمەکانیش لەگەڵ یەکتری ئاشنا دەبن. ئەوە بوو ئێمە، من و حاجی ئیبراهیم و دوو کوڕەکەی ئەکبەر خانە لە دواوە وەستاین و ئەکبەر خان پێشنوێژیی کرد بۆمان. دەنگێکی چەند ئارامکەرەوەی هەبوو. ئەکبەر خان و منداڵەکانی بە هۆی ئەو دۆستایەتییە بەهێزەی هەیانبوو لەگەڵ حاجی ئیبراهیمدا، بەباشی لە کوردی تێدەگەیشتن و بۆ قسەکردنیش باش بوون. پاش ئەوەی لەسەر سفرەکە گفتوگۆیەکی خێزانیی جوانمان کرد و ئەکبەر خان باسی دابونەریتی وڵاتەی خۆی دەکرد بۆ من و میرا، ئێمەش بەباشی







گوێیان گرتبوو بۆی. ئێوارەیەکی تایبەت بوو. تا کاتێکی درەنگ هەردوو خێزان لای ئێمە بوون، پاشان دوای ئەوەی دەستخۆشییان کرد لە میرا لەسەر ئەو خوانە تایبەتە، ماڵئاواییان کرد و ڕۆیشتن. لە میرا نزیك کەوتمەوە و ماچێکم لە نێوچاوانی کرد و پێم گوت: ئای چەند شانازیت پێوە دەکەم، ئەمڕۆ سەری منت بەرز کردەوە لای میوانەکان، ئێستاش برۆ پشوو بدە، منیش قاپەکان دەشۆم.

میرا وەڵامی دامەوە: شتی وا نابێت، تۆ بڕۆ دابنیشە من ئێستا بە پازدە خولەك هەمووی دەشۆم.

منیش گوتم: نابێت، دەبێت ئەمڕۆ من بیانشۆم.

میرا گوتی: پێکەوە با بیانشۆین.

دەستمان کرد بە شۆردنیان، لەناکاو هەندێك کەفم دا لە نێوچاوانی میرا، میراش هەمان کاری کردەوە، لە کۆتاییدا لەبەر شەڕە ئاو و شەڕە کەف بیرمان چووبوویەوە قاپەکان بشۆین و ئەو ناوەشمان هەمووی کردووە بە ئاو و کەف. زۆر زۆر پێکەنین. میرا ئەو شەوە ئەوەندە پێکەنی، باوەڕ ناکەم هەرگیز لە ژیانیدا بەو شێوەیە پێکەنیبێت. دوای ئەوەی قاپەکانمان هەمووی شۆرد، من ڕۆیشتم بۆ هۆڵەکە. من لەسەر قەنەفەکە پاڵم دابوویەوە. پاش ماوەیەك میرا هات و خۆی خزاندە نێو ئامێزم و منیش بەبێدەنگی توند لەئامێزم گرت. پاش ماوەیەك لە بێدەنگی میرا سەری بۆ لای من بەرز کردەوە و گوتی: شتێك بڵێم؟ وەڵامم دایەوە و گوتم: بەڵێ بۆ نا،

چیت دەوێت بیڵێ. میرا گوتی: دەزانی ئامێزی پیاو تاکە شوێنە لە دونیا بۆ ئافرەت، تاوەکوو تەنگتر بێت، ئافرەت زیاتر تێیدا هەست بە ئاسوودەیی و ئارامی دەکات. منیش ماچێکم لە قژەکانی کرد و زیاتر میرام لە خۆم نزیك خستەوە. ماوەیەك تەماشای ئەوەم دەکرد و جگە لە زەردەخەنەیەك نەبێت هیچم نەدەکرد، میرا گوتی: ئەوە بیر لە چی دەکەیتەوە وا زەدەخەنەت خستۆتە سەر ڕووت. وەڵامم دایەوە و گوتم: کە ئێوەم بەو شێوەیە بینی، ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرم بیرکەوتەوە کە دەفەرمووێت: تایبەتمەندیی ژنی باش سێ شتە، یەکەمیان: گەر تەماشات کرد دڵت پێی بکرێتەوە. دووەمیان: گەر لەلای نەبووی ناپاکیت لێ نەکات. سێیەمیان: گەر داوای شتێکت لێ کرد بێفەرمانیت نەکات.

ڕۆژەکان زۆر باش دەڕۆیشتن، ئیش و کارم زۆر باش بوو و زۆر ئاسوودە بووم لەگەڵ حاجی ئیبراهیم و ئەکبەر خان لە کارکردن، ڕێزێکی زۆریان لێ دەگرتم. من و میرا هەموو شەوێك پاش نوێژی عیشا چل خولەکمان دانابوو بۆ ئەوەی میرا فێری قورئانخوێندن ببێت. میرا ڕۆژانەش دەڕۆیشت بۆ مزگەوتی ئەمانە. هەرچەندە مزگەوتەکە خەڵکەکەی عەرەب بوون، بەڵام چوونکە میرا عەرەبیی باش دەزانی، کێشەی نەبوو لەوەدا. هەفتەی چوار ڕۆژ لە مزگەتەکە لە بەشی ئافرەتان خەریکی وانەخوێندن بوو. منیش دەڕۆیشتم بۆ سەر کار، ئێمە کاتێکی دیاریکراومان نەبوو. بەتایبەتی من، چوونکە من وەکوو سەرپەرشتیار لەگەڵ





ستافەکان دەردەچووم. ڕۆژەکان بەباشی دەڕۆیشتن. تا ئەوە بوو ئێوارەیەکیان لەسەر سفرەی نانخواردن میرا گوتی: موحسین گەورەترین دیارییەك ژن پێشکەشی هاوسەرەکەی بکات چییە بە بڕوای تۆ؟ منیش وەڵامم دایەوە: بە بڕوای من گەورەترین دیارییەك ژن پێشکەشی مێردەکەی بکات، ئەوەیە منداڵی بۆ بهێنێتە دونیاوە و بیکات بە باوك. دواتر میرا گوتی: ئەی تۆ حەزت لێیە منداڵمان هەبێت؟ سەیرێکی میرام کرد و گوتم: ئازیزەکەم، ئەو پرسیارانە چییە دەیانکەیت؟ میرا گوتی: تۆ بەس وەڵامم بدەوە. منیش وەڵامم دایەوە و گوتم: بێگومان، کێ هەیە حەز نەکات منداڵ لە ماڵەکەیدا بێت و کێ هەیە حەز نەکات منداڵێك پڕ بە قوڕگی هاوار بکات باوکە، دایکە. کێ هەیە حەز بە بیستنی ئەو وشانە نەکات. منداڵ خێر و بەرەکەتن بۆ ماڵ. ئاوەدانین بۆ ماڵ، گۆچانی دایە و بابەن لە پیریدا. میرا گوتی: دە مژدەم بدەیە بەو نزیکانە دەبیتە باوك أن شاء الله. باوەڕم نەکرد بەوەی کە بیستم. بە میرام گوت: چیت گوت؟ تکایە دووبارەی بکەوە. میرا خۆی بە دەنگی بەرز گوتی: دەڵێم بەو نزیکانە دەبیت بە باوك. کە ئەوەم بیست، خێرا سوجدەی شوکرم برد، دوای ئەوە هەڵستامەوە و میرام توند لەباوەش گرت و بەرزم کردەوە و بە هەموو هێزی خۆم هاوارم دەکرد و دەمگوت: من دەبم بە باوك، من دەبم بە باوك. میرا دەستی لەسەر دەمم دانا و گوتی: وا مەکە، ناشیرنە، ئێستا خەڵکی ناڵێن چی دەگوزەرێت لەو ماڵە. دواتر گوتم: لێیان گەڕێ با ئەو خەڵکەش بزانن کە من

وا خەریکە دەبم بە باوك، با هەموو خەڵکی شار بزانن من دەبم بە باوك. ئاخر ئێوە پێم بڵێن دەبێت چ هەواڵێك لەوە خۆشتر بێت، دەزانی چەند وشەیەکی جوانە، چەند وشەیەکی ئارامبەخشە کە پێت دەڵێن: تۆ دەبیت بە باوك! بۆ بەیانییەکەی کارتۆنێك شیرینم کڕی و بە هەرکەسێك گەیشتم دانەیەکم پێ دەدا و هەرکەسێکیش لە هۆکارەکەی پرسیبایە، پێم دەگوت: من دەبم بە باوك. پاش ئەوە ڕۆیشتم بۆ کۆمپانیا و کارتۆنێك شیرینییشم بۆ حاجی ئیبراهیم و ئەکبەر خان و کارمەندانی کۆمپانیا کڕی. دوای ئەوەی زانییان هۆکارەکەی چییە، هەموان پیرۆزباییان لێم کرد.

ڕۆژەکان زۆر بەباشی دەڕۆیشتن، میرا ڕۆژبەڕۆژ کێشی زیاد دەبوو بە هۆی دووگیانبوونەکەوە. من بە هۆی ئەوەی میرا دووگیان بوو، ڕۆژانە زوو دەڕۆیشتمەوە بۆ ئەوەی ئاگام لێی بێت و شەش مانگ بوو میرا دووگیان بوو، لەو ماوەیەدا من هەموو ئیشەکانی ماڵەوەم دەکرد و بە هەموو شێوەیەك هەوڵم دەدا میرا خۆشحاڵ بێت و کەمترین جار تووڕەبوون یان شتێك بکەم میرا دڵتەنگ بێت. خەڵکی وا گومان دەبەن پەروەردەکردنی منداڵ و پرۆسەی فێرکردن دوای ئەوەی منداڵە دێتە دونیاوە و گەورە دەبێت و دەبێتە چوار-پێنج ساڵێك یان دوای ئەوە دەست پێ دەکات، بێئاگا لەوەی پەروەردەکردنی منداڵ لەو کاتەوە دەست پێ دەکات کە منداڵەکە لە سکی دایکیدایە و منداڵ لە چوار مانگی بۆ پێنج مانگی لە سکی دایکیدا هەست بە گشت گۆڕانکارییەکان دەکات و دڵخۆشیی





دایك كاریگەریی هەیە لەسەر منداڵەكە و تووڕەبوونی دایك و نەبوونی كەشێكی ئارامی خێزانی كاریگەریی خراپ لەسەر منداڵەكە دروست دەكات. لەو بارەیەوە توێژینەوەی زانستیی زۆر كراوە و گشتیان ئەوەیان سەلماندووە كە منداڵ توانای فێربوونی شتەكانی هەیە لەو كاتەوەی لە سكی دایكیدایە، بۆیە تاوەكوو ئەو ماوەیەی دووگیانی ژینگەی خێزانی ئارامتر بێت، كاریگەریی باشتری دەبێت بەسەر جەستە و دەروونی منداڵەكەوە. دەبێت دایكان و باوكان باش ئەوە بزانن منداڵ هاوار و دەنگبەرزكردنەوە و خەمخواردن و نەخواردنی خۆراكی تەندروست گاریگەرییەكی زۆر خراپ لە ئاییندەدا لەسەر منداڵەكەیان جێی دەهێڵن. هەر لەبەر ئەوەش من سوور بووم كە دەبێت بە جوانترین شێوە مامەڵە بكەم لەگەڵ میرا، دەگەڕام بەس بۆ ئەوەی بزانم میرا بە چی دڵخۆش دەبێت و چ قسەیەكی حەز لێیە ئەوەم دەكرد و بە میرام دەگوت تا دەتوانی هەوڵ بدە قورئان زۆر بخوێنی و قورئان زۆر لێبدەیت لەناو ماڵدا. بەیانییان زوو هەڵدەستام و نانی بەیانیم بۆ خۆم و میرا ئامادە دەكرد، پێكەوە نانی بەیانییانمان دەخوارد و پێش ئەوەی بڕۆم، هەموو ڕۆژێك بەبێ پچڕان ماچێكم لە سكی میرا دەكرد. خۆم میرام دەبرد بۆ حەمام و دەمشۆرد و ناوماڵم پاك دەكردەوە. ڕۆژەكان بەسەختی تێدەپەڕین لەسەر میرا، سكی گەورەتر بوو و كێشی زۆر زیادی كردبوو. لە كۆتایی هەفتەكانی منداڵبوونیدا بوو. ژنان بەڕاستی ئێوە مرۆڤێكی بەهێزن. دەبێت پیاوان درك بەوە بكەن

ماوەی دووگیانی ماوەیەکی ئاسان نییە و بگرە زۆریش قورسە بۆ ئافرەت. ژن لە ماوەی دووگیانی بە هۆی ئەوەی کێشی زیاد دەکات ناتوانێت بە دڵی خۆی جلوبەرگ بپۆشێت. کاتێک تووشی ئازار دەبێت و نەخۆش دەبێت، ناتوانێت ئەو دەرمانە بخوات کە ئازارەکەی لا دەبات لە ترسی ئەوەی نەوەکوو کاریگەریی خراپی هەبێت لەسەر کۆرپەلەکەی. ناتوانێت بە حەزی خۆی بخەوێت و بەو شێوازە بخەوێت کە خۆی دەیەوێت. ناتوانێت بە حەزی خۆی ئەو خواردنە بخوات کە خۆی دەیەوێت. نۆ مانگ نزیکەی سێ کیلۆ هەڵدەگرێت بەبەردەوامی و گەورەترین قوربانی دەدات بە جەستەی خۆی تەنها لە پێناو ئەوەی منداڵێکی تەندروست بۆ پیاوەکەی بهێنێتە دونیاوە، ئەوە ئێمە هەر ناتوانین باسی ئەو ژان و ئازارەی کاتی منداڵبوون بکەین کە ئەو ژنە پێیدا دەڕوات، بەڵام ئەو بەرگەی هەموو ئەو شتانە دەگرێت و تەنها بە بینینی کۆرپەلەکەی بە یەک زەردەخەنە هەموو شتێک لەبیر دەکات. ئایە پیاوانیش ناتوانن ئەو نۆ مانگە بە شێوازێکی تایبەتتر و جوانتر مامەڵە بکەن لەگەڵ خێزانەکانیان. زیاتر لە کاتەکانی تر گرنگییان پێ بدەن و زیاتر لەلایان بن و لە جاران زیاتر پێیان بڵێن خۆشم دەوێیت. چی دەبێت ئەو نۆ مانگە پیاوەکە بەشێکی کاروباری ناو ماڵەکە ئەنجام بدات، چی دەبێت لەجیاتیی ئەوەی کاتی زیاتر بەسەر بەرێت لەگەڵ هاوڕێکانی بێت و ئەو کاتە لای خێزانەکەی بەسەر بەرێت. ئایە گەر ئەو ئافرەتە بەرگەی ئەو هەموو ئازار و





ناڕەحەتییەی گرت، ئایە تۆش ناتوانی بەرگەی تووڕەبوونەکانی و هەندێك لە قسەکانی بگریت، ئاخر ئەو بە کۆمەڵێك گۆڕانکاریی خێرای جەستەیی و دەروونیدا تێدەپەڕێت.

کاتی لەدایکبوونی منداڵەکەی ناو سکی میرا دیار نەبوو، دەکرا لە هەرساتێکدا منداڵەکە لەدایك بێت، بۆیە بە خێزانی حاجی ئیبراهیمم گوت کە ئەو کاتانەی من دەڕۆم بۆ سەر ئیش، زووزوو بڕوات بۆ ماڵی ئێمە و ئاگای لە تەندروستیی میرا بێت. خۆشم لەسەر ئیش هەموو سەرە سەعاتێك تەلەفۆنم بۆی دەکرد و لە تەندروستیی ئەوم دەپرسی.

بەیانیی ڕۆژی پێنجشەممە بوو من ڕۆیشتم بۆ سەر ئیش، پاش دوو کاتژمێر خێزانی حاجی ئیبراهیم تەلەفۆنی کرد و گوتی: پێم وا بێت کاتی لەدایکبوونی منداڵەکە هاتووە و میرا زۆر ئازاری هەیە، بۆیە وەرەوە بۆ ئەوەی بیبەین بۆ نەخۆشخانە. منیش خێرا سەیارەکەم لە حاجی کەمال وەرگرت و بەخێرایی ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵەوە، تەندروستیی میرا هیچ باش نەبوو. دوای ئەوەی گەیاندمانە نزیکترین نەخۆشخانەی منداڵبوون، میرا توندتوند دەستی منی گرتبوو و دەگریا و دەیگوت: موحسین ئازارم زۆرە، تکایە بەتەنها جێم مەهێڵە. منیش توندتوند دەستەکانم گرتبوو و پێم گوت: ئازیزەکەم، بێخەم بە، دڵنیا بە من هەمیشە لەلات دەبم. هەموو شتێك باش دەبێت. دوای ئەوە من هاتمە دەرەوە. ڕۆیشتم لە گۆشەیەك چوومە سوجدە و بەگریانەوە دوعام دەکرد خوایە ڕەحم بکە بە میرا،

خوایە بیپارێزی و هەم میرا و هەمیش منداڵەکە بەسەلامەتی بێتە دونیاوە. سەرم بەرز نەکردبوویەوە کە گوێم لە گریانی منداڵێك بوو، دڵم خێرا لێیدەدا. تا ئەوە بوو خێزانی حاجی ئیبراهیم هاتن و گوتیان: موژدەتان لێ بێت ئەندازیار، بوون بە باوکی کچێکی زۆر جوان. منیش خێرا وەڵامم دایەوە: ئەی تەندروستیی میرا چۆنە؟ بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دامەوە: ئەویش زۆر زۆر باشە. دوای ئەوە خێرا سوجدەی شوکرم برد. سوپاسی خوام کرد لەسەر ئەوەی میرا تەندروستە و منداڵێکی کچی پێ داین و بووم بە باوك. دوای ماوەیەك دکتۆرە ژنەکە هات و پیرۆزبایی لێ کردم پێی گوتم ئێستا دەتوانی بچیتە لای هاوسەر و منداڵەکەت. سوپاسی دکتۆرەکەم کرد و ڕۆیشتم بۆ لای میرا. دوای ئەوەی میرام لەباوەش کرد و پێم گوت کە چەند خۆشم دەوێت، ڕۆیشتم بۆ لای منداڵەکە. هەر بە بینینی نەمدەتوانی خۆم بگرم، دەستم کرد بە گریان. کچێکی بچکۆلەی چەند جوان بوو. پاش ئەوەی ماوەیەکی باش لە نەخۆشخانەماینەوە و دکتۆرەکان تەواو دڵنیا بوون لە تەندروستیی میرا و کچەکەمان، بەڕێکەوتین بەرەو ماڵەوەمان، پاش ئەوەی گەیشتینەوە، خێزانی ئەکبەر خانیش هاتبوو لەگەڵ کچەکەی و خواردنیشیان دروست کردبوو، دواتر حاجی ئیبراهیم و ئەکبەر خانیش هاتن و هەمووان پیرۆزبایی منداڵەکەیان لێ کردین و ئەکبەر خان و حاجی ئیبراهیم پێش ئەوەی بڕۆن هەریەکێکیان بڕێك پارەیان وەکوو دیاری بۆ کچەکەمان دانا و پاشان ڕۆیشتن. پاش ئەوەی ئەوان ڕۆیشتن،







من ڕۆیشتم و لەتەنیشت میرا دانیشتم و پێم گوت: پیرۆزمان بێت ئەو کچە جوانە، سوپاس کە ئەو ماوەیە بەرگەی خواردنە ناخۆش و سووتاوەکانی منت گرت. میرا دەستی کرد بە پێکەنین و گوتی: نا نا، خواردنی باشیش دەزانی ئامادە بکەیت، بیرم کردۆتەوە لەمەودوا تۆ خواردن ئامادە بکەیت. هەردووکمان دەستمان کرد بە پێکەنین. پاشان میرا گوتی: هیچ ناوێکت لە خەیاڵدا بۆ ئەوەی لە کچەکەمانی بنێین. وەڵامم دایەوە: ناوم زۆر لە خەیاڵدایە، بەڵام حەز دەکەم خۆت ناوی لێ بنێیت. میرا گوتی: من حەز دەکەم ناوی (ئەوین) بێت. منیش گوتم: ئەوین! بۆچی؟ میرا وەڵامی دامەوە: ئاخر تۆ ئەوینی ڕاستەقینەت پێشانی من دا. تۆ بوویت ئەوینی ڕاستەقینەت لە دڵمدا ڕواند، تۆ بوویت فێرت کردم ئەوینی ڕاستەقینە چییە. تۆ تۆوی ئەوینی ڕاستەقینەت لە دڵمدا ڕواند، ئێستاش وا ئەو تۆوە گەشەی کردووە و گەورە بووە، دەمەوێت بۆ هەمیشە ئەو ئەوینەم لە بەرچاو بێت، هەمیشە لەسەر زوبانم بێت.

کچەکەمان ناو نا (ئەوین)، ڕۆژی حەوتەمی لەدایکبوونی ڕۆیشتم حەیوانێکم کڕی و کوشتمەوە و ماڵی حاجی ئیبراهیم و ئەکبەر خان و هاوڕێیانی کۆمپانیا و ئەو هاوڕێیانەی لە مزگەوت ناسیبوونم بانگهێشتم کردن. تەنانەت تەلەفۆنم کرد بۆ هاوڕێکانم و حاجی کەمالیش پێم گوتن بووم بە باوک. ئەوین ماڵی ئێمەی کردە ماڵێکی پڕ و ئام و چێژێکی تری بەخشیبوو بە ژیانی ئێمە، گریانی شەوانی زەردەخەنەکانی دڵی ئێمەی ئارام دەکردەوە. ئەو کاتانەی

من دەڕۆیشتم بەئاواتەوە بووم زوو کارم تەواو بێت بۆ ئەوەی کاتی زیاتر لەگەڵ میرا و ئەوینی کچم بەسەر بەرم. ئەو ڕۆژانەی من دەڕۆیشتم بۆ سەر کار میرا ئەوینی لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ وانەکانی مزگەوتی. میرا بووبوو بە یەکێك لە مامۆستاکانی بەشی ژنان لە مزگەوتی (ئەمانە)، نەك هەر ئەوە، بگرە لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و دەوروبەری خۆشیان وەکوو بانگخوازێکی ژن دەناسێنرا. هەمیشە هەوڵی دەدا ژنان هۆشیار بکاتەوە و ڕێنموونیان بکات بۆ ئیسلام، بە هۆی میراوە مزگەوتی (ئەمانە) گەرموگوڕییەکی زیاتری پێوە دیار بوو، ژنی زیاتر سەردانی مزگەوتەکەیان دەکرد. ڕۆژ و مانگەکان خێرا دەڕۆیشتن و بوو بە دوو ساڵ ئێمە هاتبووین بۆ بەریتانیا و ژیانکردنمان لە بێرمنگهام. هەستم دەکرد بەختەوەرترین خێزان لەسەر ڕووی زەوی ئێمەین. من و میرا و ئەوینی کچم. میرا زۆری نەمابوو هەموو قورئانی پیرۆز لەبەر بکات. هەمیشە هەوڵی دەدا و لەماڵی ئێمەدا لە کاتی بێدەنگیدا تەنها دەنگی قورئان دەبیسترا. قورئان ژیانی ئێمەی سەرتاپا کردبوو بە بەهار.

ڕۆژێکیان لەسەر کار بووم. میرا تەلەفۆنی کرد دەگریا، منیش گوتم: چی بووە میرا، بۆ دەگریت، شتێکی خراپ ڕووی داوە؟ ئەوین شتێکی لێ بەسەر هاتووە؟ میرا گوتی: ئێمە باشین بەس یاران. دوای ئەوە میرا دەستی کردەوە بە گریان گوتم: چی؟ یاران کێیە؟ میرا بەگریانەوە وەڵامی دامەوە: یاران خوشکی باران. ئەوانەی پێشتر هاوڕێم بوون. منیش وەڵامم دایەوە: ئێ؟ یاران چیی لێ





هاتووە؟ چی بووە؟ میرا گوتی: لە ئینستاگرام بینیم وا نووسراوە یارانی کچە مۆدێل بە هۆی ڕووداوی هاتوچۆوە گیانی لەدەست داوە. ئەو کاتەی میرا ئەو قسەیەی کرد، ڕاستەوخۆ ئەو قسەیەی یارانم بیر کەوتەوە کە بە میرای گوتبوو پێشتر: ئەو خوایەی ئێمە دەیناسین و بۆ ئێمەیان باس کردووە، لە تەمەنی هەشتا ساڵیش تەوبە بکەیت لێت خۆش دەبێت. بۆ ئەوەی بڕۆم دڵی میرا بدەمەوە، مۆڵەتم وەرگرت و ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵەوە، میرا بەردەوام بوو لە گریان. لەئامێزم گرت و پێم گوت: ئازیزەکەم، تکایە وا لە خۆت مەکە، ئێستاش با تەلەفۆنێك بکەین بۆ باران و پرسە و سەرەخۆشیی خۆمانی ئاڕاستە بکەین. دوای ئەوەی تەلەفۆنمان کرد بۆ باران و میرا ماوەیەکی باش قسەی کرد لەگەڵ باران، میرا دوای تەلەفۆنەکە باشتر بووبوو. تۆزێك ئارام بووبوویەوە. میرا ڕووی کردە من و گوتی: ڕاستە ئەوانە لە کاتێکی ناسك و هەستیار پشتیان لە من کرد، بەڵام باوەڕ کە موحسین، یاران کچێکی خراپ نەبوو و بارانیش کچێکی خراپ نییە. بەڵام تا ئێستا کەسێکیان نەدۆزیوەتەوە یارمەتیدەریان بێت، ڕەنگە گەر گوێیان بۆ من گرتبایە و هاتبان لەگەڵ من بۆ لای تۆ، ئێستا شتەکان جۆرێکی تر بان.

پاش سێ مانگ لە مردنی یاران، ڕۆژێکیان پێش عەسر بوو میرا تەلەفۆنی کرد، بە دەنگیڕا دیار بوو دڵخۆشە و گوتی: موحسین، تکایە ئەمڕۆ کارەکانت زوو تەواو بکە و وەرەوە. منیش گوتم بۆچی؟ میرا گوتی: میوانێکی تایبەتمان هەیە. بیرم کردەوە دەبێت

ئەو میوانە تایبەتە کێ بێت، پاش ئەوەی کارەکانم تەواو کرد، خێرا بەرەو ماڵەوە ڕۆیشتمەوە. دوای ئەوەی لە دەرگام دا، میرا هات دەرگای کردووە و پێکەوە ڕۆیشتینە ژوورەوە، کاتێك گەیشتمە هۆڵەکە بینیم، وا باران هاتووە، خوشکی یاران، خێرا بەرەو ڕووم هات و گوتی: توو خوا براکەم، ڕێگە بدە دەستەکانت ماچ بکەم. منیش وەڵامم دایەوە: أستغفرالله خوشکم، ئێمە شایانی ئەو کارە نین. پاشان بەخێرهاتنم کرد و بەگەرمی پێشوازی و میوانداریمان لێ کرد.

پاش ئەوەی نانی ئێوارەمان خوارد، باران باسی مردنی خوشکەکەی کرد و پێی گوتین: بەڕاستی ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد بەوەی بەدوای قسەکانی میرا نەکەوتین و نەهاتین بۆ لای تۆ. ئێمەش دەمانزانی ئێمە لە چ گێژاو و پیسییەکدا ژیان دەکەین، بەڵام نازانم بوێریی ئەوەمان نەبوو دانی پێدا بنێین یا تەنها خۆمان لە بابەتەکە بێئاگا دەکرد. مردنی یارانی خوشکم بۆ من بوویە هۆکارێك بۆ ئەوەی بەئاگا بێمەوە و سنوورێك بۆ ئەو کارە خراپانەم دابنێم. دەمەوێت لە سفرەوە دەست پێ بکەمەوە. دەمەوێت ببمەوە بە بارانێکی تازە کە ژیانێکی تازەی پێ بێت. الحمدالله ئێستا وا تەوبەم کردووە و وا هەست دەکەم هێواش-هێواش گیانێکی نوێ دێتەوە بەر جەستەم. یەکەمین کەس کە ویستم سوپاسی بکەم و ببینم، حەزم دەکرد ئێوە بن و ئەو خۆشییەم لەگەڵ ئێوە بەش بکەم.

میرا پرسیاری لە باران کرد و گوتی: ئەی ئێستا خەریکی چیت؟ چ کارێك دەکەیت؟ باران وەڵامی دایەوە و گوتی: وا خەریکم





لەگەڵ یەکێک لە کەناڵە ئاسمانییە ئیسلامییەکان گرێبەستێک دەکەم بۆ ئەوەی لای ئەوان کار بکەم.

میرا دووبارە پرسیاری کرد لە باران و گوتی: ئەی عیسا یاسین چۆن ڕێگە بەوە دەدات؟

باران زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: دیارە ئاگادار نین عیسا یاسین چیی بەسەر هاتووە؟

من و میرا بەسەرسامییەوە گوتمان: چی بەسەر هاتووە؟

باران زەردەخەنەی هەر لەسەر ڕوخسار بوو و گوتی: مانگێک لەمەوپێش تووشی جەڵتەی دەماخ بوو و بەشێکی زۆری جەستەی لە کار کەوتووە، بە کورسی هاتوچۆی پێ دەکەن و بەئەستەم دەتوانێت قسە بکات.

باران دوای ئەوە دەستی کرد بە پێکەنین و گوتی: ئەو چەپەڵە زۆر لەمێژ بوو شایانی ئەوە بوو خراپتری لێ بەسەر بێت. هێشتاش ئەو سزایە ناگات بە چارەکی ئەو ئازارەی ئەو تووشی کچە هەژار و بێکەسەکانی کردووە.

پاشان باران ڕووی کردە من و گوتی: خۆزگە کاک موحسین، هەموو کچێک وەکوو میرا بەبەخت بایە و تووشی گەنجێکی باشی وەکوو تۆ بووبایە. داواکارم لە خوا خێر و بەرەکەتی زیاتر بڕژێنێت بەسەر ئەوماڵەدا. من جگە لە بۆنی خۆشەویستی و ڕێز و







میهرەبانی، هۆلی هیچی تر ناکەم لەو ماڵە. مەگەر کچ چیی دەوێت لەوە زیاتر ببێت بە ژنی پیاوێك کە بتوانێت ڕێزی بگرێت و خۆشی بوێت و ئازاری نەدات و ماڵێکی ئاسوودەی بۆ دروست بکات.

باران سێ ڕۆژ لای ئێمە مایەوە و دواتر گەڕایەوە بۆ کوردستان. من و میرا خۆشحاڵ بووین بۆ باران و دوعای خێرمان بۆ کرد. پاش ئەوەی باران ڕۆیشت، میرا گوتی: دەزانی موحسین ئێستا گەر لێم بپرسن خەونت چییە یا پلانت چییە بۆ داهاتوو؟ چییان وەڵام دەدەمەوە. پێیان دەڵێم: هەموو خەونی من ئەوەیە ڕۆژێك بتوانم لە وڵاتی خۆمان، کوردستان، پێشبڕکێیەکی شاجوانی ڕێکبخەم. دەزانی مەرجەکان چی دادەنێم. دەبێت هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر بێت و زۆرترین فەرموودەشی لەبەر بێت بەتێگەیشتنەوە و داپۆشراو بێت و گرنگ نییە ژن بێت یان کچ، گرنگ نییە باڵای چەندە و ڕەنگی چۆنە و تا چەند جوانە، هەموو ئەوەی گرنگ بێت تێگەیشتوویی و ڕەوشتی جوان بێت و نرخی خۆی بزانێت وەکوو ئافرەتێك.

تەماشایەکی کردم، گوتی: یارمەتیم دەدەیت لەو کارەدا وا نییە!

وەڵامم دایەوە و گوتم: بەدڵنیاییەوە یارمەتیت دەدەم.

ئەوین هێواش-هێواش گەورە دەبوو و دەیتوانی لەسەر قاچەکانی خۆی بڕوات و هەندێك قسەش فێر بووبوو. تەمەنی بووبوو بە سێ ساڵ، میرا هەمیشە دەیگوت: موحسین ئەوین چاوەکانی و





لێوەکانی لە تۆ دەچێت، تەنانەت قژیشی وەکوو تۆ لوولە و ئەو خاڵەی سەر ڕوومەتی چەپی وەکوو ئەوەی تۆیە. منیش دەمگوت: سەیر کە لووتی دەڵێیت لووتی تۆیە. ڕەنگی قژی وەکوو ڕەنگی قژی تۆ ڕەشە.

ڕۆژێکیان لە ئیش تەواو بووم و تەلەفۆنەکەم دەرهێنا بۆ ئەوەی تەلەفۆن بکەم بۆ میرا و لێی بپرسم بزانم هیچمان ناوێت لە بازار بیکڕم. بەڵام میرا وەڵامی تەلەفۆنەکەی نەدایەوە، دووبارە هەوڵم دایەوە، دیسان وەڵامی نەدایەوە، دڵم دەیگوت میرا شتێکی لێ بەسەر هاتووە، خێرا ڕۆیشتمەوە و کاتێك دەرگای ماڵەوەم کردەوە، بینیم وا میرا لە هۆڵەکە لەسەر زەوی کەوتووە و ئەوین یەك بە خۆی هاوار دەکات و دەگریت. بەڕاکردن ڕۆیشتم بەرەو لای میرا، بینیم وا لە هۆش خۆی چووە، خێرا تەلەفۆنم کرد بۆ سەیارەی فریاگوزاری و خێرا هاتن، کاتێك دراوسێکانمان گوێبیستی دەنگی سەیارەی فریاگوزاری بوون ،هەموویان هاتن حاجی ئیبراهیم، بە خۆی و خێزانەی و ئەکبەر خان و منداڵ و خێزانەکەی هاتن، خێرا میرامان برد بۆ نەخۆشخانەی شاژنە ئێلیزابێز. دوای ئەوەی دکتۆرەکان میرایان بردە ژوورەوە، پاش ماوەیەك دکتۆرەکە هاتە دەرەوە و گوتی: ئێستا نەخۆشەکەتان باشە و هۆشی بۆ گەڕاوەتەوە، بەڵام پێویستە پشکنینی زیاتر بکەین بۆ دڵنیابوون لە تەندروستیی خێزانەکەتان. پاش ئەوەی ئەنجامی پشکنینەکان گەڕانەوە و دەرکەوت هیچ کێشەیەکی نییە، گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە. ڕۆژ لە

دوای ڕۆژ هەستم دەکرد میرا ڕەنگی دەگۆڕێت و ڕەنگی ڕوخساری زەرد دەبێت، لەگەڵ ئەوەی ئەو وزە و هێزەی جارانیشی نەمابوو. مانگێک تێپەڕی، بە میرام گوت: میرا وا هەست دەکەم تۆ باش نەبیت، خۆت ئامادە بکە با بڕۆین بۆ نەخۆشخانە. میرا گوتی: هیچ نییە، ڕەنگە بە هۆی سووڕی مانگانەکەمەوە بێت. بەڵام من سوور بووم لەسەر ئەوەی کە دەبێت بڕۆین بۆ نەخۆشخانە. پاش ئەوەی ڕۆیشتین بۆ نەخۆشخانە، دکتۆرەکە گوتی: هیچ شتێکی وا نییە، تەنها بەرگریی لەشی تۆزێك لاواز بووە. پشکنینێکی بۆ دەکەین بزانین هۆکارەکەی چییە. پاش ئەوەی ئەنجامی پشکنینەکان هاتنەوە، دکتۆرەکە منی بانگ کرد بۆ ژوورەوە و گوتی: هیوادارم بەباشی لەو قسانەم تێبگەیت کە ئێستا پێت دەڵێم: خێزانەکەی ئێوە تووشی شێرپەنجەی پەنکریاس بووە. ئەوەی جێگای داخە ئەوەیە نەخۆشییەکە لە سەرتای بڵاوبوونەوەیدایە، بەڵام خێرایی دابەشبوونی خانە شێرپەنجەییەکان زۆرە و گەر زوو خەمی لێ نەخۆین، ڕەنگە چارەسەری قورس بێت. کاتێك دکتۆرەکە گوتی: شێرپەنجەیەتی، دونیا لەبەر چاوەکانم ڕەش بوو. دەمم دەتگوت بە شتێك بەستوویانە، نەمدەتوانی قسە بکەم. دکتۆرەکە گوتی: بەڕێزم، ئێوە باشن؟ سەیر کە، هەموو هێزی خێزانەکەت تۆی، بۆیە دەبێت بەهێز بیت و لەبەرامبەر ئەو خۆت بەلاوازی نیشان نەدەیت. ئێستاش پێویستە خێزانەکەت ببەین بۆ بەشی تایبەت بە تووشبووان بە شێرپەنجە. دوای ئەوەی ڕۆیشتمەوە بۆ لای میرا. میرا گوتی:





چی بوو؟ دکتۆرەکە چیی پێ گوتی؟ وەڵامم دایەوە و گوتم: شتێکی وای نەگوت شایانی باسکردن بێت. میرا گوتی: ئەو هەموو ماوەیە لە ژوورەوە بوویت، کەچی ئێستا دەڵێیت شتێکی نەگوت شایانی باسکردن بێت! دوای ئەوە دوو پەرستار هاتن و بە میرایان گوت تکایە وەرە لەگەڵمان. میراش گوتی: بۆ کوێ؟ موحسین من چیمە؟ بۆ قسە ناکەیت؟ ئەوانە من بۆ کوێ دەبەن؟ وەڵامم دایەوە: ئازیزم خۆ گوتم شتێکی وا نییە، برۆ با برۆین لەگەڵیان بزانین دەمانبەن بۆ کوێ. هەر لەناو نەخۆشخانەی شاژنە ئیلیزابێز رۆیشتین بەرەو بەشی شێرپەنجە و چارەسەری شێرپەنجە. میرا کاتێك نووسراوی سەر دیوارەکەی بینی، ڕاوەستا و گوتی: ئەوە چییە موحسین؟ چی لەسەر ئەو دیوارە نووسراوە؟ دوای ئەو قسانەی ڕاستەوخۆ میرا لە هۆش خۆی چوو، خێرا بردمانە ژوورەوە. کاتێك بە هۆش خۆی هاتەوە، دووبارە پرسیی: من لەکوێم؟ ئەوە چی بوو من لەسەر دیوارەکە بینینم نووسرابوو؟ خۆم لێ نزیك خستەوە و لەئامێزم گرت و پێم گوت: ئارام بەوە ئازیزم، هەموو شتێك باش دەبێت، بەس ئارامت هەبێت. پاشان من ڕۆیشتم بۆ ئەوەی کاروباری ناو نەخۆشخانە تەواو بکەم و ناوی تۆمار بکەن لە بەشی شێرپەنجە. دوای ئەوەی کاروبارەکانم تەواو کرد، دکتۆرەکە هات و گوتی: وەکوو چارەسەری سەرەتایی ئەو دەرزییەی بۆ دەکەین، بزانین کاردانەوەی نەخۆشییەکە چۆن دەبێت. دەتوانن نەخۆشەکەتان ببەنەوە، بەڵام دەبێت ڕۆژانە بەبەردەوامی بێن بۆ نەخۆشخانە بۆ وەرگرتنی پشکنین و دەرمانەکانی.

پاش ئەوەی گەڕاینەوە بۆماڵەوە، ڕۆیشتم بۆ لای ماڵی حاجی ئیبراهیم و ئەوینم هێنایەوە، لەبەر ئەوەی پێش ئەوەی من و میرا بڕۆین بۆ نەخۆشخانە ئەوینمان برد بوو بۆ ماڵی ئەوان. کاتێک گەیشتمە بەردەم ماڵی ئەوان، لە دەرگام دا، خێزانی حاجی ئیبراهیم دەرگاکەی کردەوە، فەرمووی لێم کرد بۆ ژوورەوە، بەڵام من سوپاسم کرد و گوتم: دەبێت بڕۆمەوە. سەیرێکی کردم، گوتی: ئەندازیار لە باش ناچیت، شتێک ڕووی داوە؟ دکتۆرەکە چیی گوت؟ وەڵامم دایەوە و گوتم: میرای خێزانم شێرپەنجەیەتی. خێزانی حاجی ئیبراهیم دەستی خۆی نا بە دەمیەوە و گوتی: چی؟ شێرپەنجە؟ چ جۆرێکی؟ وەڵامم دایەوە: بەڵێ، شێرپەنجەی پەنکریاس. کاتێک ئەو قسانەی لە من بیست، نەیتوانی هیچ بڵێت، خێرا ڕۆیشت ئەوینی بۆم هێنا و دواتر من گەڕامەوە بۆ ماڵی خۆمان. کاتێک گەیشتمەوە میرا دەگریا. خێرا ڕۆیشتم بۆ لای، پێم گوت: تکایە مەگری ئازیزم، دڵنیا بە هەموو شتێک باش دەبێت، ئەوەش تاقیکردنەوەیەکە بۆ ئێمە، دەبێت لەسەری ئارامگر بین. خوا (البصير و السميع)ە، واتا دەمانبینێ و گوێبیستی ئێمەشە. لە هەمان کاتدا (المجيب) واتا وەڵامدەرەوەی دوعاکانیشمانە، (الرحمان)ە واتا بە خشەندەیە، کاتێک تۆ داوای شتێکی لێ دەکەیت، پێت دەدات. سەرەڕای هەموو ئەوانە (الكافی) واتا تەنها ئەو بەسە بۆ بەندەکانی. گەر ئەوت لەگەڵ بێت، هەموو دونیاش دژت بێت خەمت نییە، خۆ ئەگەر ئەو لە دژت بێت، هەموو دونیاش پشتگیریت بکات بەست نییە.





ڕۆژبەڕۆژ تەندروستیی میرا بەرەو خراپی دەڕۆیشت. هەرچەندە دکتۆرەکان هەموو هەوڵێکی خۆیان دەدا، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو، دکتۆرەکە دەیگوت: جەستەی هیچ وەڵامێکی ئەرێنیی نییە بۆ دەرمانەکانمان. لە کۆتاییدا دکتۆرەکان بڕیاریان دا بەوەی دەبێت لە نەخۆشخانە بمێنێتەوە بۆ ئەوەی دەست بکەن بە چارەسەری کیمیایی بۆی. میرا وەکوو جاران خەمبار نەبوو، نازانم چی ڕووی دابوو، بەڵام ئەو ترسەی سەرەتا هەیبوو لە نەخۆشییەکە، ئێستا نەیمابوو. ئەو میرایەی وەکوو هاوەڵی شاجوان هەڵبژێردرا، وا ئێستا لاواز لاواز بووە و جەستەی زەرد هەڵگەڕاوە، قژە جوان و ڕەشەکەی نەمابوو. بەڵام لە جاران بەهێزتر بوو، نازانم هۆکار چی بوو.

من ئەوینم بردبوو بۆ لای ماڵی حاجی ئیبراهیم و هەرکاتێکیش گریابایە یا میرا داوای کردبایە، دەمبرد بۆ لای. منیش شەو لای ئەو دەمامەوە و ڕۆژانەش دەڕۆیشتم بۆ سەر کار. ڕۆژێکیان بانگی کردم و گوتی: موحسین وا هەست دەکەم ئەوە کۆتا ساتەکانی ژیانمە و زۆرم نەماوە بمرم، بە دکتۆرەکان بڵێ بێسوودە هەوڵەکانیان. منیش دەستم کرد بە گریان و پێم گوت: تکایە ئەو قسانە مەکە، وا دکتۆرەکان خەریکی کاری خۆیانن، پشتیوان بە خوا ئەو دەرمانانە دەبنە هۆکارێك بۆ باشبوونەوەت. زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: دەتوانی دەفتەرێك و قەڵەمێکم بۆ بهێنی. منیش دەفتەرێك و قەڵەمێکم بۆ هێنا. سوپاسی کردم و گوتی: هەندێك شت هەیە دەمەوێت بیاننووسم، نازانم توانام دەبێت یان نا.

ڕۆژەکانم لە ئێش زۆر بەقورسی لێ دەڕۆیشتن و لەبەرانبەر میرا دادەنیشتم و تەماشام دەکرد بزانم چی دەنووسێت. ڕۆژێکیان لە نەخۆشخانە بووم، مۆبایلەکەم زەنگی لێدا. دوای ئەوەی هەڵم گرت زانیم لە کوردستانەوە تەلەفۆن دەکەن. وەڵامم دایەوە: بەڵێ. کەسێک گوتی: ئەو ژمارەیە هی ئەندازیار موحسینە، هاوسەری میرا؟ وەڵامم دایەوە: بەڵێ خۆیەتی، فەرموو! وەڵامی دامەوە و گوتی: بەڕێزم من کوڕی عیسا یاسینم، باوکم دەیەوێت لەگەڵ میرا خاتوون قسە بکات. منیش مۆبایلەکەم دا بە میرا، نەمزانی چی دەڵێن، تەنها ئەوەندە نەبێت گوێم لە میرا بوو گوتی: خوا بتبەخشێت. پاشان مۆبایلەکەی دایەوە بە من و گوتی: دەیەوێت لەگەڵ تۆش قسە بکات. پاش ئەوەی وەڵامم دایەوە: بەڵێ، دەنگێکی لاواز بەپچڕپچڕی هاتە بەرگوێم و گوتی: ئەندازیار بمبورە. بەڕاستی... بەڕاستی هەموو ئە... ئەوەی ئێستا تووشی بوومە... بوومە بە هۆی خراپی و پیسیم بوو... بوو لەگەڵ ئێوە. دەزانم... دەزانم قورسە، ماوەیەك ڕاوەستا، دیار بوو هەناسە تەنگ بووبوو، دواتر بەردەوام بوو و گوتی: دەزانم قورسە ئەو داوایە، بەڵام تکایە... تکایە گەردەنم ئازاد بکەن. دەزانم درەنگیشە بۆ ئەو قسەیە، بەڵام... بەڵام داواتان لێ دەکەم بگەڕێنەوە بۆ کوردستان، بەڵێن بێت کوڕەکانم ببنە پاسەوانی بەردەرگاتان و بتانپارێزن و هەموو شتێکی کۆنیش لەناو بەرن. بەس ئێوە گەردنم ئازاد بکەن و لێمان خۆش بن. دەزانی شەوانە خەوم نییە، دەشزانم بە هۆی چ شتێکەوەیە. ئێستاش دەبێت تەلەفۆنەکە دابخەمەوە چوونکە





ناتوانم زۆر قسە بکەم بە هۆی نەخۆشییەکەم، گەر گەردنم ئازاد بکەن، چاکەیەکی گەورە دەکەن لەگەڵم. پاشان تەلەفۆنەکە داخرا.

میرا پاش تەلەفۆنەکە هیچی نەگوت، چوونکە ئەو ماوەیە زۆرزۆر بێهێز بووبوو، زۆربەی کاتەکان دەخەوت و نیشتیهای بۆ خواردن نەمابوو و ماوەماوە دەیگوت: ئازارم زۆرە.

ڕۆژێکیان لەسەر ئیش بووم، تەلەفۆنێك لە نەخۆشخانەوە هات و گوتیان: خێزانەکەت تەندروستیی زۆر خراپە، خێرا خۆت بگەیەنە نەخۆشخانە. منیش خێرا ڕۆیشتم بۆ نەخۆشخانە. کاتێك گەیشتم، مشەوەشیم پێوە دیا ربوو و قژەکانم ئاڵۆز بووبوون، ڕۆیشتم بۆ لای میرا. میرا بە دەستی ئاماژەی بۆ کردم کە لێی نزیك ببمەوە، کاتێك لێی نزیك کەوتمەوە، دەستی بەرز کردەوە و وەکوو شانە بەناو قژەکانی منیدا هێنا و قژەکانی بۆ ڕێك دەخستم. گەر لێم بپرسن جوانترین شانەیەك چی بووە قژەکانت پێی شانە کردبێت، ئەوا بێ دوودڵی دەڵێم دەستی هاوسەرەکەم بووە. میرا بەردەوام بوو لە داهێنانی قژەکانم، تا ئەوە بوو دەستم گرت و توندتوند ماچم کرد. بە دەنگێکی نزمەوە گوتی: لەو دەفتەرەدا کۆمەڵێك ئامۆژگاری و قسەم نووسیوە بۆ ئەوین، هەرکاتێك زانیت بایی ئەوە گەورە بووە و تێدەگات لەو قسانە، بیدە پێی با بیانخوێنێتەوە، دڵنیام زۆر بەسوود دەبێت بۆی. تۆش بیخوێنەوە و سەیرێکی بکە، گەر زانیت لە شتێکی کەمە، بۆی زیاد بکە. ئەوەشیان نامەیەکە لە منەوە بۆ تۆ، بەڵێن بدە تاوەکوو من دەمرم نەیکەیتەوە.

من خەریك بوو دەگریام و پێم دەگوت، ئەو قسانە چییە، بڕیار نییە بۆ هیچ شوێنێك بڕۆیت، پێکەوە کچەکەمان گەورە دەکەین و پێکەوە پیر دەبین. خەریك بوو ئەو قسانەم بۆ میرا دەکرد کاتێك هەستم کرد دەستی شل بوو و فرمێسك لە چاوەکانی هاتە خوارەوە، بزەیەکی جوان لەسەر ڕوخساری بوو. هەرچەندی بانگم کرد: میرا، میرا! هیچ وەڵامێکی نەبوو، دکتۆرەکان هاتن و دواتر یەکێکیان منی هەڵستاند و گوتی: بەڕێزم، بەداخەوە، بۆخۆتان خۆش بن.

کاتێك چاوەکانم کردەوە، بینیم حاجی ئیبراهیم لەتەنیشم لەسەر کورسییەك دانیشتووە. پرسیم من چی دەکەم لێرە؟ کوا میرا؟ حاجی ئیبراهیم هات بۆ لام و پێی گوتم: ئارام بەوە إنا لله وإنا إلیه راجعون.

پاش ئەوە ڕۆیشتین جەستەی میرامان وەرگرتەوە ئەو جەستەیەی کە تەنها چەند کیلۆیەکی لێ مابووەوە. دوای ئەوەی نوێژمان لەسەر کرد و بەخاکمان سپارد، هاتینەوە بۆ ماڵێ، بەڵام کام ماڵ، ماڵێك هیچ جێگایەکی لە ماڵ نەدەچوو بێ میرا، ئەو کاتەی میرا زیندوو بوو وا هەستت دەکرد دیوارەکانیش گیانیان لەبەرە، بەڵام ئێستا بوونەتەوە چوار دیواری ساردوسڕ.

هاوڕێکانم هەموویان تەلەفۆنیان کرد و زۆر خەمبار بوون بە کۆچی دوایی میرای خێزانم، حاجی کەمال تەلەفۆنی کرد و سەرەخۆشیی لێ کردم و داوای لێ کردم بگەڕێمەوە بۆ کوردستان و یارمەتیی بدەم لە ئیش و کاری کۆمپانیا.





پێنج ڕۆژ ڕۆیشتبوو بەسەر کچی دوایی میرادا، نەمدەتوانی هیچ بکەم. لە ماڵ نەدەڕۆیشتمە دەرەوە، گەر ئەوینیش گریابایە ماوەیەک دەیانهێنا بۆ لای من و پاش ئەوەی ژیر دەبوویەوە کچەکەی حاجی ئیبراهیم دەستی دەگرت و دەیبردەوە بۆ ماڵی خۆیان.

ساتێک بیرم ڕۆیشت بۆ لای ئەو نامەیەی میرا بۆی نووسیبووم، واهەستم دەکرد ئەو نامەیە بتوانێت تۆزێک لەو ئازارەی سەر دڵم کەم بکاتەوە. بۆیە ڕۆیشتم ئەو نامەیەم هێنا و کردمەوە. تێیدا نووسرابوو:

ـ السلام علیکم

سڵاو لەو پیاوەی فێری خۆشەویستیی کردم. سڵاو لەو پیاوەی توند دەستمی گرت و لەناو تاریکییەوە منی هێنا بەرەو ڕووناکی. سڵاو لەو پیاوەی بە هەموو ئەوەی هەیبوو لەگەڵم بوو و هەموو شتێکی خۆی پێ دام، لەبەرامبەردا من جگە لە ناخۆشی و ئاوارەیی و دووری لە نیشتمان و دۆستان هیچی ترم پێ نەدا. ئازیزم، دەزانم ئێستا کە ئەو نامەیە دەخوێنیتەوە چەندە دڵشکاوی، چەندە هەست بە تەنهایی دەکەیت. سوپاست دەکەم بۆ هەموو شتێکی لە پێناو دڵخۆشیی من کردت. سوپاس بۆ بوون بە هاوسەرم. ئازیزم، بۆ ساتێکیش گومانم نەبووە لە خۆشەویستیی تۆ بۆ خۆم و دەزانم چەند منت خۆش دەوێت، دەزانم چەند بۆت قورسە لەجیاتیی من کەسێک لەتەنیشت خۆت ببینیت، بەڵام ئەوە سوننەتی ژیانە، دەبێت هەریەکێکمان پێش ئەوەی تر بمرێت. خوا چارەنووسی منی

وا دانابوو کە ئاوا زوو بڕۆم. خۆشەویستم موحسین. ئەوین هێشتا منداڵێکی بچووکە، تۆ بەتەنها ناتوانی ئاگاداری بیت. ئەوین پێویستی بە کەسێکە ڕۆڵی دایکی بۆ بگێڕێت، من دڵنیام لەوەی هەرگیز بیرت لەوە نەکردۆتەوە ژنی دووەم بەسەر من بهێنی، بەڵام من داوات لێ دەکەم هەرچیی زووە بڕیار بدەیت و کەسێکی گونجاو بکەیتە دایکی ئەوین. ژنێک بێت بتوانێت پەروەردەیەکی باشی ئەوین بکات و باش ئاگای لێ بێت. خۆ من دڵنیام لەوەی هەر وەکوو چۆن دایکمان عائیشە غیرەی دەکرد لە خەدیجەی دایکمان، ئەوها ئەو ژنەی تۆ دەیهێنی غیرە دەکات لە من، چوونکە دڵنیام منت زیاتر خۆش دەوێت لە ئەو.

خۆشم دەوێیت!

نامەی ژنێک کە نەیتوانی ببێتە ژنێکی باش بۆ هاوسەرەکەی.

هاوسەری ئازیزت... (میرا)

دوای خوێندنەوەی نامەکە نەمتوانی کۆنترۆڵی فرمێسکەکانم بکەم. بیرم لەو دێڕە دەکردەوە کە نووسیبووی ئەوین پێویستی بە دایکە. ئاخر چۆن بتوانم کەسێک لەجیاتیی تۆ وەکوو دایکی منداڵەکەم قبوڵ بکەم، چۆن ڕازی بم منداڵەکەم لەجیاتیی تۆ بە دایکە بانگی کەسێکی تر بکات.

لەو بیرکردنەوەنەدا بووم و نامەکەم بە دەستەوە بوو کە حاجی ئیبراهیم هات، دوای ئەوەی لە ئەحواڵی منی پرسی، گوتی: کوڕم





کچی دونیای، چوونکە باوکی وەکوو ئەوەی تۆ دووبارە نابێتەوە. ڕێگەم بدە تۆزێك باسی ئەوەت بۆ بکەم چۆن باوکتم ناسی. ئێوارە بوو، خۆری خەڵکی ڕووی لە ئاوابوون بوو، بەڵام من بێئاگا بووم لەوەی تازە وا خەریکە خۆری من هەڵدێت و ژیانم ڕووناك دەکاتەوە. ناسینی باوکت گەورەترین دیاریی خوا بوو بۆ من. ئەو منی لە ناو جیهانێکی بۆگەنی پیس، کە هیچ نرخێکی بۆ ئافرەت نییە، ڕزگار کرد بەرەو جیهانێك کە تێیدا ژن شاژنە و خاوەنی کەسایەتیی بەهێزی خۆیەتی و ڕێزلێگیراو وخۆشویستراوە. ئەو بوو بە باشترین پاڵپشتی من و بوو بە قەڵایەك بۆ پاراستنی من. ئەو لە پێناو من ناڕەحەتی و لێدانی زۆری بینی. باشترین ژیانی بۆ من دروست کردبوو. هەستم دەکرد من بەختەوەرترین ژنی دونیام و بە هاتنەدونیای تۆش ئەو هەستە خۆشە زیاتری کرد. بەڵام دیارە خوا باشتر دەزانێت خێر لە چیدایە و شەڕ لە چیدایە. دەزانم مردنی من زۆر ئازاربەخش بووە بۆ باوکت، بەڵام من لە پێناو ئەوەی کەسێك هەبێت ئاگای لێت بێت، داوام کردووە لە باوکت دوای من هاوسەرگیری بکاتەوە. کچم باش ئەو دێڕانەی ئێستا بخوێنەوە و دووبارە و سێبارەشیان بکەوە. ئەوانەی لێرەدا نووسیومن، وا هەست دەکەم یارمەتیدەرێکی باشت بن لە ژیان. کچی خۆم پیاوان دوژمنی ژنان نین، پیاوان بۆ ئەوە دروست نەکراون ئێمە ڕکابەرایەتییان لەگەڵ بکەین، بەڵکوو خوا هەردووکمانی بۆ ئەوە دروست کردووە ببینە هاوڕێ و هاوکاری یەکتری بۆ ژیانێکی ئاسوودە. کچی خۆم، بزانە سەربەرزیی مرۆڤ و









ژنیش بەتایبەتی بە ئیسلامەوەیە، من ئەو کاتە هەستم بە نرخی خۆم کرد کە ئیسلامم قبوڵ کرد، ئەو کات زانیم کە ژیانم واتایەکی تری هەیە کە موسڵمان بووم. کچی خۆم، خۆت بپارێزە لەوەی دۆستایەتیی کەسانێك بکەیت کە لە خوا دوورت دەخەنەوە. هەمیشە خۆت لە کەسانێك نزیك بخەوە کە ڕەزامەندیی خوایان مەبەست بێت. کچی خۆم، چۆن خۆت لە ئاگرێك دەپارێزی بۆ ئەوەی نەتسووتێنێت و لە ئاوێك نەتخنکێنێت و لە مارێك هەڵدێیت بۆ ئەوەی پێتەوە نەدات، ئاواش تۆ هەڵبێ لە دەستی ڕێکخراوەکانی ژنان. من تا ئەو کاتەی لەگەڵ ئەواندا بووم جگە لە مرۆڤێکی دۆڕاو، هیچی تر نەبووم، بەڵام بەس بە خۆڕزگارکردن لێیان، بوومە سەربەرزترین و براوەترین ئافرەت. کچی خۆم، دڵنیام لەوەی بوویت بە کچێکی زۆر جوان، بۆیە ئاگاداری ئەو کوڕانەبە کە دەیانەوێت بە جۆرێك لە جۆرەکان لێت نزیك بکەونەوە، نەکەی فریوی قسە بریقەدارەکانیان بخۆیت، کوڕی باش گرنگی بە ڕەوشتی کچ دەدات پێش جوانییەکەی، بەڵام کوڕی خراپ هەموو ئەوەی بەلایەوە گرنگە جوانییەکەتە و تەنها تا کاتێکیش بۆی گرنگی کە دەبینێت بوویت بە داوی فێڵەکانی ئەوەوە، ئیتر ئەوەی بیەوێ لەگەڵت دەکات و پاشان تۆ بەوێرانی جێ دەهێڵێت. خۆشم دەوێیت وشەیەکی جوانە، بەڵام وریا بە هەڵت نەخەڵەتێنێت. کچی خۆم، لەگەڵ هەمووان بە باشی و ڕێزەوە مامەڵە بکە، بەڵام بشزانە هەمووان شایانی ئەو ڕێزە نین. کچی خۆم، لەجیاتیی ئەوەی گرنگی بە ڕوخساری دەرەوەت بدەیت، هەوڵ بدە

ناخت جوان بکەیت، ناخی جوانیش بە خوێندنەوە و ئەنجامدانی پەرستشەکان و خۆپاراستن لە خراپەکان و قورئانخوێندن و چاکەکردن دەبێت، گڵۆپت بینیوە هەموو ئەو جوانی و ڕووناکییەی هەیەتی بە هۆی ئەو تێلەی ناوەوەیەتی، خۆ هەرچەندە دیزاینی دەرەوەی ئەو گڵۆپە سەرنجڕاکێش بێت و بەلاتەوە جوان بێت، ئەگەر ئەو تێلەی ناوەوەی ئیشی نەکرد ئەوا گڵۆپەکە هیچ نرخێکی نییە. کچی خۆم، کچ هەرچەند ئازیز و خۆشەویست بێت لای دایك و باوکی، بەڵام دەبێت ڕۆژێك بێت ئەو ماڵە جێ بهێڵێت و ڕوو بکاتە ماڵی کەسێکی تر و ببێتە هاوسەری کەسێك، جا تۆ زۆر وریا بە لە هەڵبژاردنی ئەو کەسە، هەوڵ بدە کەسێك هەڵبژێریت لێت تێبگات و هاوڕێیەتیت بکات. کچی خۆم، ژیانی هاوسەرگیری ژیانێکی خۆشە، بەڵام بەدووریش نییە لە کێشە و ناخۆشییەکان و ڕوو دەدات تووشی کێشە بیت لەگەڵ هاوسەرەکەت و لە یەکتری تووڕە بن و ناکۆکیتان لەنێوان دروست ببێت، بەڵام ئەو کاتەی تۆ لەگەڵ کەسی گونجاو هاوسەرگیری دەکەیت، ئەو شتانەش زۆر بەخێرایی تێدەپەڕن. کچی خۆم، ژن و مێرد وەکوو ساردی و گەرمی سوور و شینی ناو وایەرێکی کارەبایی وان، گەر هات و ئەو دوو وایەرە شانبەشانی یەکتری ڕۆیشتن، ئەوا ماڵ و کۆمەڵگا ڕۆشن دەکەنەوە، خۆ ئەگەر هات و ویستت سەرەکانیان لە یەکتری بدەیت و بیانکەیت بەگژ یەکدا، جگە لە تاریکی بۆ ماڵ و کۆمەڵگا هیچی ترت دەست ناکەوێت. کچی خۆم، تا دەتوانی سوور بە هاوسەرگیری لەگەڵ کوڕێك بکەیت کە

پابەند بێت بە دینەوە و تێگەیشتوو بێت لە دینەوە، چوونکە ئەوە وای لێ دەکات و هانی دەدات بۆ ئەوەی ببێتە باشترین هاوسەر بۆت. کچی خۆم، هیواخوازم باش بیت و ببیتە کچێکی باش بۆ باوکت، چوونکە دڵنیام لەوەی ئەو بۆتە باشترین باوك بۆت.

دایکی کۆچکردووت (میرا)

پاش ئەوەی نووسراوەکەم خوێندەوە، وا هەستم کرد پێویست ناکات من هیچ بنووسم، ئەوەی گرنگ بوو میرا باسی کردبوو. پاش ئەوەی لە فڕۆکەخانەی دوبەی فڕۆکەکە نیشتەوە، خێرا ڕۆیشتین بەرەو ئەو فڕۆکەیەی کە تەنها نیوکاتژمێری مابوو بۆ ئەوەی گەشت بکات بۆ هەولێر. پاش ئەوەی سواری فڕۆکەکە بووین، بەڕێکەوتین بەرەو هەولێر. پاش ئەوەی لە فڕۆکەخانە دابەزین، خێرا تەلەفۆنم کرد بۆ حاجی کەمال و پێم گوت: من و کچەکەم وا لە فڕۆکەخانەین. حاجی کەمالیش وەڵامی دایەوە: زۆر باشە، ئێستا منیش خۆم دەگەیەنمە ئەوێ. نزیکەی چل خولەکێك چاوەڕێمان کرد تاوەکوو حاجی کەمال هات. پاش ئەوەی هات و یەکتریمان لەباوەش گرت و بەگریانەوە گوتی: ببورە گەر زۆر چاوەڕێتان کردبێتم. دواتر تەماشایەکی ئەوینی کرد و گوتی: ماشاء الله چەند کچێکی جوانە. ئەوە ناوی چییە؟ وەڵامم دایەوە: ئەوین. پاش ئەوەی ڕۆیشتین و سواری سەیارەکەی حاجی کەمال بووین. لەناو سەیارە حاجی کەمال گوتی بەڕاستی زۆر داخم خوارد بۆ کۆچی





دوایی خێزانەکەتان، إن شاء الله خودا بە گەورەیی خۆی لێی خۆش بووە. منیش گوتم: أمین یارب العالمین. پاش ئەوە حاجی کەمال گوتی: ئەندازیار پێش ئەوەی بگەینەوە ماڵەوە شتێك هەبوو حەزم دەکرد لەگەڵتان باسی بکەم، ئەویش بابەتی ژنهێنانەوەتانە. وەکوو ئاگاداری کچەکەت زۆر بچووکە، بەتەنها تۆ ناتوانی ئاگاداری بیت، بۆیە پێویستی بە دایکێك هەیە بۆ ئەوەی ئاگای لێ بێت. من ماوەیەکی زۆر بوو دەمویست نوری کچم هاوسەرگیری بکات و کوڕی زۆریش دەهاتن بۆ داواکاری، بەڵام ڕەتی دەکردنەوە، سەرەتا نەمدەزانی هۆکاری ئەوە چییە ئەو هەموو کوڕە باشە ڕەت دەکاتەوە، تا ئەوە بوو ڕۆژێکیان حاجی سەبیعەی خێزانم گوتی: نوری کچمان عاشقی کەسێکە و هەر ئەویش هۆکارە بۆ ئەوەی ئەو هەموو کوڕە ڕەت بکاتەوە. منیش پێم گوت: ئێ ئەوە شاردنەوەی بۆچییە، با بانگی کوڕەکە بکات و بیبینین، زانیمان کوڕی باشە، ئێمەش ناوی خوای لێ دێنین. حاجی سەبیعە وەڵامی دامەوە: ئاخر نابێت، ئەو کوڕە ئێستا خێزاندارە و لە کوردستانیش نەماوە. منیش گوتم: کێیە ئەو کەسە؟ خێزانەکەم وەڵامی دامەوە و گوتی: بێگانە نییە، زۆریش لات ئاشنایە. ئەو کەسە ئەندازیار موحسینە. وەڵامەکەی تووشی سەرسووڕمانی کردم و خێرا بانگی نورم کرد و لێم پرسی ئەوە ڕاستییە تۆ ئەندازیار موحسینت خۆش دەوێت. نور لە شەرمان سوور هەڵگەڕا و هیچی نەگوت. پاشان دووبارە لێم پرسی: ئەی کچی خۆم بۆچی منت ئاگادار نەدەکردەوە یان بە







موحسینت نەدەگوت کە خۆشت دەوێت. نور وەڵامی دامەوە و گوتی: باوکە گیان، وەڵاهی بەدەست خۆم نەبوو و نەشمدەتوانی بە تۆ بڵێم و شەرمیشم دەکرد لەوەی بە ئەندازیار موحسین بڵێم و هەستەکانی خۆمی بۆ دەر ببڕم، کاتێکیش ویستم ئەو کارە بکەم، کات درەنگی کردبوو و ئەندازیار لەگەڵ خاتوو میرا خەریک بوو هاوسەرگیریی دەکرد. منیش پێم گوت: کچم ئێستا چی دەکەیت، ئەوە ئەندازیار ژنی خۆی هەیە و لەگەڵیشی بەختەوەرە، خۆ تۆ بەنیاز نیت هەموو ژیانت لەنێوان ئەو چوار دیوارە بەسەر ببەیت، پێویستە بیرێک بکەیتەوە لە خۆت، بۆیە ئەندازیار لەبیر بکە و هەوڵ بدە کوڕێکی تر بدۆزیتەوە. نور گوتی: بابە گیان، پێویستم بە کاتە. منیش پێم گوت چەندت کات دەوێت، بیری لێ بکەوە.

کاتێک حاجی کەمال خەریک بوو ئەو قسانەی بۆم دەکرد، نەمدەزانی چی بکەم، ئاخر چۆن دەبێت کەسێک هێندە منی خۆش بوێت و من ئاگادار نەبم، بۆچی هەرگیز هەستم بە هیچ شتێک نەکرد. لەو بیرکردنەوانەدا بووم، حاجی کەمال گوتی: وا خەریکە دەگەینەوە ماڵی. حەز دەکەم گەر تۆ پێت باشە، دووقۆڵی لەگەڵ یەکتری قسان بکەن و بڕیاری کۆتایی خۆتان بدەن.

پاش ئەوەی گەیشتینە ماڵی حاجی کەمال و دەرگاکەی بۆ کرایەوە، ڕۆیشتینە حەوشەکە، لەوێ حاجی سەبیعە و نور ڕاوەستابوون و بەگەرمی بەخێرهاتنی ئێمەیان کرد و نور ئەوینی لەباوەش گرت و ڕۆیشتینە ژوورەوە، پاش ئەوەی لە تەندروستیی حاجی سەبیعەم

پرسی و ئەویش لە تەندروستیی منی پرسی، حاجی کەمال ڕووی کردە من و نور و پێی گوتین؛ حەز دەکەم بچنە ناو باخچەکە و کەمێك قسە بکەن پێکەوە. پاش ئەوەی ئێمە دووقۆڵی ڕۆیشتین بۆ ناو باخچەکە، ماوەیەك بوو هیچمان هیچی نەدەگوت. پاشان نور گوتی: دەزانی ئەندازیار مرۆڤ گەر کەسێکی خۆش ویست، نابێت ئەو خۆشەویستییە بشارێتەوە، دەبێت مرۆڤ بوێریی هەبێت و ئەو قسەیەی لە دڵیدا بە بەرامبەری بڵێت. ڕەنگە ڕۆژێك دابێت تۆ بتەوێت بیڵێیت و ئیتر ئەو نەمابێت و ڕۆیشتبێت و کات درەنگی کردبێت. منیش پێم گوت: لە کەییەوە ئەو هەستەت بەرامبەر من بۆ دروست بوو؟ بۆچی بەنهێنی هێشتتەوە؟ بۆچی قسەت نەکرد؟ نور وەڵامی دامەوە و گوتی: هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە کە کارم لەگەڵ کردن، زانیم ئێوە کەسێکی جیاوازن و کەوتنە دڵمەوە. چەند جارێك ویستم پێت بڵێم، بەڵام نازانم بۆچی نەمدەگوت، هەندێك جاریش چاوەڕێ بووم تۆ بێیت پێم بڵێیت خۆشم دەوێیت، بەڵام تۆ ڕۆیشتیت و بۆ جارێکیش ئەوەت نەگوت. وەڵامم دایەوە و گوتم: ئێوە باشترین و ژیرترین کچن، بێگومان خەونی هەموو کوڕێکە ئێوە بینە هاوسەری، هۆکاری ئەوەی من هەرگیز هەنگاوێکم نەنا بەردو پێشەوە، ئەوە بوو نەمدەویست هەرگیز حاجی کەمالی باوکت بەهەڵە لێم تێبگات و وا بزانێت نمەکبەحەرام دەرچووم و چاوم بڕیوەتە کچ و سامانی ئەو. ماوەیەك هیچمان قسەمان نەکرد. دواتر گوتم: تازە ڕابرد و ڕۆیشت، ئەوەی لە ڕابردوو گرنگترە ئەو

ڕاهاتووەیە کە لەپێشهانە. دەمەوێت هاوسەرگیری بکەمەوە، بەڵام وەکوو خۆت ئاگاداری من خاوەنی کچێکم، نازانم تۆ بەوە ڕازیت یان نا. نور گوتی: ئەوین! چەند شێوەی لە تۆ دەکات، ڕاستیان گوتووە کاتێك ژن هاوسەرەکەی خۆش دەوێت، هاوشێوەکەی ئەو دەهێنێتە دونیاوە، دڵنیام خاتوو میرا ئێوەی زۆر خۆش ویستووە. دەزانی چی بوو، بیرتە ئەو ڕۆژەی لەگەڵ خاتوو میرا کۆتا جار هاتن بۆ ماڵئاواییکردن، من بەگریانەوە ڕۆیشتمە سەرەوە. تا ئەو ساتەش هیوایەکم مابوو بۆ ئەوەی بگەم بە تۆ، بە خۆم دەگوت: کێشە نییە، دەبم بە هاوسەری دووەمی، بەس با لەگەڵ ئەو بم، بەڵام کاتێك زانیم وا هەموو شتێك کۆتایی هاتووە و ئیتر من ناتوانم بگەم بە تۆ، زۆر نائومێد بووم، هەر بۆیەش خۆم پێ کۆنترۆڵ نەکرا و گریام. ڕاستی، سەرەڕای ئەو نائومێدییە گەورەیەش نازانم بۆچی هەمیشە هەستێکم هەبوو کە دەگەڕێیتەوە. منیش زەردەخەنەیەکم بۆی کرد و پێم گوت: ئەو هەستەت ڕاستی کرد لەگەڵت و ئەوە گەڕامەوە، هیوادارم هاتنەوەم درەنگ نەبووبێت. پاش ئەوە ڕۆیشتینە ژوورەوە و ڕووم کردە حاجی کەمال و حاجی سەبیعە خاتوون، پێم گوتن: دەمەوێت تاوەکوو لای هاوڕێکانم بچم و شەویش لەسەر مۆڵەتی ئێوە بێینە خوازبێنی. حاجی کەمال زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: ئەوەیان هەر زۆر کارێکی باشە. پاش ئەوە ویستم ئەوینیش لەگەڵ خۆم بەرم، بەڵام نور گوتی: با لای خۆم بێت، من ئاگام لێی دەبێت. حاجی کەمال گوتی: ئەوە سویچی سەیارەکەم، بڕۆ بیبە.





پاش ئەوەی لە ماڵی ئەوان هاتمە دەرەوە، خێرا مۆبایلەکەم دەرهێنا و تەلەفۆنێکم کرد بۆ مەحوی، پاش ئەوەی ماوەیەك تێپەڕی، دەنگێك گوتی: بەڵێ! منیش سڵاوم لێ کرد و گوتم: مەحوی گیان موحسینم. مەحوی گوتی: کام موحسین؟ وەڵامم دایەوە، مەگەر تۆ چەند هاوڕێت هەیە ناویان موحسین بێت؟ مەحوی گوتی: ئەوە تۆیت موحسین گیان، ئەو ژمارە تەلەفۆنە و تۆ. تۆ نابێت لە بەریتانیا بیت؟ ئەی ئەو ژمارە مۆبایلە هیی کوردستان نییە؟ وەڵامم دایەوە: بەڵێ، گەڕاومەتەوە بۆ کوردستان. مەحوی گوتی: کەی؟ بۆچی ئێمە ئاگاداری هیچ نین. پێم گوت: ببورە دەبووایە پێشتر ئاگادارم بکردبانایەوە، بەس تۆ واز لەوە بێنە، لە ماڵی؟ گەر لە ماڵی هاوڕێیانیش بانگ بکە کارێکی زۆر گرنگم پێتانە.

پاش ئەوە بەڕێ کەوتم بەرەو ماڵی مەحوی، کاتێك گەیشتم، بینیم مەحوی وا لە بەردەرگا چاوەڕێ دەکات. کاتێك لە سەیارەکە دابەزیم، توندتوند یەکتریمان لەباوەش گرت و دواتریش ڕۆیشتینە ژوورەوە. ماوەیەك چاوەڕێمان کرد تاوەکوو دکتۆر ئارام و بەڵێن و هۆشەنگیش هاتن. پاش ئەوەی هەمووومان هاتن و بەخێرهاتنەوەی منیان کرد، بە هاوڕێکانم گوت: هاوڕێیان ئاگادارن من زۆر نییە خێزانەکەم، خوا لێی خۆش بێت، وەفاتی کردووە و خاوەنی کچێکی بچووکیشم ناوی ئەوینە. ئەگەر خۆشم نەمەوێت هاوسەرگیری بکەمەوە، ئەوا نابێت لەبەر ئەوین، ئەو ئێستا زیاتر پێویستی بە دایکە، نەك باوك. بۆیە بڕیارم دا هاوسەرگیری بکەمەوە و









کەسەکەش دیارە و هەمووتان دەیناسن، ئەویش نوری کچی حاجی کەماڵە. ئێستا داوام وایە لە ئێوە وەکوو برا گەورەیەکی من هەڵبستن و ئەمشەو لەگەڵ من بێن بچین بۆ خوازبێنی.

هاوڕێکانم، کە ناتوانم وەسفیان بکەم، هەمیشە لە کاتە قورسەکان لەتەنیشت من بوون و نەیانهێشتووە بێکەسیم پێوە دیار بێت. بۆیە گشتیان گوتیان: زۆر باشە. دکتۆر ئارام و بەڵێن و هۆشەنگ گوتیان: ئێمە دەڕۆین بۆ ماڵەوە و خۆمان ئامادە دەکەین و ژنەکانیشمان دێنین لەگەڵ خۆمان. ئەوان ڕۆیشتن، مەحوی گوتی: هەڵستە با بڕۆین بۆ بازاڕ، جلێکی نوێ بکڕین و بڕۆین بۆ لای سەرتاشخانەیەکیش قژەکانت بۆ ڕێک بخاتەوە. پاش ئەوەی ڕۆشتین بۆ بازاڕ، شتەکانمان کڕی و دواتر چووین بۆ لای سەرتاشخانەیەك و قژەکانم کورت کردەوە و بۆی داهێنام. گەڕاینەوە بۆ ماڵی مەحوی. شەو، پاش ئەوەی هەموومان لە ماڵی مەحوی کۆبووینەوە، پاشان گشتمان ڕۆیشتین بۆ ماڵی حاجی کەمال. پاش ئەوەی گەیشتینە ئەوێ، کاتێك ئەوین منی بینی، خێرا بەڕاکردن هات بۆ لای من و دواتر هاوڕێکانم یەکەبەیەکە ماچیان کرد. پاش ئەوەی دانیشتین، مەحوی ڕووی کردە حاجی کەمال و گوتی: حاجی گیان، لای بەڕێزتان شاراوە نییە کە ئەو برایەمان چەند پیاوێکی باشە و چەند جێگای ئەوەیە متمانەی پێ بکەیت و پشتی پێ ببەستی، هەر لە سۆنگەی ئەوەشەوە ئەمشەو هەڵساوین و هاتووینە خزمەتت بۆ ئەوەی داوای نوری کچت بکەین





بۆ ئەو برایەمان موحسین. حاجی کەمال وەڵامی مەحویی دایەوە و گوتی: موحسین کوڕی خۆمانە و لای خۆمان پێگەیشتووە و باشتر لە ئێوە دەیناسین و گومانمان لە پیاوەتی و دەستپاکییەکەی نییە، هاتنیشتان بۆ ئێرە و بەو شێوەیە جگە لە ڕێز و باشی نەبێت، هیچی تری تێدا نابینم، ئەگینا پێویستی بەوەش نەدەکرد هاتبان، من ماوەیەکە ڕازی بووم بەو کارە و بگرە زۆریش خۆشحاڵم. پاش ئەوەی هەموو شتێك بە خێر و خۆشی دەڕۆیشت، لە کۆتاییدا بڕیار درا تا زووتر کارەکە تەواو بکرێت باشترە، بۆیە بڕیارمان دا سبەی پاش نیوەڕۆ بێین و مامۆستایەکی ئایینی بهێنین و مارەبڕینەکە ئەنجام بدەین. پێش ئەوەی بڕۆین ویستم ئەوینیش لەگەڵ خۆم بەرمەوە بۆ ماڵی مەحوی، بەڵام دیار بوو ئەوین زۆر باش هۆگری نور بووبوو، بۆیە نور گوتی: با لێرە بمێنێت و ئەمشەو لەگەڵ خۆم بێت.

سبەی هاوڕێکانم هەموو کارەکانیان بەباشی ئەنجام دا و گشت ئامادەکارییەك تەواو بووبوو، چاوەڕێی مامۆستامان دەکرد بێت بۆ ئەوەی بڕۆین، کاتێك مامۆستا گەیشت، ڕاستەخۆ ڕۆیشتین، کاتێك گەیشتین، حاجی کەمال و خزمەکانی پێشوازییەکی گەرمیان لێ کردین. نور جلێکی کوردیی زۆر جوانی پۆشیبوو، ئەوینیشی لەتەنیشت خۆی دانیشاندبوو. پاش ئەوەی مارەبڕینەکە تەواو بوو و هەموو شتێك کۆتایی پێ هات، حاجی کەمال ڕووی کردە من و گوتی: کوڕم لەمەودوا نەك تەنها نور، بەڵکوو من و









حاجی سەبیعەش خۆمان ئەمانەتی تۆ کردووە، من ئەو هێزەی جارانم نەماوە و ناتوانم بەباشی کاروباری کۆمپانیا بەڕێوە بەرم، بۆیە کۆمپانیاکە دەدەمە دەستی ئێوە. ئێستاش مادام ئێوە بوونە حەلاڵی یەکتری، حەز ناکەم لەوە زیاتر دوور بیت لە خێزانەکەت و لە ئێستاوە دەتوانی بیبەیت بۆ ماڵی خۆتان. ئەوەش کلیلی ئەو ماڵەی کە من کردوومەتە دیاریی هاوسەرگیریی ئێوە. دوای ئەوەی سوپاسی حاجی کەمالم کرد، لەسەر هەموو شتێك پێم گوت: ئەی کاروبارە یاساییەکان. وەڵامی دامەوە: دەتوانن ڕۆژانی داهاتوو ئەوەش ئەنجام بدەن. پاش ئەوە وێنەیەکی بەکۆمەڵمان گرت، ئەوین لە ئامێزی مندا بوو لە وێنەکە، پاش ئەوەی وێنەکانمان گرت، ڕووم کردە هاوڕێکانم، زۆرم سوپاس کردن لەسەر هەموو شتێك، پاش ئەوەی هەمووان ڕۆیشتن، من و نوریش لەگەڵ ئەوین ڕۆیشتین بۆ ئەو ماڵەی کە حاجی کەمال کردبوویە دیاری بۆ ئێمە، خانووەکە زۆر دوور نەبوو لە ماڵی حاجی کەمال، پاش ئەوەی گەیشتینە ناو ماڵەکە، بینیم هەموو شتێکی تەواوە، ڕووم کردە نور و پێم گوت: خۆ ئەوە هەموو شتێکی تەواوە. نوریش گوتی: بەڵێ، پێشتر ئێرەمان بەکرێ دەدا، بەڵام باوکم لەو کاتەوەی زانیی تۆ بەنیازی بێیتەوە، هەموو شتێکی ئەو ماڵەی نوێ کردەوە.

ماڵێکی گەورە بوو، حەوزێکی مەلەکردن و باخچەیەکی بچووکیشی هەبوو. پاش ئەوەی دانیشتم، نور ڕۆیشت قاوەیەك دروست بکات، پاش ئەوە هات لەتەنیشت من دانیشت و سەری





خستە سەر شانم و گوتی: دەزانی ئازیزم، ئائومێدی تاوانە، ئەو شتەی بۆ تۆ بێت، هەرچەندە دووریش بڕوات، هەر دەبێت لە کۆتاییدا بۆ لای تۆ بگەڕێتەوە، تەنها ئارامگریی دەوێت، ڕاستە ئارامگرتن تاڵە، بەڵام بەرهەمەکەی شیرینە.

**... سوپاس بۆ خوا تەواو بوو...**





# بەهەشت بێ تۆ

ئایە دەکرێت ژنێك دڵخۆش و بەختەوەر و ئاسوودە بێت لەناو دینێك کە ئەو دینە باوەڕی بە مافەکانی ژنان و ئازادیی ژنان نییە، بەزۆر پۆشاك و حیجابی بەسەردا سەپاندوون، کردوونی بە کۆیلەی پیاو، مافی چێژبینین لە ژیان و چوونەدەرەوەی لێ ستاندوون و بەزۆر لە گۆشەیەکی ماڵەکەی زیندانیی کردوون و ناهێڵن بەدوای خەون و ئاواتەکانی خۆیاندا بڕۆن، ئایینێك ڕێگەی داوە بە پیاو بۆ ئەوەی حەزەکانی تێر بکات، لە یەك کاتدا لەگەڵ چەند ژنێك هاوسەرگیری بکات و ڕابوێرێت و چێژیان لێ ببینێت، بەڵام ژن تەنها بۆی هەیە لەگەڵ یەك پیاودا بێت، ئایینێك ڕێگری بکات لەوەی کچێك مافی ئەوەی نەبێت کوڕێکی خۆش بوێت و لەگەڵی دەر بچێت و بیناسێت و بزانێت ئەو کەسە شایانی ئەوەیە ببێتە هاوسەری، ئایینێك پێی وایە شایەتیی دوو ژن بەرامبەر بە یەك پیاوە، ئایینێك لە موڵك و سامانێك کە باوك بۆ کچ و کوڕەکانی جێی هێشتووە ستەم لە کچ بکات و بە دوو خوشك ئینجا هێندەی برایەك میرات بەرن، ئایینێك ڕێز و گەورەیی پیاوی داوە بەسەر ئافرەتدا. ئایە پێم ناڵێیت و دەتوانی پێم بڵێیت چۆن ژنێك دەتوانێت لەنێو هەموو ئەو ستەمانەی دەرحەقی دەکرێت دڵخۆش و ئاسوودە بێت؟!


**کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی**





لقی یەکەم: بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوار ڕیانی شێخ مەحمود بەرامبەر مزگەوتی محمود عەلاف

٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ — /M.Ktebxana  